# تەفسیری کوردی

## لە کەلامی خوداوەندی

مەلای گەورە

( مەلا محمدی کۆیی )

بەرگی پێنجەم

# تەفسیری کوردی

## لەکەلامی خوداوەندی

مەلای گەورە

( مەلا محمدی کۆیی )

**بەرگی پێنجەم**

**جوزئی (١٣-١٤-١٥)**

**لەسەر ئەرکی بەڕێز مام جەلال سەرۆک کۆماری عێراقی فیدراڵ لەچاپدراوە**

## سورەتی (يوسف)

### لە ئایەتی ٥٣ تا کۆتایی

﴿وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْس لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ﴾ لە امرأة العَزيز ناوەشێتەوە! خاصَّه لەگەڵ ﴿إِلاَّ مَا رَحِمَ رَبِّي إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ گێڕابووە خوا شوناسێ بەو نوعە؟! ئەمە فەرموودەی (يوسف)ە! نەك لەبەر هَضْم النَفس، بەڵکو حەق وحەقیقەتی فەرمووە، نفس دائماً سوقی انسان دەکا مەیل وحرکەی پێ دەدا، سیَّما لەو حاڵەو لەو عمرو شبابە! أمری، أنه أمری تکوینه. صاحبی تووشی سیِّئات دەکا. إلا ئەو کەسەی خوا رەحمی پێ بکا بەسەر قووەتی قَهْری اَمْری تَکوینی جَبری نَفسی خۆی غالب بکات، بە برهانێ إلاهی علمیً أقوی بە عەقڵێ متین، کونی بکات. خوای تعالی غفور ورحیمە ئاگای لە فطرەتی عبد هەیە چ قوای تێدا داناوە مقتضایان چیە، لە هەمو کەس چاکتر دەزانێ عوزری عبد، ئی ئەو لە هەمو کەس زیاتر معلومە! أحکامی بەلاف گەزاف نیە. مەگەر خانم لەو بەینە وەك (بِنْتُ السمّاکي بغدادي) لەسەر دەستی زاتێ وەك (شێخ علاء الدين) تۆبەی کردبێ، وەبووبێتە صاحبی ئەو إیمانە، وە ئاگاداری لە حاڵی نَفسي اَمارەی بالسوءْ پەیدا کَردبێ. (سیِّد رشید) بە قولی قوم أصلاً راضي نیە، تَعَجُّب لە (إبن جَرير) دەکا کە اقتصاری کردیە لەسەر قسەی جمهور، حاصڵی قووەتی دایتە مختاری خۆی ونسبەتی ترجیحی دایتە (عمادي إبنُ الکَثير). اِمام أبو العَبّاس شیخ الإسلام (اِبنُ تَيْمِيَّة) نصرەتی داوە تصنیفێکی سەربەخۆی بۆ کردیە. لام وایە أهمّی هەمو تقدیسێکی بۆێیە، تاکو مَعْناي مُختاری خۆی، لە (وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وهَمَّ بِها) لەگەڵ ئێرە بخوێنێ.

خاتوون قَصدی لادانی (یوسف)ی کردیە، (یوسف)یش کذا بالمُقابلەی کردیە، ئەگەر قولی (وما أبَرئ نَفسي) بداتە (یوسف) حتًّا لەگەلّ (هَضم النفس)یش لەگەلّ مَعنای سابقی رێك ناکەویّ! أمّا لای حقیر مختاراتی لەو مقامانەن بیّ وجهە. دوائی تەماشای تفسیری کبیرم کرد، زێدە حیرەت گرتمی، (امام فخر الدین) پاش بیانی دوو قول لە (ذلكَ لِيَعْلَمَ أنّي لَمْ أخُنهُ بِالغَيْبِ) أوّل رأي جَمهور قَوْلي ثاني کە ئەوە اِمرأةُ العَزیزە، أمّا قائلي ذکر ناکات أمّا دیارە قووتێکی پیّ دەدا. دێتە سەر تفسیری ئەم ئایەتە، ئەوەش لەسەر دوو قول تفسیر دەکا، دوایی سؤال دەکا لە ترجیحی (وَما أُبَرِّئ) قَوْلي اِمرأةُ العزیز بیّ یا قولی (یوسف)؟ لە هەردوو صورة دەلیّ مشکلە.

إشکال هەر بنا لەوەی بلیّی قَوْلي اِمرآتە، إشکالەکە بیّ مناسبەیی ئەو قسەیەیە لەگەلّ حالّی خانم. لایخفی نایێتە خیالّی قارئ خیانەتی امرأة لەگەلّ (یوسف)، یا امانەتی! مرادی مطاوعەی (یوسف) بووبیّ، بۆی (مُیَسَّر) نەبوو! لە حەپسدانیشی قصوري نەکرد. ماوەتەوە خیانەت وامانت لە بەینی (یوسف) وسیّدی، وەلەبەینی عزیز وخێزانی! ئەگەر بلێین خێزانی دەلیّ من خیانەتم نەکردیە لەگەلّ مێردی خۆم، درۆی محضە! چ قصوری نەکرد! ئەوەی ممکن بوو کردی! ئیشە معهودەکە کە نەکرا رێك نەکەوت بە إختیاری خانم نەبوو تا بلیّ (لَمْ أخُنهُ)، دەمێنێتەوە بەینی (یوسف) وعزیز. بەو ماجرایە دەرکەوت کە خیانەتی نەکردیە، نە بە حَبس نە بە مَسْ نە بە لَمْسي بُضْعي، مەیەلانی قلب خیانەت نیە، بیّ دەسەلاتیە. مَعَ هذا بە قووتي أمانەتی ونەمەکداری ئەو مەیلەشی شکاندیتەوە. سەلامی خوای لیّ بیّ بە حەق صدّیقە. من گەلیّ جار دەلێم نفسی إنسانی بە تەواوی چاك نابیّ، أمّا ئەوەی موفق بیّ دەتوانیّ کزی بکا، مقابلی عَزم و جَزم بەمەردانەیی بیّ دەسەلات بیّ.

﴿وَقَالَ المَلِكُ﴾ فەرمووی، ﴿ائتُوني بِهِ﴾ بیهێنە لای من ﴿أسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِي﴾ دەیکەمە خالص وخاصّی خۆم، لە حەپس وعبودەیت وکیدی ژنان، نجاتی بابیّ. بنا بە أمري مَلِكْ (یوسف)یان هێنا حضور. ﴿فَلَمَّا كَلَّمَهُ﴾ کە

شاه قسەی لەگەڵ کردو جوابی دایەوە، زانی زاتێکە شایانی إحترامە. ﴿قَالَ إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا﴾ لای ئێمە. ﴿مَكِينٌ﴾ پایە بڵندی. لە مقولەی مملوکان نی! ﴿أَمِينٌ﴾ معلوم چ أمانەتێکت لە چ وەقتیٚ حفظ کرد. ﴿قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الأَرْضِ﴾ بمکە وەزیری مالیّە! وەزارەتی إدارەی أموالی دەوڵەتم بدە دەست. یعنی خزینەی دەوڵەت نەك خزینەی شاهی، ﴿إِنِّي حَفِيظٌ﴾ ئاگادارم، حفظي أموالي دەوڵەت بە تەواوی دەکەم ﴿عَلِيمٌ﴾ بە جمع وجبایەت وصرفی بە قاعدەی إقتصاد، چاکی لیٚ دەزانم. دیسان لێرە خَدْشە پەیدا دەکەن گۆییا طلبی وَظیفەی کرد سالیٚ تأخیر بوو، ئەگەر خۆی نەیخواستبا، حالاً دەبوو. أمّا لە قرآن أدنی إشعاری پیٚ نیە! وکذا گەلیٚ نوعە قسەیان کردییە دائر بە مجاملەو إکرام وإعتمادي مَلك لەسەر (یوسف)، لە قرآندا بیٚ أثرن. ﴿وَكَذَلِكَ﴾ بەو نوعە ﴿مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الأَرْضِ﴾ جێمان دایێ لە أرضی مصر. ﴿يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ﴾ ماڵ و حاڵی خۆی لەهەر کوێێ ئارەزوو بکا منزلی لیٚ دەگریٚ وەك بەهەشت. ﴿نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا مَنْ نَشَاءُ﴾ دەگەێنین بە نعمەت وعطیەی خۆمان بەوەی ئارەزووی بکەین.

تفسیری (رَحْمة) بە نبوّەت لێرە خۆی نیە، (سیّدی آلوسی)ش پێی راضی نیە! نازانم ئەوانە چ رەحمەتیان پیٚ دەگات لە نبوّەت ورسالەتی حضرەتی (یوسف) والێی بە تالووکەن؟! ﴿وَلاَ نُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ وایە. أمّا دەبیٚ بزانن هەر نوعە إحسانیٚ، نوعە اجرێکی مناسب خۆی هەیە. وامەزانن بە نوێژو تهلیلە وختمە، خوا دەمانکاتە وارثي أرض ومجالسی هاو رەنگی واستقلالی وحُکمداری! ﴿وَلأَجْرُ الآخِرَةِ خَيْرٌ﴾ چاکترە لە أجری دونیا، أجري دونیا زەرەرو نقص بە پاداشی آخرەت ناگەێنیٚ. ﴿لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ إیمانیٚ تەواو کامل وبیٚ غلّ وغشْ. ﴿وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ أنە وظیفەیان پەرهێزگاری بووبیٚ. طبعاً ئەو مؤمنە کە نائلی أجری دونیا بوو، لە إحسان زیاد دەکا، زۆر تر طلبی جزای خێریەی آخرەت دەکا.

دیسان دەبێ بزانین تقوا چیە؟ وەچۆن دەبێ؟ چونکی موسوڵمانان تقوا وعملی صالح وإحسان وتوکلیان لێ مشوەش کراوە. حضرەتی (یوسف) بەو حاڵە لەو أرضی مصر قەرارگیر بوو، دەستی کرد بە اجرا آت قووەتی بۆ زەراعەت وفلاحەت، بەو نوعە کە لە تعبیری خەونەکەی فەرموو بووی. ذخائر إدخار کرا ئەوەی إستهلاك دەکرا، لە دائرەی إقتصاد دەرنەدەچوو، بەقەدەر دفعی حاجەت بەڵکو ضَرورَت صَرف دەکرا، تاکو کەوتنە زەمانی گرانی وقحط وغلاء. باران لە أطرافي (سودان) یعنی منبعي (نیل) نەدەباری، نیل بێ هێز بوو تاقتی گەڕانەوەی نەما، أراضی ارواء نەدەکرد، زراعەت نەدەهات. گرانی نە تەنها لە وولاتی مصر بوو، بۆ أطرافیشي سرایەتی کرد، تا (سوریە)، چووە (کنعان)یش، دووچاری قحط بوون. خَبَري مصر لە جهەتی حُسْني تَدبیرو ادّخاري أرزاق وبەقەدەر حاڵ فرۆشتنی بۆ پێویستیان، بڵاو بوو بۆوە! حضرەتی (یعقوب) أمری کردە اولادانی، یاخود خۆیان لازمیان زانی بچنە مصر، علاجی قووەتێ بکەن بۆ خۆ وو عائلەیان، روویان کردە مصر، وادای بە وادی تا داخلی شار بوون، لە وەقتێ مناسبی زەمین وزەمان چوون بۆ خزمەت عزیزی نوێ. ﴿وَجَاءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ﴾ برایانی (بَعْدَ الإستئذان والرُخصة). ﴿فَدَخَلُوا عَلَيْهِ﴾ لە نادی عام، ﴿فَعَرَفَهُمْ﴾ ئەوانی ناسی. ﴿وَهُمْ لَهُ مُنكِرُونَ﴾ خیاڵی مانی (یوسف)یان نەدەکرد فضل لەمە بە دڵیان دابێ وهم ببەن (یوسف) بوویتە عزیزی مصر وەزیری مَلِك. لام وایە (حَسَنْ) بە دووری زانیوە کە (یوسف) لە خۆڕا بیاناسێتەوە، بۆیە دەڵێ: خۆیان تعریف کرد ئەوجا ناسینی. فەقێیێ (مەلا عبد الله) ناو (هەولێری) لە کۆیە دەیخوێند لە تأریخی (١٣٠٩) هجری من منداڵ بووم، مەلا بزر بوو، نەمدیتەوە، تاکو (١٣٥٣) هجری کەوتبووە (ئەستەمبووڵ) لەو تأریخە هاتەوە (کۆیە) هاتە مدرەسەی من، بە أوّل نَظَر ناسیمەوە، ئەو تَعَجُّبی لە گۆڕانی من کرد، ئەو وەقتە چۆن بووی؟! ئێستا چۆنی؟! ئەگەر بە خصوصی بۆ زیارەتم نەهاتبایە مدرەسەی من لە مقامی خۆم نەمدیبا نەمدەناسیەوە. دیارە فەرقی هەیە ناسینەوەی منداڵ ئی

گەورە، لەگەڵ ناسینەوەی گەورە بۆ منداڵ کە گەورە بووبێ خصوصی تَبَدّلاتي (یوسف)ی قیاس لە ئیتر ناکرێ وکذا قووەی خیاڵی.

پاش مجامله ومعاملەو حاڵی خۆیان حضرەتی (یوسف) بەرێی کردن. ﴿وَلَمَّا جَهَّزَهُمْ بِجَهَازِهِمْ﴾ کَأَنَّهُ مسافری خۆشەویست بەڕێ دەکا، ئەوی لازم بێ لە زاد و متاع بەگەڵیان دەخا. وادەردەکەوێ لە ذوق وسَوْقي عبارەتی قرآن، فروشتنی زەخیرە بە گوێرەی نفوسی کڕیاری حاضر بووبێ، لەبەر ئەوە برایانی (یوسف) گوتویانە برایەکی تریشمان هەیە نەهاتووە، چونکە ئەو برایەمان برایەکی هەبوو لە دایکی خۆی لە چۆڵ وصحرا فەوتا باوکمان رەحمی ئەویشی هاویشتیتە سەر ئەم برایەمان اذني نادا بۆ سفر، دەنا ئەویش حاضر دەبوو بۆ کڕین، لە جەوابیان ﴿قَالَ﴾ (یوسف) دەفەرموێ ﴿ائْتُونِي بِأَخٍ لَكُمْ مِنْ أَبِيكُمْ﴾ براي بابیتان وەرنەوە ئەویش لەگەڵ خۆتان بێننە لای من، بزانن مقصدم چاکەیە بۆ ئێوە! ﴿أَلاَ تَرَوْنَ أَنِّي أُوفِي الْكَيْلَ﴾ بۆ کڕیاران ئێوەو غیری ئێوە. بەلای کڕیاران دا دەدەم قازانجی بارێ دەبێ بەچی طمّاعی بۆ بکەم؟! غَرَض زێدەیە بۆ ئێوە. ﴿وَأَنَا خَيْرُ الْمُنزِلِينَ﴾ بۆ میوان. چاکیان بەخێر دێنم. (شێخ معروفی هەڵەجە) (هەزار رەحمەتی لێ بێ)، ساڵی گرانی باراش هێر دەچوونە ئاشی وی لە (هەڵەجە) ئاوی ئاشەکەی کەم بوو، باراش درەنگ خلاص دەبوو، صاحب باراشەکانی بە نان وشیو بەخێو دەکرد تا دەڕۆیشتن، گەلێ لەمزەکەی زیاتر لێ صرف دەکردن، ﴿فَإِنْ لَمْ تَأْتُونِي بِهِ﴾ ئەگەر نەیهێنن، خۆتان ماندی مەکەن! ﴿فَلاَ كَيْلَ لَكُمْ عِندِي﴾ پێوانەتان لای من نیە! هیچتان پێ نافرۆشم! ﴿وَلاَ تَقْرَبُونِ﴾ چونکە مادام وابێ، بەڕاستگۆ دەرناچن! نێزیکم مەکەون نابێ بێنە ووڵات، فَضل لە حضور مَنْزِل ومیوانداری. ﴿قَالُوا﴾ اخوة. ﴿سَنُرَاوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ﴾ بە لَطایفُ الحِیَلْ دەیخەڵەتێنین ﴿وَإِنَّا لَفَاعِلُونَ﴾ فێڵی لێ دەکەین کوڕەکەی لەبەر دەست دێنینەدەر، دەیهێنین! حیلەی وان (یوسف)ی لێ وەرگرت، (بنیامێن) وەرناگرێ؟! ﴿وَقَالَ﴾ (یوسف) ﴿لِفِتْيَانِهِ﴾ غلامانی خۆی، خزمەتکاری!

﴿اجْعَلُوا بِضَاعَتَهُمْ﴾ كوتاڵیان، یعنی ئەوەی هێناویانە بۆ دغڵ كڕین ﴿فِي رِحَالِهِمْ﴾ لەناو باریان. بیهاوێنە ناو باریان هەركەسە ای باری خۆی. یاخود (تَوزیعُ الجَمعِ بالجَمْعه) وەإستیعابی هەمو بارەكان لازم نیە، هەندێ رحل كافیە. ﴿لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَا﴾ دێتە بەر چاویان إعتراف بە چاكەی ئێمە دەكەن. ﴿إِذَا انقَلَبُوا إِلَى أَهْلِهِمْ﴾ دیارە لەناو باریان نایە بە نوعێ كە نەیانزانیە تا گەڕاینەوەو گەیشتینە ماڵی خۆیان وەباریان هەڵپچڕیەوە ئەوجا دیتویانە ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ مقابلی ئەو چاكە ئومێد وایە بگەڕێنەوە برایەكەی بابییان لەگەڵ خۆیان بێنن. ﴿فَلَمَّا رَجَعُوا﴾ گەڕانەوە ﴿إِلَى أَبِيهِمْ﴾ بە خزمەتی مُشرَّف بوون ﴿قَالُوا يَاأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا الْكَيْلُ﴾ مِنْ بَعد، ئەگەر برامان لەگەڵ خۆمان نەبەین! ﴿فَأَرْسِلْ مَعَنَا أَخَانَا﴾ برای خۆمان، گیان وقووەتی خۆمان ﴿نَكْتَلْ﴾ ئەوی پێمان بوێ دەیپێوین ﴿وَإِنَّا لَهُ﴾ برای خۆمان ﴿لَحَافِظُونَ﴾ دڵت پێوە نەبێ ئاگاداری دەكەین، لێمان امین بە خیانەت ناكەین! ﴿قَالَ هَلْ آمَنُكُمْ عَلَيْهِ﴾ لەسەر ئەو برایەتان؟ بڕوایتان پێ بكەم كە ئاگاداری دەكەن؟ بە أمینتان بزانم؟! ﴿إِلاَّ كَمَا أَمِنتُكُمْ عَلَى أَخِيهِ﴾ برای شقیقی ﴿مِنْ قَبْلُ﴾ هەر ئەو زوات نین بڕوام پێ كردن لەسەر (یوسف)؟! بە أمیندارم حساب كردن؟! چتان لە (یوسف) كرد؟ چۆنتان (حفظ) كرد؟! ﴿فَاللّهُ خَيْرٌ حَافِظًا﴾ ئەگەر لەگەڵتان بنێرم، ئومێدم بە حفظی بارییە! لەهەمو كەس لە جیهەت ئاگاداری چاكترە. تَوَهُّمي غفلەت لەوی ناكرێ. ﴿وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ لەگەڵ عبدی خۆی لەوەی بە رەحم ترە بە مصیبەتی علی المصیبه گرفتارم بكا! ئەو كوڕەم ناچێ محفوظ دەبێ بە عنایەتی أرحَمُ الراحِمین. (أعْمَش)، (خَيْرٌ حافظٌ). (أبو هُرَيْرَة) (خَيْرُ الحافِظِينَ). (أبن مَسْعود)، (خَيْرٌ حافظاً) وَهوَ خَيْرُ الحافظین)، دیارە (أرْحَمُ الراحمین) لە قرائەتی وی دانیە! پەككو! ئەوانە أُمَنان لەسەر قرآن، حُفّاظن، (فَاللهُ خَيْرٌ حافظاً وهوَ أرحَمُ الراحمین) یارەبّي الحمد لله كە قرآنت حفظ كرد.

لە پاش بارخستن، وە پێش هەربچڕینی ئەوەیان عرضی بابیان کرد بە تەوای و پێیان إقناع نەکرا کە وعد بدا. ﴿وَلَمَّا فَتَحُوا مَتَاعَهُمْ﴾ باریان کردەوە. دیارە زەخیرە بووە. ﴿وَجَدُوا بِضَاعَتَهُمْ﴾ قیمەتی ئەوی کڕیبوویان. ﴿رُدَّتْ إِلَيْهِمْ﴾ وادەر دەکەوێ شتێ وردە لەوردەلە بووە کە بخرێتە ناو بارو نەزاندرێ. نازانم چەرم چۆن دەشاردرێتەوە؟! نعل قەیدی نیە. ظاهراً پارە نەبووە. ئەڵبەتە متاعێ وابووە کە لە مصر لەو نوعە ساڵە مقابلی زخیرە کە قوامی حیاتە، وەرگیرێ! وەرَدّي بۆ صاحبی موجبی مەمنونی بێ. ﴿قَالُوا يَاأَبَانَا مَا نَبْغِي﴾ ئیتر چمان دەوێ؟ چ ماوە ئەو زاتە لە کرم کاری لە حەقی ئێمەی نەکردبێ؟ أیفاي كَيْل ومیوانداری، پاشدان رَدّی مَتاع! دیارە ئەو زاتە لە حەقی ئێمە بە غایەتی لطفە، فکری بەدی دەریارەی ئێمەو برای ئێمە نیە. ﴿هَٰذِهِ بِضَاعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا﴾ ئەو هەموو زەخیرەی بە خۆڕایی داینێ بناءاً عَلَيهِ تَرَدُّد مەکە روخصەتی برامان بدە بۆ خزمەت عزیز بچین، لەوبەینە خۆمان لە ضیافەتی دادەبین ﴿وَنَمِيرُ أَهْلَنَا﴾ تێریان دەکەین، طعامێ زۆریان بۆ دێنینەوە. ﴿وَنَحْفَظُ أَخَانَا﴾ أمین بە خیانەتی لە حەق ناکەین! لە ئاگاداری بێ قصور دەبین. ﴿وَنَزْدَادُ﴾ علاوەی باری خۆمان ﴿كَيْلَ بَعِيرٍ﴾ باری حوشترێ زیاد دەکەین، بارێ بۆ برامان دادەگرین. ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوەندە زەخیرەی هێناومانە ﴿كَيْلٌ يَسِيرٌ﴾ کەمە، بەشمان ناکا، نوێیان مایتی! برامان لەگەڵ نەنێرین ناچینەوە مصر. ئەگەر نەچینەوە، پەرێشان دەبین، لەبەرێ زەخیرەیی (العیاذ بالله) لەبرسان هیلاك دەبین. زەمانی حیلە نیەن ئەمڕۆ ڕۆژێکە ئەوی ڕۆژێ (یوسف)مان لێ ستاندی ڕۆژێ تر بوو، قیاسیان لێك ناکرێ. باوجودی قسەکانیان معقوڵ ومقبول بوو، أمّا وەکی کوردی دەڵێ: (مارگەزیدە لە خشەی مارمیلۆکیش دەترسێ)، دڵی بڕوایی نەدەدا برایەکەیان .لەگەڵ بنێرێ، وەدەشی زانی لازمە چوونی. ﴿قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُ مَعَكُمْ﴾ بێ قەیدو شرط، لەگەڵ ئێوەی نانێرم. ﴿حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِنَ اللَّهِ﴾ بە إیمان وعهدێ غلیظ، کە أدنا مؤمن نەتوانێ بیشکێنێ. سوێند بۆ خوا شوناسان وثیقەیە، وثیقەێ زۆر بە

قووەتە، ئەگەر وثیقەم دەنێ بە وثیقەێ إلاهی ﴿لَتَأْتُونَنِي بِهِ﴾ بۆمی دەهێننەوە. ﴿إِلاَّ أَنْ يُحَاطَ بِكُمْ﴾ بە ئافەتێ غیبیّە گرفتار بن، چ دەسەلاّت وحیلەی ئێوەی تێدا نەبێ، مغلوب ببن بە هیلاك بچن، دەورەتان بگیرێ، چارەسەرتان پێ نەکرێ ئەو وەقتە دەبێ بە ضرورەت، ضرورەت تکلیف نائێلێ، مقابلەی ممتنعە، هیچ ناکرێ. تەماشای خلاف مُعْربان لە إسْتْثنای مُفَرَّغ! زەحمەتە إحاطەی پێ بدەی. ﴿فَلَمَّا آتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ﴾ وەوثوقی پێ کردن کە خیانەت ناکەن. ﴿قَالَ﴾ باوکیان، ﴿اللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ﴾ لەسەر ئەوەی گوتمان ﴿وَكِيلٌ﴾ مُطّلِعە، رەقیبە، ئاگادارە. لەگەڵی ناردن و﴿وَقَالَ﴾ باوکیان، لەو وەقتی توجّە بۆلای مصر دەکەن لە شَفَقَەتی آبَوی بە نصیحەت ﴿يَابَنِيَّ لاَ تَدْخُلُوا﴾ مِصر، وەك دەفەرموێ ﴿مِنْ بَابٍ وَاحِدٍ﴾ بەدەرکەیەکی بچوونە ناو شار. بۆچی وای فەرموو؟ مُفسّران خلافیان هەیە أمّا ناقلەکان هەمویان أتفاقیان هەیە بۆ حفظ لە چاوپیسی بووە. دەڵێن کۆمەڵێ وا جوان و بە شەوکەت وێکڕا بچنە ناو شار، دوور نیە چاوپیسی ونفسیان لێدا، تووشی دەردو بەلاّو هیلاکەت بن.

بەڵێ من مُعْتَرِفم بە (العَيْنُ حَقٌّ) وەکی (أبو عَلي جبّائي) إنکاری ناکەم، بەلاّم لام وایە ئەو توجیهە دوورە! ئەو برایانە ئەگەر وەك شۆڕە سواری (هەمەوەند) بەچەفیەو عەگالی سورمەدار، سەرداری شاڵی سورمە، چەکمەی حەموودی، رمی نصیری، مایني مُعَنَّك، بەکۆمەڵە چووبانە ناو شار، وە أهلی شاریش لە سرور وحبور وکەیف سەیرەوە، تەماشایان بکردبان، (ئێ وەالله)، دەم ووت بەڵێ بۆ حفظ لە چاوەزار فەرموویەتی: لە دەرگەیەك مەچوونە ژوور.

﴿وَادْخُلُوا مِنْ أَبْوَابٍ مُتَفَرِّقَةٍ﴾ یەك ودوو بە دەرکەیەکدا هەڕوونە ژوور. أمّا جَمعاتي کاروانی بارەبەر (حمیر) وەك لە (تورات)دا دەیڵێ، یا حوشتر وەك لە قرآن اشارە دەکات، گرژو چڵکن وتۆزاوین لە شارێ کزو ماتەم وغەمگین، زەمانی قَحط وغەلاو برسیایەتی ئاگای لە خۆیە؟ کێ چاو لەوانە دەدا؟ بەڵکو کێ چاو لەوانە دەکات؟ تاکو خوانەکەرانێ تووشی چاوەزار بێن! دائم لە

خیاڵی قووتن. بەهاری ساڵی گرانی هەزارو سێصەدو سیوشەش (١٣٣٦هـ) بەهارێ بوو خوڕەم ودڵگوشاد، بەهارێ وا کە لە (کۆیە) مشهورە، بەهاری واخۆش کەم بووە! کەس تەماشای باغ وداغ وکێو کەژ وسەرو سەمەن ویاسەمەن وعەرعەرو شمشاد وگوڵ ورەیحان بنەفشەو لال وعەباس وسونبل ونێرگز وخاوو گیا بەندی نەدەکرد!! وەك شانە مێروو بە ڕێی (هەیبە سوڵتان) و (چنارۆك) و (میرسەید)دا دەچوونە ئەو دیو بۆ کەنگر، گوڵە کەنگرێ لە نَظَری پاك و پیس هەزار دەستەگوڵی دەهێنا! چاوەزاری چی برای بابم؟! گەڵێ جار ئەمووت لەمەولا لە باتی وردە پەرچەم وزولفی بەلوول کوڵمەی ئاڵ وگەردەنی زەردی بەوردە خاڵ، حەیرانان بەکەنگری هەڵبڵێن، چاکە! لەوەقتی گرانی کێ بەکێ هەڵئەکاڵێ؟! وابزانم مقصدی عالی ئەمە بووە تووشی شەڕ نەبن! مصری بێ صحەت وبەرچاو تەنگ بەرزق چوونەدەر، طبیعی دڵ تەنگ دەبوون، خصوص کاروانێك لەسەر یەك دووجار بێ وبچێ لایان زێدە گران بوو! وە بیاندیبان قسەی درشتیان دەکرد، ئەوانیش قبوڵیان نەدەکرد! ئیش تێك دەچوو! اولادی (یعقوب) نەوەی (إسحاق) و (إبراهیم)ی قسەی درشت وسوك قبوڵ ناکەن! دەفەرموێ بەوە هەڵمەخەڵەتێن: ﴿وَمَا أُغْنِي عَنكُمْ مِنْ اللَّهِ﴾ نە لە حَضَرْ، نە لە سەفەر، نە لە دونیا، نە لە عُقبا. ﴿مِنْ شَيْءٍ﴾ قَضاو قَدَرِي الاهی، سیّانە، لەسەر هەمو کەس جاریە، حوادثاتی زەمانە بەسەر شاه وگەدادا وەك یەك دێ. کەس مغنی نیە لە خوا بە هیچ وەجهێ، أدنا استِغْنایێ، زاتاً ئەوەی تدبیر دەکا، معارضەی خواو قَضاو قَدَری ناکا. سیّدي سەروەر بە امری خوای مشاوەرەی دەکرد لەگەڵ اصحابی، جەنابی حەق خۆی دەفەرموێ: (خُذوا حِذركُم)، مامۆستا دەڵێ: (لا يُغْني الحَذَرُ مِنَ القَدَر) هەرچی هەیە بە قضاو قدرە علاج ناکرێ! بەڵێ وایە، بەڵام تەماشای أحواڵی عالەم بکە! انگلیز هاتە وولات، تا حکّامی انگلیزی لە وولات بوون، کەس کەسی نە دەکوشت، رێگری ودزی وسووتان وژن هەڵگرتن نەما! کە ئەوان رۆیشتن دەرکەی سیّئات کراوە، پف لە شمع، بووە شەوە رەشکە! وای لێ هات برا

برای خۆی کوشت لەسەر کۆتکە جۆیێ! بۆیە ئەگەر حکومەت بە شدّەت بوو لەسەر اشقیا، شەقاوەت نامێنێ! خواش ارادەی سیّئات ناکا. لەو چەندانە أطرافي مملەکەت وای لێ ھات کەس لە خۆی امین نەبوو تاکو زاتێ والای خانەدانی عالی نژاد (یَحْیی بەگ) نجلی (عبد الله بەگ) لە سلالەی (رسول پاشا)ی مامی (محمد پاشای رەزاندزی) مَشھوری آفاق بە عَدْل وداد وحُبّي عِلم وتَرویجي عُلَماء، بە قائمقامی ھاتە (کۆیە) چەند کەسێکی بە ناوی حسنی سلوك حەپس کردو رەوانەی لوای کردن، دونیا راحەت بوو، دزی نەما، رێگری فەوتا. انشاء الله بەدەوامی حُسني اِداري، خەرمان وخانوو پاوان وغابات سوتانیش ئەو ساڵ نابێ! دەڵێن چی؟ تەماشای سیری عالەم بکەن؟ بەڵێ مەلا دەڵێ: ھەرچی خوا نەیکا نابێ! امّا کە دانەیێ طوپی (رووس) لە جبالی (رەواندر) ھات و لە شاخی داوو تەقیەوە چەند أشخاصی بەگوللەو ساچمە کەرت وپەرت کرد، مەلا ھەڵدێ بۆ قوژبنێکی قووڵ! خوای چی وقضاو قَدَري چی؟!

بەڵێ مسلمە ﴿إِنْ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ﴾ حکمێ دائر بە إدارەی شؤوني أنام، بەس بۆ خودایە. نە جِنْ، نە مَلَك، نە رَسول، نە کَواکِبْ سیّارە وثوابتْ، مداخلەیان نیە. ﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ﴾ لە ھەموو شت خاصّە لە حِفظتان. ﴿وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلْ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾ ھەر لەسەر ئەو إعتماد بدەن. لاشك علمی إنسان قاصرە، شتێکی دەزانی ھەزار شتی لا مجھولە, أَسْباب (لا تُعَد ولا تُحصی)یە، (ومَنْ لَمْ يَمُتْ بالسَّيْف ماتَ بِغَيرِه)، (تَعَدَدَت الأسبابُ والمَوْت واحدٌ). (شیَخ أبو علي) بۆ توجیھی (كَذَبَ المنَجمون) دەڵێ: علم بە إنحصاری اسباب وحصولی علّەی تامّە قبل وقوع الشيء بۆ منجم نیە! ئەوی دەیڵێ، لە گومانە، جزمەکەی درۆیە خۆی نیە.

برادەران تەماشا کەن دوای زەمانی (شێخ) چەند کَواکبي سیّارە لە منظمەی (شَمس) کَشف کرا، ئەڵبەتە ئەوانەش موداخەلەیەکیان بوە وەك (سیّاراتی) دی لە شئونی بَشَری، وەمنجمەکان نەیانزانیون! مؤمن ئەوەی

بزانیٚ لە أسباب تَشَبُثي پیٚ دەکات، على تقديري حصولى جميعى ما عَلِمَه، تَوَكل دەکاتە سەر مەرحەمەت و لطف وحفظی خواوە دەڵیٚ: (اللّهمَّ إني أعوذُ بِكَ مِنْ شَرِ ما أعلَم وَمالا أعلَم). لە كُتُبی شَرعی سُؤالى إمامی عُمَر نَقل دەکا متوکل کێن؟ ئاخری خۆی جوابدەداتەوە ئەوانەی تۆ دەهاوێنە ناو أرضی دێمی ئەوەی لازمی خۆیەتی ایفای دەکا، بۆ ئەوەی کە عائدی خوایە لە شین بوون وپێگەیشتن وحفظ ولیٚ خواردنی، ئومێدی بە عنایەتی بارییە پەنای بە رەحمەتی وییە.

حقیقە گەلیٚ صوفیە لە وادی توکل گومڕاه بووین، (شُكر لله أُمّة) بە جوازاتی أشاعرە هەڵناخەڵەتان، حوائج وضرورەت صرف کردن بۆ ئیش وکار والاّ أمّە ئیشی گەلیٚ شلوقتر دەبوو، لە ئێستا بەڵکو بالمرە دەفەوتا. ﴿وَلَمَّا دَخَلُوا مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُمْ﴾ یعني لە أبوابی متفرقة داخلی شار بوون حَسَبْ الأمر والإمتثال ﴿مَا كَانَ﴾ دخولەکە ﴿يُغْنِي عَنْهُمْ مِنَ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ﴾ وایە، بیٚ شبهەیە ! وەکی شاعر دەڵیٚ:

(وَلَو كانَ سَهماً واحِداً لأتقيتُهُ ولكنهُ سَهْمٌ وثانٍ وثالثٌ)

حاجی قادری کۆیی دەفەرمویٚ:

(امین مەبە لەسبەینیٚ ئەوەت بەسەر دێنیٚ حَوادثاتی زەمانە کەنایەتە تخمین)

تا لەو اواخرە کشف کرا کیٚ دەیزانی ئەو هەمو نوعە (میکرۆب)ە فتّاکە دوشمنی حیاتی بشر لە چی پەیدا دەبن؟ بەچی دەژێن؟ بەچی دەمرن؟ بەچی خۆیان لیٚ دەپاراستریٚ؟ هەموی مجهول بوو! ﴿إِلَّا حَاجَةً فِي نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَاهَا﴾ لكنْ حُنوو شَفَقَتي أبَوي لە حەق أولادی گەرچی جگەریشیان داغ کردبوو، بە فراقی (یوسف)، بەو نصحە ئەو حاجەتەی هینا جیٚ، خۆشی دەفەرمویٚ: مغنی نیم بۆ ئێوە لە خوا، وەهەر کەسیٚ إیمانی بە خوا هەبیٚ معارضەی خوا ناکا !

خوا خۆی امر دەکا (وَأعِدّوا لَهُمْ ما استَطَعْتم مِنْ قُوة) قرآن (في الحقيقة) مُرشِدە ﴿وَإِنَّهُ﴾ یعقوب، ﴿لَذُو عِلْمٍ﴾ علمیٚ تەواو. ﴿لِمَا عَلَّمْنَاهُ﴾ بەو وەحی بە

نَظَرو تَجرُبه، زانیبوی، (مُتَشَبِّث بالأسباب ومُتَوَكِّل على الله) له بینی إفراط وتفریط. ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ نازانن توفیقیان له بینی (تَوَكّل) و(تَشَبُّث) پێ ناکرێ. بەلایەکدا لادەدەن، یا بالکلیه پاڵ دەدەنه أسباب وعِلَلِي قریبەی ظاهره، ئاگایان له خوا نیه! یانَظَر ناکەنه أسباب إعتماد وتوکلیان بەس لەسەر خوایه.

هەر دووك له جهله! مؤمنی راستی ئەوەته مُتَوَسّل ومُتَوَكِّل بێ! بنۆڕیته قواعدی مقربەی فاطِر، به شذوذ نەخەڵەتێ. مادّیات ومعنویات بۆ میللەت به منزلەی جسد و روح وایه! هەرچەند قووت وئالات و ئەدەواتی جبریەت هەبێ، که رابطەی روحیه قووەتی معنویّه نەبوو، ئالات چ دەکا؟ بەڵکو دەبێ به قضاو بەلاّ. یا با قووەتی إیمان وقومی هەبێ، بێ ئالات وئەدەواتی موافقی وەقت چیت له دەست دێت؟ بەلاّم له ئێمەیان گۆڕی محروم بوین له قوای مادّی، معَ الأسَف معنوّیاتیشمان چوو! (سُبحان الله) چمان لێ قەوما؟! چ قەومێ وای لێ نەقەوما! مغروری طبیعت بووین، کردینیانه غلبەی صلیبی، رأيِ العَيْن غلَطمان دەردەکەوێ دەست له غلط هەڵناگرین.

ئەوەی دەزانێ به سفاهەت مشغوڵه، ئەوی تر لەسەر حماقەت مایتەوە. ئەوجا بابێینه سەر باسی چاو پیسی. (إصابەتی بالعین)، إنکاری غیرە قابله! بوویته مشهورات. چاوپیسی وا هەیه وەك (سَمُّ السّاعة) بەڵکو (سَمّ الآنية) دەیئەنگوێ! إنسانی محبوب یاوولاّغی چاك بەیەك نَظَر بەیەك حرکه سەرئەنگرێی دەکا، ئەگەر نەیکوژێ، له مردیانی ڕاست دەکاتەوە. شخصێك هەبوو خوا عافوی کا، نەماوە گەلێ کەسی داغ کرد. تعریفی شتێکی ببیستبا دوای دەکەوت،تا دەیدیت، بەتیرێ دەیئەنگاوت، ولاّغی چاکی زۆر کوشت، به عەلەنی پێیان دەگوت، عاری نەدێنا، حتّا بەبێ عاری خۆی کردە (سیّد)!. سرّی سببی ئەو تأثیره چیه؟ حُکَماو مُتَكَلّمین قسەیان لێ کردیه، أمّا توجیهەکانیان دلگیرنین نَظَریان تیا هەیه. (أشاعره) که إنکاری تأثیرو عِلَل وأسبابی حَقیقی دەکەن دەڵێن: (ئەوە مَحضاً به خَلْقي خوایه، چاو تأثیری

نیە، بەس دەر عقبی چاو خوا ئەو عللەتە لە مصابدا خلق دەکات)، طبعاً ئەوانە قسەیان لەگەڵدا ناکرێ.

حُكَماي الاهيّون دەفەرمون: (نَفسي ناطقەی مجردی إنسان بێ نسبەت ووَضعُ وأتصال، وا دەبێ تأثیر لە غەیری بدنی خۆی دەکات). ئەگەر إعتبار بە لاف وگەزافی مُتصوفەکان بکەین، رووحی حضرەتی (شێخ) چەند مُدّە إدارەی بدنی مریدکی مردووی خۆی کردیە، تا إنکارێکی لێ پەیدا بووە، (شێخ) رابطەی نفسی لێ قَطع کردیە، لاشەی مرید فجأة بەربووتەوە. ئایا بۆچی تأثیر لە بعضە نَفسان دا هەیە، لە بعضەکی نیە؟ ئەوەش إحتیاجی بە توجیە هەیە. مع أنە تأثیر بێ ئالەت ورابطەی إتّصال، حەقی خاصّی حضرەتی کبریائیە! نَفسي مُجَرَّد وعُقولي مُجَرَّدة، بەو تەرزە کە حکماء دەیلێن، لای حقیر بە بورهان تَحَقّقی کردیە، مُمتَنع الوجودن.

(جاحِظ) دەڵێ: (لە چاوی بەد أجزاءْ امتداد دەکا، إتّصال دەکا بە شخصی مُستَحْسَن لای چاوپیس، تأثیری تێ دەکا، تیا ساری دەبێ، وەکی زەهری مار بۆ مارگەزیدە)، (قاضي عبد الجبّار) اعتراضي لێ گرتیە، (إمام فخر الدین) جوابی دایتەوە. خلاصە کەس بە حقیقەتی نەکەوتوە!

(أبو هاشم) و (أبو القاسم البلخی) بنا لە نقلی إمام دەڵێن: (خروجی شتێ لە چاوی (عاینْ) بۆ شخصێ (لدی المشاهدة والإعجاب والإستحسان)، بۆوی وا مصلّحەتە کە خوا تعالی ئەو شخصە تغیر بدا. بەڵێ ئەوجا نۆرەی مصلّحەت و مَفسَدەیە! ئەو قورِ بەسەرە ماڵی کۆر ببێتەوە بۆ مصلّحەتی چاوپیس؟! مصلّحەت وایە خوا کۆری بکات لە کۆڵ عبادی خوا ببێتەوە. ئایا عین هەر بۆ صاحبی نَفسی خَبیث دەبێ؟ یا وادەبێ صاحِبی نَفسی پاکیش چاوی کاری دەکا؟ حتّا دەڵێن پێغەمبەری قەومێ، خۆی دەڵێ: زۆر بووە چاوی حرکەتی لێ کردینە بە شەوێ صەد هەزار کەسیان لێ مردینە. إحتمالی هەیە ئەو رسولە حضرەتی (داود) بووبێ، لە (توراة) دەڵێ: "«داود» امری دایە بە تحریر نفوس، پاش نۆمانگ وبیست رۆژ دەفتەریان تقدیم کردیە، لە بنی إسرائیل

هەشت صەد هەزار مەردی جەنگی شمشێر زەن لە (یهوذا) پێنج صەد هەزار پیاو هاتنە دەفتر، وە لە پاش ژمارە دەڵێ کرمی لێدایە –ئەڵبەتە بەزۆری زانیە، یااصلی تحریری بە گوناە عَدْ کردیە– دەپارێتەوە ربِّی گوناهم عفو بکە، خوا وحی بۆ (داود نبی) ناردیە، لە سێ شت یەکێ إختیار بکا، یا حەوت ساڵ گرانی، یاسێ مانگ لەبەر دوشمن هەلاتن وشکان، یا سێ رۆژ وبا! حضرەتی (داود) سێیەمینی إختیار کردیە. ئەوجا حەفتا هەزار کەس لەو مدّەتە مردییە)".

ئارەزوو دەکەی اخر بابی (سموئیلی ثاني) چ لە ترجمەی عَرَبي چ فارسی تەماشاکە. لەو بەینە توراتیان بە کوردیش ترجمە کردیە أما من نەمدیوە. (حَقیقَةً) بَشَر عَجایبە! ئەمڕۆ بە عنوانی کتابی مُقَدَّس ئەو نوعە کتێبە مزخرف وخرافیە چۆن نشر دەکەن؟! حاصڵی چاوەزار بۆی هەیە إنکار ناکرێ! ئی واهەیە کە نەفسی لە بەرد دا دەیقەڵێشێ، أما سرّی مُجهولە! –خوا لە چاوەزاری بەد بمان پارێزی– زێدە تفصیل لە (تفسیری کبیر) و (روح المعانی) دا هەیە –مَعَ الأسَف– (سَیِّد رَشید) نەما نەمزانی ئەوچی لێ دەفەرموێ! (رەحمەتی خوایان لێ بێت). ﴿وَلَمَّا دَخَلُوا عَلَى يُوسُفَ﴾ حَسَبْ الوَصیّة چوونە ناو شار ئەڵبەتە شارەزاییەکان بووە کە لە ابوابی مُتَفَرّقە چوونە ژوور رێ دەرکەن بۆ جهەت سەرای عزیزی مصر. بالصِّحة والسلامة والعافیة داخلی بارەگای حضرەتی (یوسف) بوون. ﴿آوَى إِلَيْهِ أَخَاهُ﴾ برای خۆی داك وبابی بۆلای خۆی هەوراز برد ﴿قَالَ﴾ عزیز، بە دزی پێی ووت ﴿إِنِّي أَنَا أَخُوكَ﴾ برای شقیق برای بزر بووی تووم. رەنگە ئەو وەقتەی (یوسف) لای بابی بووبێ، (بنیامێن) ئەوەندە نەبووبێ کە صورەتی (یوسف)ی لە خیاڵی چەسپ بووبێ ﴿فَلاَ تَبْتَئِسْ﴾ غەمناك ومحزون ئەندوەگیر مەبە! ﴿بِمَا كَانُوا﴾ تا ئێستا ﴿يَعْمَلُونَ﴾ دەربارەی من و توو و بابم.

لە توراة دەزاندرێ سجدەیان بۆ عزیز بردییە، هەموو جارێ لە حضوری عزیز کەوتینە سجدە، تعبیریان لە خۆو بابیان بە عبدی دایتەوە –ئیتر

تەماشای (کتابی مُقَدَّس) بکە. ﴿فَلَمَّا جَهَّزَهُمْ بِجَهَازِهِمْ﴾ بارگەی بۆ رێك خستن وبەرێی کردن. ﴿جَعَلَ السِّقَايَةَ﴾ جامی ئاو پێ خواردنەوەی مَلِك دەکرێتە کەیل؟ کە جامێ بووە لە زیو مُرَصَّعْ بە جواهر یاسادە، یالەزێر بووە؟! لێرە دەفەرموێ (سقایە) دوایێ دەفەرموێ (صُواع)و لە قاموس وادەردەکەوێ بعضێ (صاع) و (صواع) ناکەن، بۆیە قیلێ دەڵێ: (جامێ بووە دَوابّي پێ ئاوداریە، حبوبی پێ پیورایە). وەبعضێ فرق دەکەن (صواع) دەکەنە جامێ ئاو. ﴿فِي رَحْلِ أَخِيهِ﴾ مُمْکنە خۆی بەدەستی مبارەکی جامەکەی هاوشتبێتە باری برای ﴿ثُمَّ﴾ دوای جَعْل ورۆیشتنیان ﴿أَذَّنَ﴾ بانگی دا لە بانگ دەرەکان ﴿مُؤَذِّنٌ﴾ بانگ دەرێ خاص، دەلالی عزیز! ممکنە مراد شخصێ دەنگ گەورە بێ، وەك (مچەی یاقوبی) (بەرەحمەت بێ) لە کۆلانی (کۆیە) بانگی دەکرد نان ولۆبیا لە چیای هەیبە سولتانی گوێیان لێ بوو. عادەت وایە ئەوەی دوای کاروان کەوێ، لە دوور بە دەنگێ بلندو بە قووەت بانگیان دەکات ﴿أَيَّتُهَا الْعِيرُ﴾ ئەی کاروانیان! ﴿إِنَّكُمْ لَسَارِقُونَ﴾ ئێوە دزن! چونکی دز معلوم نەبووە بە إعتباری شمولي بَدَلی خطابی لەگەڵ هەموان کردیە. دیارە مَقْصَد بە نداءْ، کورەگەلەکەیە، حوشترەکان نەبووە؟ قەیدی چیە بە نوعێ بانگ کرێن بە نوعێ تر خطابیان لەگەڵ کەن؟! ﴿قَالُوا﴾ کاروانیان ﴿وَأَقْبَلُوا عَلَيْهِمْ﴾ راوەستان روویان لە مُنادیەکان کرد وتیان: ﴿مَاذَا تَفْقِدُونَ﴾ لەچی دەگەرێن؟ بە سۆراغی چی هاتینە؟ ﴿قَالُوا نَفْقِدُ صُوَاعَ الْمَلِكِ﴾ پیاڵەی ئاوی. (صواع) و (سقایە) با یەك نەبن! پیاڵەیێ ملك ئاوی پێ بخواتەوە. بیداتە عزیزی نوێ، چۆن دەکرێتە کۆتکی زادو دانەوێڵە پێوان؟ حملی بعیر وأباعرەی کاروانیانی کەی پێ پڕ دەبێ؟ –دوایی دیم (إمامی)یش شتێ وها دەفەرموێ، یا گاهێ ئاوی پێ بدەنە حیوانات، وەگاهێ حبوباتی پێ بپیون، نابێ! وەقت نامساعدە! ممکنە عیارێ دروست کەن بیکەنە (صاع)! با (صاع) و (صواع) جوابەزین! دوایێ دیم (أبن جریر) لەگەلێ زەواتی نقل کردیە (صواع) و(سقایە)

یەکن، پیالەی ئاو پێ خواردنەوەن، بە غیری قرائەتی (صُواعْ)، راضي نیە — رەحمەتی لێ بێ— ! !

﴿وَلِمَنْ جَاءَ بِهِ﴾ هێنابێتی وبماندباتەوە ﴿حِمْلُ بَعِيرٍ﴾ باري حوشترێ، با بەکرێ بیباتەوە ! ﴿وَأَنَا بِهِ زَعِيمٌ﴾ کەسێ لەوان گورویان دەڵێ: (ئەمن کفیلم پێی بگات). إحتمالی هەیە زێدە تأمین بێ لە خَوْفِي جزاء، یاخود حاڵی حاضر پێی ناچێتەوە، هەر وەقتێ هاتەوە من بدەی بم! فُقَهاي ئێمە خلافیان هەیە، ئەمە إجارەیە؟ جعالەیە؟ کفالەتە؟ تأکیدە؟ بە مجهولیە؟ بە معلومیە؟ ئەگەر یەکێ لەسەر ئەو قسە بیدابایەوە وەدەعوای لێ کردبا بە گوێرەی إجتهادی مەلایانی ئێمە محکمە هەبان زەعیم دەعوای بطلانی ئەو جَعْل وإجارەی کردبا، ئایا ئەو زاتە چی دەکرد؟ چۆن حملی بعیرەکەی لێ دەستاند؟ (شَرعُ مَنْ قَبْلَنا) وَلَوْ کافریش بووبێ، ئایا (شَرعٌ لَنا)یە؟ یائەوە شرعی (یوسف)ە بۆیە (أبا یوسف) قسەی لێ نەکردیە؟ (محمد بن حسن) توجیهی بۆ جهەتی إجارەکە کردیە ! ﴿قَالُوا تَاللَّهِ﴾ بەخوا، (تا)ش (ت)ی وەکو (و) حَرفِي قَسَمە. لە (روح المعانی) وادەردەکەوێ لە مقامی تعجب قسم بە (ت) دەخورێ، رەنگە وابێ! ! ﴿لَقَدْ عَلِمْتُمْ﴾ بە چیان زانی؟ لە (سَیّدی آلوسی) بپرسە. أما تەماشای (مِنْه) وەکەی بکە، قسەی خۆش دەفەرموێ. جاری پێش شارەزایان بووین! قومێ بۆ زەخیرە کرین بێ لە جێگاێ دوور لە وەقتی غلاء، معلومتان دەبێ! ﴿مَا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِي الأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَارِقِينَ﴾ قەد لە عومری خۆمان ئێمە دزیمان نەکردیە دز نەبووین، وەبۆ فسادو خراپە نەهاتینە دیاری مصر! ﴿قَالُوا﴾ خدّامی (یوسف). ﴿فَمَا جَزَاؤُهُ﴾ جزای (صُواع) دزینی (صواع)، یادزی (صواع)! ﴿إِنْ كُنتُمْ كَاذِبِينَ﴾ لە دعوای براءَة لە دزی. ﴿قَالُوا جَزَاؤُهُ﴾ جزای ئەو کەسەی (صواع)ی لە باری دەرکەوت ﴿مَنْ وُجِدَ فِي رَحْلِهِ﴾یە! خۆی صاحبی رحل جزایە! دەبێ بە عبد بۆ صاحبی ماڵ. ﴿فَهُوَ جَزَاؤُهُ﴾ حەقە لازمە إجرا بکرێ. مُسْتَحَقي بێ! مُسْتَحَقیە ! (حاجي مەلا أحمد)ی مامم رۆژێ ئەو ئایەتەی لە بابم پرسیەوە، بابم بە سوکی وهاسانی جوابیدا، معنای

بۆ ئاشكرا كرد. مامم فەرمووی: (كاكە ئەوە چیە؟ چ سرە هەردوكمان لە یەك داك وبابێكین، ئەمنیش زۆرم خوێندیە، بۆ ئێمە هەتا شتێكی دەزانین زۆر ماندی دەبین؟ كە سؤال لە توو دەكەین بەهاسانی بێ مراجعەت جوابمان دەدەیەوە؟)، فەرمووی: (رۆڵە ئەگەر هێندە مەلا بای بتزانی با ئەمن چەند مەلام بەست بوو!).

﴿كَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾ دزي بێ ئەمەك. ظاهر وایە ئەو تَتِمَّەی كلامی كارونیان بێ، لە پێشەوە إشارە كرا بۆ بار پشكنین! ﴿فَبَدَأَ﴾ پیاوی (یوسف). ﴿بِأَوْعِيَتِهِمْ﴾ وعای بالي، وەغەیری بالی. ﴿قَبْلَ وِعَاءِ أَخِيهِ﴾ ممكنە گەڕابنەوە خزمەت (یوسف)، خۆی تفتیشی كردبێ! ﴿ثُمَّ اسْتَخْرَجَهَا﴾ دوای هەموان سروسیپاڵی برای پشكنی، سقایەی هێنایە دەرێ. ﴿مِنْ وِعَاءِ أَخِيهِ﴾ جێی إفصاحە! بۆیە اكتفاء بە (مِنْهُ) ناكا! ﴿كَذَلِكَ﴾ بەوجۆرە ﴿كِدْنَا لِيُوسُفَ﴾ دیارە خوا بەو كارە راضی بووە، جێی إعتراض وعتاب نیە! ﴿مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ﴾ ئەگەر بە مقابلەی سابق نەبایە، بە قانونی حكومەتی مصریە –زاتا– (الناس على دين ملوكهم) –وەقووەتی اجرائیە وإنشائیە لە حكومەتی مستبدّە ای (مَلَكِيّة) بۆی نەبوو سارق مقابلی مالی مسروق بكاتە كۆیلە! ﴿إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ﴾ بەو نوعە مَشیَّتی تَعَلُّقی بەست وهاتە جێ. ﴿نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ﴾ بەینی كلّی دەرەجەیێك خوا دەزانی چەند دوورە! ﴿مَنْ نَشَاءُ﴾ ئەوەی إرادە بكا، بلّندی بكا! وەخۆی دەزانێ كێ لایەقی ئەو ترفیعەی هەیە! نەك (كیف ما كان)! گەرچی أشاعرە كەیفیان بە وەجهی أوّل نایێ! ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ ئەو كلامە لە طَرَف خوایە، دیارە مفهومی مراد نیە! وەمعلومە ئەو (علیم)ەی (فَوقَ كُلِّ ذي علمٍ عَلیمٌ) بێ، چ بە إنفراد یابە إجتماع، كەس تَفَوّقی مُطْلَقی لەسەر نەبێ نیە! إلاّ خودا نەبێ. سواء بلّێین صفەتی زائدە لە زات، یاعینە، ﴿قَالُوا إِنْ يَسْرِقْ﴾ دوور نیە ﴿فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَهُ مِنْ قَبْلُ﴾ ئەوە تأثیری لای داكیانە! (یوسف)ی بۆ راستی وان دەكەنە دز، أمّا چ وجهێ واي بۆ نادۆزنەوە كە بەدزی حساب بێ! رەحمەت لەو كەسە بێ كە

دەفەرموێ: (درۆیان کردیە، ئێستاش دَمي کَذبیان بە کراسی (یوسف)ەوە ماوە!) ﴿فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ﴾ قسەی وانی بزر کرد. ﴿فِي نَفْسِهِ﴾ لە دڵی گرت متأثر بوو ﴿وَلَمْ يُبْدِهَا﴾ حَتّى بە أثري تَأثُر ﴿لَهُمْ﴾ بۆی ئاشکرا نەکردن ﴿قَالَ﴾ لە نفسی خۆیدا. ﴿أَنْتُمْ شَرٌّ مَكَانًا﴾ مَنْزِلَةً. ﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ﴾ نسبەتی سرِقَت بۆ دەدەن؟ خوا دەزانێ درۆی دەکەن. إنسان ئەگەر لە خۆی خورد دەبێتەوە، دەزانێ دائماً قسان دەکا، وەك بە زوبان قسان بکا وایە، هیچ فەرقی نیە، دەنگ نەبێ. ئەگەر ئەوە کلامی نفسی بێ، جێێ إنکارنیە، بەڵام ئەمەش وەك کلامی لفظي مرتبة! تا حرفێ نەچێ، ئەویتر نایێ! وەصفەتێ موجود واحد نیە، وەك حرکاتی لسانیە! کە وابێ کلامی نفسی إلاهی شتێ ترە! أما أصحابی ئێمە چاکی بۆ نەچووین. (جلالەدین دەوّانی)،(محەمەد عەبدە)،(مەلا وەسیم)، دوعا گوتان، جوانمان بیان کردیە! جێگای ئەو باسە علمی کلامە.

﴿قَالُوا يَا أَيُّهَا الْعَزِيزُ إِنَّ لَهُ أَبًا﴾ نەیانگوتیە بەندەتە، ﴿شَيْخًا كَبِيرًا﴾ في العمر والقدر! جێی ترحمە! ئەو کوڕەی مەگێڕەوە، ﴿فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُ﴾ ئەوە پەڕۆی سەر برینیەتی، منداڵە، لە ئێمەی خۆشتر دەوێ، بە ئێمە تَسَلّاي نایێ! ﴿إِنَّا نَرَاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾ وات دەبینن دەربارەی ئێمەو دەربارەی مساکین ئایندەو ڕەوەندە، ئەمەی لە تَتِّمەی إحسان حساب دەکەین! ﴿قَالَ﴾ (یوسف) ﴿مَعَاذَ اللَّهِ أَنْ نَأْخُذَ إِلَّا مَنْ وَجَدْنَا﴾ ناڵێ دز، ﴿مَتَاعَنَا﴾ معلومە چیە ﴿عِنْدَهُ﴾ لەمە خۆم دەپارێزم بە عنایەتی خوا، کارێ گەورەیە نابێ غیری ئەو کەسێ تر وەرگرین. کەس نابێ بە جزای کەس. ئەوە حیلە هەڵناگرێ. یەکجار دوورە لە دینی مَلِك. (یوسف) ناڵێ (وَحَياتي فِرْعَون)! زاتاً ئەو نوعە خرافاتە لە (قرآن)دا نیە. جێی کتابی مقدّسی (یسوعیان)ە!

﴿إِنَّا إِذًا﴾ ئەگەر وابکەین ﴿لَظَالِمُونَ﴾ غريقي في الظُّلْم مُتَجاوِز لە حَدْ دەبن! حتّا نَظَر بە دینی ئێوە! أساس تێوەگرانی آبنايْ يَعقوب (مَنْ وُجِدَ في رَحله) بوو، وە إلاّ دزی بەوەندە تحقق ناکا! ئێستا پێی دەڵێن (حيازة) ﴿فَلَمَّا

اسْتَيْئَسُوا مِنْهُ﴾ لێی بێ ئومێد بوون، معلومیان بوو کوڕەکە دەگێڕێتەوە، بدل قبولْ ناکا! ﴿خَلَصُوا﴾ لە قوم إعتزالیان کرد چوونە لایێ. ﴿نَجِيًّا﴾ بە خەلْوەت مشاوەرەو گفتوگۆیان لەگەلْ یەك دەکرد، چی بکەین؟ چی نەکەین؟ چارە چیە؟ چۆن بچینەوە لای بابمان؟ ﴿قَالَ كَبِيرُهُمْ﴾ برای گەورەیان، ناوی (رَئوبین) بووە –بنا لە کتابی ترجمەی (توراة)– لە تفسیرەکانی ئێمە (روبیل)ە، رەنگە تحریف بێ، (مجاهد) دەلْێ: رئیسیان ناوی (شمعون) بووە، یاگەورەی بە عەقلْ (یهوذا) بووە –بنا بە قولی (وَهَب) و (کَلْبي)–.

(حَقيقةً) مُتَبادَلْ قَوْلي جَمهورە! ممکنە ئەوەی سابقاً ووتی: (لا تقتلوا یوسف)، لێرە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَعْلَمُوا أَنَّ أَبَاكُمْ﴾ شێخی کبیر جگەر بریندار ﴿قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُمْ﴾ لەئێوە لەسەر ئێوە. ﴿مَوْثِقًا مِنَ اللَّهِ﴾ سوێند. ﴿وَمِنْ قَبْلُ﴾ پێش ئەزین ﴿مَا فَرَّطْتُمْ فِي يُوسُفَ﴾ چتان کرد؟ بەچی روویەکەوە دەچنە لای بابتان؟ ﴿فَلَنْ أَبْرَحَ الأَرْضَ﴾ لێرە لە أرضي مصر ناڕۆم بۆ هیچ لایێ، یا بۆ لای مملەکەتی خۆمان ﴿حَتَّى يَأْذَنَ لِي أَبِي﴾ زاتاً عَهد ومیثاقی إلاهی لەگەلْ یعقوب بوو. ﴿أَوْ يَحْكُمَ اللَّهُ لِي﴾ بە نجاتی برام، دلْی عزیز نەرم کا، یا بمرم! ﴿وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ﴾ حُکمی ئەو حُکمێکی کونیە، عیبارەتی نیە تا ممکن النقض بێ. ئەو قسەی لە زێدە معرفتە وەإلاّ غایەتی أوّل نَظَر بە مقام کافی بوو.

﴿ارْجِعُوا﴾ ئێوە بگەڕێنەوە ﴿إِلَى أَبِيكُمْ﴾ بابە پیرەکەتان! ﴿فَقُولُوا﴾ پێی بلْێن. ﴿يَاأَبَانَا إِنَّ ابْنَكَ سَرَقَ﴾ دزی کرد لە بدلی گێڕایانەوە، حاجت بە إظهاری ناکا، جزای حَکمی لا معلوم بوو! کەسێ بلْێ ئەو قسە قسەی (یوسف)ە، حەزی لە دزییە! ﴿وَمَا شَهِدْنَا﴾ لێرە یالەوێ. ﴿إِلاَّ بِمَا عَلِمْنَا﴾ دیتمان جامی ملکیان لە باری هێنا دەرێ! ئێمە وەثیقەمان داتوو ﴿وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حافظِينَ﴾ چوزانین کوڕت دزی دەکا، وەإلاّ عهد وپەیمانمان نەدەدا ﴿وَاسْأَلْ الْقَرْيَةَ الَّتِي كُنَّا فِيهَا﴾ مصر، یا قریەیێ کە لەوێ منادیان گەیشتێ. لەهەمو شارو دێ و دەرو دیواری سؤال بکە! ﴿وَالْعِيرَ الَّتِي أَقْبَلْنَا فِيهَا﴾ ئەو کاروانەی کە ئێمە لەناویاندا بەرەو وولاّت هاتین، حتّا حوشترو کەریان، مقصد ئیشەکە زۆر

ئاشکرایە، عالەم دەزانێ، کار بە دوو سێ شاهد نیە! - کوردی ئێمەش ئەو نوعە قسە دەکەن بۆ کاری ئاشکراو معلوم، دەڵێن: کۆیە دەیزانێ شارو دێ خبردارن لە مملکەت بپرسە -

﴿وَإِنَّا لَصَادِقُونَ﴾ دیارە برادەران مقابلی (یوسف) نەیانتوانیوە غیری تَضَرّع وزاریی ونیاز چیتر بڵێن ویکەن. (آلوسی) حکایەتێ نقل دەکا دائر بغضبي (روبیل) صَیْحەی (رۆبیل) (لله الحمد) کە نعرەتەی لێ نەدا، تهدیدی هەموو شارو مملەکەتی کردبوو. دوایی (یوسف) زووی زانی، دەنا ئاگری دەدا بە زوویی. رەنگە نعرەی (روبیل)ی وەك نعرەی (إمامی علی) بووبێ، چەند هەزار کەس کە گوێیان لە نعرەی بووبێ مردینە -نعوذ بالله لە نعرەی درۆیان- !!!

(فی الحقیقە) تأثیر لە أرواح دەکا. برایانی حسب الاشارە چوونە خزمەت بابیان ما جرایان عرض کرد. ﴿قَالَ﴾ بابیان فەرمووی: درۆی دەکەن راست ناڵێن. ﴿بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا﴾ ی وەکی مسألەی (یوسف)ی. ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾ تَحَمُّل دەکەم، ئەوی لای خوا ناخۆش بێ، نایکەم، وەنایڵێم! حُزن وگریە مجبوریە، ﴿عَسَى اللَّهُ أَنْ يَأْتِيَنِي بِهِمْ﴾ (یوسف) وبرای وکبیرهم. ﴿جَمِيعًا﴾ بە گردی هەموویانم بۆ بێنێتەوە، ﴿إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ﴾ حالم دەزانێ، دەزانێ لە چ حاڵ دام لە تا وان ﴿الْحَكِيمُ﴾ کاران بە خۆرایی وبۆرایی ناکا، بەبێ هودە منی واگرفتار نەکردیە ﴿وَتَوَلَّى عَنْهُمْ﴾ رووی لێ ورگێڕان. ﴿وَقَالَ﴾ بە ئاهو ئانین وزاری وگرین ﴿يَاأَسَفَى﴾ حزنێ شدید. ﴿عَلَى يُوسُفَ﴾ زیدة محبَّتْ بۆوی بوو،أصلی مصائب لەوێدا کەوت. ﴿وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ﴾ هەردوو چاوی سپی بوو بوون ﴿مِنَ الْحُزْنِ﴾ حزنێ تام. إنسان بەو نوعە دەوامی ئەندۆهی بوون چاوی گچکەو سیس پەردەی سەرەوەی سپی وکم قووەت دەبێ، زەردەیێ دەکا، (نعوذ بالله) وادەبێ نابینا دەبێ، هەروەك بە فرح چاو گەش ورەنگ صاف و بە قووەت دەبێ! ئەگەر گریانیشی لەگەڵ نەبێ وایە ﴿فَهُوَ كَظِيمٌ﴾ حُزن ورقی دەخواردەوە، یا پڕ بووبوو لە رقی أولادەکانی.

﴿قَالُوا﴾ ئەوانی حاضر بوون لەو وەقتەدا: ﴿تَاللَّه تَفْتَأُ﴾ زائل نابی، ئارام ناگری، لە فکری خۆتی نابەیەوە، علی الدَّوام ﴿تَذْكُرُ يُوسُفَ﴾ یادی دەکەی، کەست لەیاد نیە! هەر بۆ ئەو تأسّف دەخۆی – إحتمالی هەیە (یاأسَفي علی یوسف)یان لاگران بوویێ–. تەماشای (روح المعانی) بکە باسی قَسَمي بێ علامەتی إثبات وەقَسَمي لەگەڵ علامەتی إثبات! علامەتی إثبات (ل، ن)ي تأکیدە، ئەگەر نەبوو سوێند لەسەر نفیە، کەوابێ لێرە (لا) مُقَدَّر دەکەی دەبێتە (لا تَفْتَأُ) ئەگەر کەسێ سوێند بخوا (والله اقوم) ئەگەر هەستا سوێندی لێ دەکەوێ، ئەگەر هەڵنەستا (حانث) نابێ. طول وتفصیلێکی زۆری هەیە لە (حَلْف ي بالطَّلاق)! –گەر حەز دەکەی تەماشای کە، من کەیفم لێ نیە ترجمەی بکەم، زۆر دووروو درێژە–. سوێندیان خوارد علی الدوام یادی (یوسف) دەکەین ﴿حَتَّى تَكُونَ حَرَضًا﴾ نەخۆش ولاواز دەبێ، هەر هێسك وپێست دەمێنێ ﴿أَوْ تَكُونَ مِنْ الْهَالِكِينَ﴾ دەمری، امین بە نایبینیەوە، (یوسف) فەوتا لە قیس چوو، بێ هودە بۆچی ئەوەندە عاجز دەبی ویادی دەکەی؟

﴿قَالَ﴾ یعقوب، ﴿إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي﴾ حاڵ ناخۆشی خۆم. ﴿وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ﴾ (لا إلی غیره)، حاڵی خۆم عرضي خوای خۆم دەکەم، زللەتی خۆم، حاجەتی خۆم، حاڵەتی خۆم، إنکسار قلب وتأثّری خۆم، بۆ خوا دەنوێنم! إیستجلابي عواطفي رەحمانی پێ دەکەم! ﴿وَأَعْلَمُ مِنْ اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ دەزانم (یوسف) بەر حیاتە ملاقاتی لەگەڵ دەکەم، أمّا بە فِراقي متأثّرم دەگریێم، فرمێسکان دەرێژم، هاوار دەکەمە خوا، هانای دەبەمە بەر، زوو مُیَسَّري کا! ﴿يَابَنِيَّ﴾ رۆڵەکەینە! ﴿اذْهَبُوا﴾ برۆن دەرکەون ﴿فَتَحَسَّسُوا مِنْ يُوسُفَ وَأَخِيهِ﴾ جوستۆ جۆ بکەن، بیاندۆزنەوە! ﴿وَلاَ تَيْئَسُوا﴾ بێ ئومێد مەبن! ﴿مِنْ رَوْحِ اللَّهِ﴾ لە رەحمەتی، لە کشفی لادانی بەلایان، إزالەی غەمان، راحەتی دانەیی نسیمي لُطف وعنایَتي ﴿إِنَّهُ لاَ يَيْئَسُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ﴾ (نا أُمید آز رَحْمَتیشْ شَیْطان بُوَدْ). ئەوی إیمانی بەخوا هەیانێ

لەرەحمەتی مأیوس نابێ! لە أشدّو تەنگترینێ ئەحوالْدا چاوی لە کرمیەتی! حَسَبْ الأمر چوونە مصر ﴿فَلَمَّا دَخَلُوا عَلَيْهِ﴾ (یوسف). ﴿قَالُوا يَاأَيُّهَا الْعَزِيزُ﴾ (کما في السابق) بە عنوانی وەزارەتی ندایان کردێ ووتیان: ﴿مَسَّنَا وَأَهْلَنَا الضُّرُّ﴾ لا غیري لە برسان وشدّەتی گرانی. ﴿وَجِئْنَا بِبِضَاعَةٍ مُزْجَاةٍ﴾ قلَب! قبول ناکرێ بێ رەواج وفرێدراوە. إحتمالی هەیە وایان نواندیە کە رَدّي بضاعەتیان، لەبەر نالایەقی بووە، نە مراحلی عزیزانە! وەالاّ برای لێ نە دەگێرِاینەوە، رەحمی بەوان وبە بابیان دەکرد. ﴿فَأَوْفِ لَنَا الْكَيْلَ﴾ بە تەواوی بێ نُقصاني کَمّي وکَیفی، با دوو براشمان لە خزمەتت بن. ﴿وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَا﴾ لەبەر عائلەمان، وەمقابلی ئەو متاعە نالایەقە، أنّە وابزانە صدقەمان پێ دەکەی. أمّا تصدّق بە رَدّي برایان، حَقیقةً فَهم ناکرێ! ظاهراً وایان دیتیە، باسی برایان نەکەن! ﴿إِنَّ اللَّهَ يَجْزِي الْمُتَصَدِّقِينَ﴾ لاشك بۆیان ظاهر بوو بوو کە عَزیز مؤمنە، وە دیارە جزا بە واسطەی عنوانە. (آلوسی) قسەیێ لە نقّاش نقل دەکا —أما رام لە نقشی نیە— ﴿قَالَ﴾ (یوسف)، عَزیز. ئێوە ئەگەر ئەوەندە پیاون بە باوەرِێ دلّتان بۆ عائلە دەسووتێ، ناتوانن لە شدّتی بێ زادی دا بیان بینن، وەخوا جزای چاکی ومحسن وخێرکەران دەداتەوە، بۆچی رەحمێکتان بە (یوسف) وبابی (یوسف) وبرای نەکرد؟ ئەوشێخە گەورە ئەو غلامە معصومانەتان واگرفتار کرد؟ ﴿هَلْ عَلِمْتُمْ مَا فَعَلْتُمْ بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ﴾ دەربارەیان دلّتان نەرم نەبوو، چەندی پارِایەوە إستعطافي کردن، گوێتان نەدایێ. ﴿إِذْ أَنْتُمْ جَاهِلُونَ﴾ وەقتێ کە ئێوە جاهل بوون، عملی نالایەق و جاهلانەتان دەکرد ﴿قَالُوا أَئِنَّكَ لَأَنْتَ يُوسُفُ﴾ ئایا تۆ بەرِاستی بێ شبهە ئەتۆ (یوسف)ی؟! دەیانزانی غیری خۆیان کەسی تر نازانێ چیان بە (یوسف) کردیە. بلّێین چی إستفهامەکە حقیقە، تقریریە، إستغراب وتعجبە؟ ﴿قَالَ أَنَا يُوسُفُ وَهَذَا أَخِي﴾ حەقەتی، دایی بابی. بەلّێ برامە! ئێوە بە چ فکرێ، چیتان لە حەق ئێمە کرد؟ خواش بە إحسانی خۆی چی لێ کردینەوە. لە قعری چاە، هێنامیە سەر تەختی عزو جاە. ﴿قَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا﴾ خۆی وبرای،

یاخۆی! إنعامی لەحەق ئێمە کرد ﴿إِنَّهُ﴾ شأن، شأنەکە ﴿مَنْ يَتَّقِ وَيَصْبِرْ﴾ لە سیّئات خۆی بپارێزێ خصوص دەربارەی ناموسی وَلِّيُّ النعمة وەصبر بکا خۆی بگرێ بێ ئارامی نەکا جەنابی حەقی پاداشی دەدا. ﴿فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ (نَقّاش) نَقشي لێرە ناخونجێ ﴿قَالُوا﴾ بە کَمالی خَجالَت ﴿تَاللَّهِ﴾ سُبحانَ الله قَسَم بە إسمی جَلال لە قرآن لە هەر جێی بە (ت)ی هاتوە نازانم بۆچی بعضە کەس دەڵێن (و)ە کراوە بە (ت)، رەنگە ئەوانە (بەتێ بەتێ)یان بۆ بڵێن.

﴿لَقَدْ آثَرَكَ اللَّهُ﴾ بە مَزایاي مَوهوب ومُكْتَسَبْ. ﴿عَلَيْنَا﴾ لەسەر ئێمەی إختیاری کردی، دەبایە بە محاسنی فطریەت واحلامی عالیت بزانین لە طرف فاطر لەسەر ئێمە ترجیح کراوی! ئێمەش بوزورگیت قبولّ بکەین، أمّا نەمانکرد تەمامان بوو فطرەتی إلاهی تێك دەین. ﴿وَإِنْ كُنَّا لَخَاطِئِينَ﴾ إعترافیان بە خطای خۆیان کرد، ضمناً طَلَبی عفو دەکەن. طبیعی حضرەتی (یوسف) تێ گەیشت، بۆیە ﴿قَالَ لاَ تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ﴾ لَومْ وتَعیرْ لە منەوە بۆ ئێوە لەو ڕووەوە نیە! یا ئەمڕۆ نیە، کە وەقتی فیضانی غَضَبە جێی إنتقامە، دوایێ (بطریق الأولی)، ﴿يَغْفِرُ اللَّهُ لَكُمْ﴾ خوا لێتان خۆش دەبێ لە ڕۆژی جزا لە جهەتی من عذابتان نادا ﴿وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ کە من رەحمتان پێ بکەم، ئەو بالأولی، خوایە رەحمێ، ﴿اذْهَبُوا بِقَمِيصِي هَذَا﴾ ئەوەی لەبەری بوو لەو وەقتە وەبێنی گرتبوو. وابزانم (إبن عباس) بە دووری زانیە بە إلقای ئەو کراسە باوکی شفای چاوی پێ إعادەی بینایی بکاتەوە، کراسەکی (بەهەشتی) دروست کردیە، ئەو کراسە بووە وەختی خۆی باپیرە گەورەیان هاویشتە ئاگری، خوا لەبەری کرد، دیارە حفظي (إبراهيم) یش لە ئاگر بە سایەی قَمیصي جَنَّتی بووە. (فی الحقیقە) لەو قمیصە، ئەو قمیصە نازاندرێ! أمّا کراسێ لەلای پشتەوە داڕاو تا (یعقوب) بزانێ زنای نەکردیە، قَولێکە پینە هەڵناگرێ! ﴿فَأَلْقُوهُ عَلَى وَجْهِ أَبِي﴾ حکایەتیان بۆ کردبوو لە عاجزیت چاوی سپی بووە قووەتی نەمایە، إنّە کوێر بووە ﴿يَأْتِ بَصِيرًا﴾ دەبێتەوە چاو صاغ و

بەقووەت، یاخود دێتە لای من بە چاوصاغی! ﴿وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ ئەگەر دەفتەری نفوسیانت دەوێ –تەماشای توراة بکە–. حسب الامر لەگەڵ کراسی (یوسف)ی گەڕانەوە. ﴿وَلَمَّا فَصَلَتِ الْعِيرُ﴾ کاروان بەڕێ کەوت، لەوێ جوایەز بوونەوە –شەماڵ وەرە فێنکی دڵم– بێنی (یوسف)ی هێنا وەك کەسێ پێشین موژدە بێنێ. ﴿قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ﴾ لە رَوْحي خوا ریحی (یوسف)ی بۆ هات. فەرمووی من بێنی (یوسف) دەکەم. ﴿لَوْلَا أَنْ تُفَنِّدُونِ﴾ سَفيهمْ تَكذيبم نەکەن! نەڵێن خەڵفاوە! زۆر پیرو غەمدیدەیە! عەقڵی تێك چووە، کەم رأی بووە، پێم بڕوا ئەکەن. ﴿قَالُوا﴾ ئەوانی حاضر الوقت ﴿تَاللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَالِكَ الْقَدِيمِ﴾ مَحَبَّتی کە إنسان گومڕاە بکا صواب وناصوابی لێك ناکاتەوە. کوا (یوسف)؟ نەمایە! بامابێ لە وولاتێ دوور مُنْقَطع الخَبَرْ چۆن بێنی کراسی دێت و دەتکاتێ؟ ﴿فَلَمَّا أَنْ جَاءَ الْبَشِيرُ﴾ لە پێش خۆیان یەکێکیان بە سرعەت هەنارد، یا هات، دەڵێن (یهوذا) بووە کراسی حزنی بۆ بردیە أولاً، بَدَلاً کراسي فَرَحی بۆ هێنا. ﴿أَلْقَاهُ﴾ بشیرەکە. ظاهری وایە بێ دەنگ کراسەکەی هاوشتبێتە ﴿عَلَى وَجْهِهِ﴾ سەر رووی یعقوبی بە نەرمی وصبرۆکە وەك (ألقى الألواح)ە نیە! کراسی لەسەر چاو داناندنی، بە هەر نوعێ إستیعابی وجهی دەکا؟! ﴿فَارْتَدَّ بَصِيرًا﴾ ظاهر وایە لەبەر قووەتی بێن خۆشی وپێ خۆشی روح دەماغی، بووبێتەوە (بصیر). بێنی خۆش بۆ قووەتی چاو زۆر بە نفعە! خاصَّةً ئەو بێنە.

﴿قَالَ﴾ بۆ ئەوانەی حاضر. ﴿أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ مِنَ اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ ئەوا معلوم بوو کە (یوسف) صاغ وسلامتە. ﴿قَالُوا﴾ هەمویان. ﴿يَا أَبَانَا﴾ أحفادیش لە زەمانی بابیان وەك بابیان بە باپیری دەڵێن بابە! حتّا أکثر لە زاری مێیان وەر دەگرن بە بابیان دەڵێن کاکە! ئێمە وابووین! ئەوانی لە زەمانی باپیرمان بە ولد بووبوون بە (حاجی کاکە أسعد)یان دەگوت: بابە! بەبابەکانیان دەگوت: کاکە! ئەو قسمی دوای وەفاتی باپیرم بە ولد بووبوون لە زویانی ئەوانی گەورەوە بەبابیان دەگوت: کاکە! –من یەکێ بووم لەوان–.

﴿اسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا﴾ قَوْلي وفعلي، بلا واسطه وبه واسطه لەهی هەمومان ﴿إِنَّا كُنَّا خَاطِئِينَ﴾ لەوەی كردمان. بۆيه گوتمان: (العَفو العَفو). ﴿قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّي﴾ كه ملاقاتمان كرد لەگەڵ (يوسف) ئەو وەقتە منيش له حەقی خۆم عفوتان دەكەم وەدوعای لێخۆش بوونتان له خوای خۆم دەخوازم. ﴿إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ خواش له حەقی خۆی لێتان خۆش دەبێ. لەم تسويفه زۆر قسەيان كرديه. ئەو نوسرا به دڵماندا هات، دوائێ ديم (شَعْبي) دەڵێ تأخيری كرد تا سؤال به (يوسف) دەكا، ئەگەر عفوی كردن، إستغفاريان بۆ دەكا —ئەمە باشە بۆ عيللەتی زەمانی تسويف، يعنی تاكی موافق بن—. أمّا (شَرَفي أيّام البيض) لاي ئەوان وابوه تأخيری دوعای بۆ بكرێ، نايزانم، له (أبنُ جُبَيْر) بپرسه! ئەنجا گوێ له حكايەتی (أنَسي بنِ مالِك) راگره: بيست ساڵ ئەو پيره محترمه لەگەڵ (يوسف)ی دوعا دەكەن تاكو (جبريل بێ بشارەتی دەداتێ به قبوڵی دوعا).

له ڕوايەتێ دەڵێ: دوعايەكی فێر دەكا، ئەوجا تكای قبوڵ دەبێ. ﴿فَلَمَّا دَخَلُوا عَلَى يُوسُفَ﴾ هاتبوه پێشوازيان خيمەو بارەگاهی لەسەريان هەڵدابوو، لەوێ چوونه لای. ﴿آوَى إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ﴾ داك وبابی برده لای خۆی له باوەشی گرتن معانەقەی لەگەڵ كردن ﴿وَقَالَ﴾ طبيعي بَعْدَ الإستراحة. ﴿ادْخُلُوا مِصْرَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ﴾ لەچاوەزار، له شەڕو شۆڕ، لای (ابنُ جَريح) ئەو كلمه يعنی (ان شاء الله) له موقعي خۆی نيه، راجِعي قَوْلي يعقوبه (سَوْف أستَغفِرُ لَكم رَبّي) اِن شاء الله! — سُبحانَ رَبّي— ئەو تَقديم وتأخيره بێجێيه له ادنی كلامێكی عەرەبێكی جلفی قبوڵ ناكرێ، له كلامی خوا چۆن قبوڵ دەكرێ؟ لەبەر ئەونوعه توهماتەيه دەڵێن: (أدلّەی نقليّه إفادەی قطع نادا، بەس ظَنّييّات افاده دەدا). ئاياتی قرآنی ئەگەر نەڵێم أكثري زۆری دائر به عەقلّيات وقَطعيّات وارد بووه كه إفادەی مرام نەدا چ فائده؟! ئارايشی عيبارەت كەڵكی چيه؟ ئەو زاتە دەبا تەماشايی نێزيكی عيبارەتی يعقوبی كردبايه، بيكردبايه مَتَعَلّق بەقَوْلي (يوسف)ی (يَغْفِر الله لَكُمْ) (اِن شاء الله). ئەو قَوْلەش هەرچەند (ابن

جرین) نقلی کردیە، أمّا پێی راضي نیە. ئەوەی بە ادنی چاوێکی بلاغەت تەماشای قرآن بکا، ئەو نوعە هذیانە قبولّ ناکا. (حَسَبْ الأمر) چوون بۆ شارەکە دابەزین هەریەك لە جێی مناسب قراری گرت ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ﴾ ظاهر وایە هەردووکی لەسەر تەختی دانابن، تەختێ گەورە بەرانبەر خۆی. ﴿وَخَرُّوا لَهُ سُجَّدًا﴾ داك وباب و برایانی، بەڵکو أولادیشیان، بۆی کەوتنە سجدە. بەڕاستی –وَضْعي جَبْهه على الأرض–. بنا لە (توراة) براکانی سابقاً کە دەچوونە حضور، دەکەوتنە سجدە. ئەو عیبارەتە ئەوە دەگەیێنێ بێ إختیار کەوتبنە سەر روو و نێچاوان، وەك صعقەیەکیان بەسەر هاتبێ، لەپ و روو کەوتبن. خواو پێغەمبەر إعتراضیان لێ ناگرن –من بلێم چی؟ تأویل بۆ بکەم؟–. ﴿وَقَالَ﴾ (یوسف). ﴿يَاأَبَتِ هَذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ﴾ ماَلي تعبیري ئەوەیە، ﴿مِنْ قَبْلُ﴾ کە عرضم کردی. ﴿قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا﴾ وەك دیم شمس وقمر وستارە هەمویان سجدەیان بۆ دەبردم. –بە ڕاستی (جاءَ کَفَلَقِ الصُبْح)– ﴿وَقَدْ أَحْسَنَ بِي إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ السِّجْنِ﴾ مَعَ البراءَة! ئەدی، ئەدی، مرادە! ﴿وَجَاءَ بِكُمْ مِنَ الْبَدْوِ﴾ لە دەشت لادێ بۆ شارستان –الدّینُ والدُّنیا في البَلْدان– . أما ئێستا شارەکانی مدنی بۆ أهلی تَقوا کەڵکی نەماوە! ئەورووپایی بە سایەی سیّداتی راقصات ومُطربیَت ومُغَنیّات، وهَکذا، سَدّي دینیان شکاند، شَرَفِي بَشَري بووە پارە، پایەمال بوو! شَیْطان نَظَر بەوانە مَخجولة، پەشیمانە. ﴿مِنْ بَعْدِ أَنْ نَزَغَ الشَّيْطَانُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِي﴾ غروری هاویشتینە بین تحریکی دان من بکوژن بمفەوتێنن. ﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمَا يَشَاءُ﴾ ئەوەی حەز بکا، رێکی دەخا، بە تدابیری وردە وردە، بەڵکی نایەتە خیالّ وحس، دەرك ناکرێ کە ئەو مقدماتە منتجی ئەو مطلوبەیە! چیان بەسەر (یوسف)ی هێنا؟! عاقبەتی بووە چی؟! بۆ (یَخْلوا لَکُم وَجهُ أبیکَم) کَیْدیان لەگەڵ (یوسف) کرد، کەچی (علی الوجه والجباه) بۆی کەوتنە سەجدە، ﴿إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ بە حصر. (عَدو

شَوَد سَببي خَیْر، اگر خودا خواهد). هەر خوا دەزانێ چی دەکا، وەچۆنی دەکا. حەز دەکەم چەند کەلمەیێ عرض بکەم وەلو کەمێ درێژ دەبێتەوە:

یەکەم: بابم (رَوَّح الله روحَهُ) لە زەمانی تحصیلیا عاشقی (حَلیمەی کچی مەلا محمدی کاك عبدالله ی شێخ وەتمانی) بوو بوو أمّا عشق وغرامی پاك — نهایەت خوا نصیبی نەکرد. پاش چەند وەقتێ لەسەر بانی مزگەوتی خۆمان دەیفەرموو: دەورم دەکردەوە حسب العادە دەهاتم ودەچووم، کە رووم دەکەوتە لای شرق بۆنی (حلیم)م بۆ دەهات دەمگوت یاربّی ئەمە چیە؟! کەمێکی پێ چوو لە دامێنی (هەیبە سوڵتان) سیاهێ دەهات بۆ لای (کۆیێ) تا دەهاتە پێشن بێنی ئەو یارەم بۆ زیاتر دەبوو —خلاصە معشوقەی قدیمی بوو، بۆ تداوی هاتبوو بۆ کۆیێ— گەلێ جار دەیفەرموو رۆڵە ئەو کەسی ئەو نوعە غرامەی نەبوویێ وە لەدوورەوە بۆنی محبوبەی نەکردبێ، بە تەواوی إیمان ئەو ایەتە یعنی (إنّي لأجِدُ ريحَ يوسف) ناهێنێ.

بە مناسبەی بوونی بە (مفتی) (شێخ محمد سَیّدي بَرْزنجي) لە (ئەستەنبوڵ) هاتەوە، بە کۆیێ دا چووە سُلَیْماني. بابم پاش مغرب چووە زیارەتی، دەست لە ملان بوون یەکتریان بۆن کرد موقعەکە وابوو ئەوانی لە معیّەی دابووین کەوتبوینە تاریکی یەك دوو کەس پێش من چوونە دەست ماچ کردنی، من چووم زیارەتم کرد دەستی بەر نەدام ووتی ئەو زاتە نسبەتی چیە لەگەڵ جەنابی مەلا؟ ووتیان کوڕیەتی. ووتی (سبحان الله) ئەو بێنی لە جەنابی مەلام کرد عینی ویم لەم زاتە کرد! زانیم قرابەتی لەگەڵی هەیە.

دووەم: بێن زۆر دەڕوا، غایێتی قووەی شامّە مختلفە. وەك حکمایان دەڵێن بعضە طَیرێك لە زەخمە، لە مسافەیێکی دوور بێن دەکا، بەدوای بۆنی لاشەدا دەچێ —ئەو طَیْرە بە کوردی پێی دەڵێن (داراش)—. دفعەیێ لە (جەل=جەلی) بووین، چووینە زیارەتی باپیرە گەورەمان (مەلا عبد الله ی کاکی جەلی) لە أثنای زیارەتی مَرْقَدی لە جیهەتی شیماڵەوە دوو جار لەگەڵ نسیمێکی فێنك

بۆنێکمان بۆ هات ئەوەندە خۆش بوو مُتَعَجِّب بووین ئەو بێنە چبوو؟! لەکێوە هات؟ دوایی هەرچەند إستنشاقمان کرد بەرەو شمال راوەستاین چیدی نەبوو.

سێیەم: لە مجلّەی (كُلُّ شَيْءٍ)ی مصری عَدَد (٤٣٧) رۆژی چوار شەموو، ینایر (١٠) رَمَضان (٢٤)ی سنەی هجری (١٣٥٣) سنەی میلادی (١٩٣٤) صحیفە (٢٥) بە عنوان (حاسّة واحِدة أمْ خَمسُ حَواسٍ) دەڵێ: بێنی خۆش ومۆسیقا تقویەی بصر دەکەن. أنّە سؤال دەکا، سببی چیە ئەگەر گوێت لە شتێ خۆش بوو تأثیر لە بَصَر دەکا، پەسیو تأثیر لە بصر وسمع دەکا، چاو یا گوێ ئێشان تأثیر لە قووەتی شامّە دەکا -مع انە هەریەك مرکزی خاصّی خۆی هەیە لە مێشك- کەس حَلّی نەکردیە تاکو دکتور (هارتومان) ئەو نَظَرِیّەی دانا، دماغ مستودعە بۆ قووەی فکر وخیاڵ واحساس، ظاهراً مُنْقَسِمە، أمّا لە باطن وحقیقەتدا تقسیم نیە! بەڵکە یەك مَنْبَعیان هەیە! قوای ذهنیّە لەوێڕا فیضان دەکا، لەلای ئەو مَرکَزە مُعَیَّنە تیّاراتي حَواسْ لە أعضای حَواسْ، بَصَر وسَمْع وشَمّ وذَوْق ولَمس، تَلاقی دەکەن - ئارەزووی دەکەی تەماشای بکە-.

سرور لە تقویەی خوا زۆر دخلی هەیە حتّا لە کوردیدا دەڵێ: إنسان بە گوێ قەڵەو دەبێ، یعنی بە قسەی خۆش! وەقوای عاملەش بە قووەت دەبێ، هاظمە وغازیّە ونامیّە، تأثیریان زیاد دەبێ.

چارەم: لە (توراة) دەڵێ کە (طاس) لە باری (بنیامێن) دەرکەوت لە بَدَلی گێڕایەوە (یهوذا) چووە لای گەلێ پاڕایەوە ناورایەوە (یوسف) تَأثُّری زیاد بوو، خۆی نەگرت گریا خۆی ئاشکرا کرد -باسی ریحی (یوسف)ی تێدا نیە- مع أنە ریح مادیّە (وَهُم من أهْلِ المادّیات والمحسوسات)، دوور نیە إسقاطیان کردبێ، وە الاّ لە زەمانی رسالەت (أحْبار) اظهاریان دەکرد کە قرآن لێرە مخالفی توراتە، لای ئێمە إعتباری پێ نیە.

پێنجەم: (الأمرو مَرهونة بأوقاتها) (سَعْدی) دەڵێ:

یَکی پُرسید ازان گُم کردە فُرزند		کی ای رەوشن گوهر پیری خیرتمند
زُ مصرش بۆی پیراهن شُنیدی		چرادر چاهی کنعانش ندیدی

بگفتا احوالی ما برقیٚ جیهانست دمیٚ پیدا ودیگردم نهانست

ئەگەر ئەو لەو وەقتەی بیزانیبا، طبیعي دەیهێنایەوە. ئەو أحواڵ و ماجرایە نەدەبوو. وەك حضرەتی (یوسف) دەفەرموێ (إنَّ ربّي لَطيفٌ لِما يَشاءُ) ئەو لطايف و تدبیرو عبرە دەرنەکەوت، آيات و عِبَری مَقصود، ظاهِر نەدەبوو.

شەشەم: بنا لە (تَوْراة) فرعون خبر دار بوو شرفی نسبی معلوم بوو گۆییا سابِقً دەعیەی نەدێنا (یوسف) نانی لەگەڵ بخوا چونکی بە کۆنە کۆیلەی تێ دەگەیی، جا کە حورمەتی زیاد بوو أمری کردە (یوسف)، (یوسف) بە برایانی فەرموو عرەبانان ببەن ماڵتان بهێننە مصر. أمّا لە (قرآن) باسی (فِرعَون) لێرە نیە.

حەفتەم: نەیانتوانی بە صریحی بە (یوسف) بڵێن عفومان بکە، أما بە بابیان گوت.(یوسف) دەفەرموێ: (هو ارحم الرحمين)، (یعقوب) دەفەرمێ: (انه هو الغفور الرحيم). (فی الحقیقه) زۆر مناسبی حاڵ و مقامە. (نَبْذَة) هاتنە جێی خەون چەندە؟ چلە؟ پەنجایە؟ معلوم نیە! ما بەینی خەونی (یوسف) و تاویلی چەند بووە؟ بە ڕاستی نەزاندراوە. عمری چەند بووە؟ چەند پاش بابی ژیاوە، عائدی تاریخی صحیحە! عِبَرو آیاتی مَقصودی تیا نیە. زاتاً قرآن أهمیەت بەو نوعە شتانە نادا. لاشك کتێبی تاریخ و کتێبی هدایت و إرشاد و حُلم و عِبَرْ وەك یەك نین ﴿رَبِّ قَدْ آتَيْتَنِي مِنْ الْمُلْكِ﴾ بَعضيٚ، تەواوی ملکی مصر، نا دیارە نەبویتە ملکی مصر. ﴿وَعَلَّمْتَنِي مِنْ تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ﴾ ئەوەی خبری لیٚ بیٚ لە أحادیث، سِیَّما نَظَر بە حاڵ و مەوقعی (یوسف) (علیه السلام) أسراری کتێبی إلاهی و دقائقی سُنَنی أنبیاء نایەتە خاطر و خیاڵ! دیارە زانینی تعبیری خەونان بە نعمەتی خودا حسابە، خاصةً لەگەڵ چارە زانینی بۆ دروست بوونی! وە مالکی و عالمی، حَقًّا نِعمَن فوْقَ النِّعَمْ! علْمي بیٚ ماڵ، بیٚ نوورە، بۆیە مُقَدَّمي مؤَخَّرْ کرد ﴿فَاطِرَ﴾ مَبدِع و خالق. ﴿السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ شەقی کردینە، لێك جودا بووینەوە. إنفصالی سیارات لە شمس، وە أقمار لە سیارات ئەگەر وابیٚ زۆر موافقە! ﴿أَنْتَ﴾ وحدك.

﴿وَلِيّ﴾ قورتارت کردم، کەس بەهانام نەهات، لە چ حالێ گەیە چ حالێ. هەر معنای لە (ولی) دەدەنەوە، موافقە، با هەوبێ! ﴿فِي الدُّنْيَا﴾ ئەوا دیارە ﴿وَالآخِرَةِ﴾ کە لە دونیا هەر تۆم وَلّی بی، لە آخرەتیش بِطَرِيقِ أَوْلى، کەسی تر نیە (تَوَفَّنِي مُسلِماً)! دیارە دوعاو طَلَبِي مَوْتِي عَلى الإسلامْ وەکو مُسْلمان دەڵێن: رَبِّي بە إیمان بمکوژە. مُمکنە ئەو دوعایەی لە نزیك سەرەمەرگ فەرمووبێ، نەك لەو حینی کە قسەی لەگەڵ بابی کردبێ، طَلَبی مردنی کردبێ! وە لەو وەقتە وَصیّەتی بابی هاتبیتە خاطری (ولا تموتُنَّ إلاّ وانتم مُسلِمونْ). وا بزانم ئەو دوعایە بَعضێ بە دووری دەزانن، بۆیە گوێ نادەنە قیدی (مسلماً) وەخۆ ماندی دەکەن بۆ تَوْجیهی طَلَبی مَوْت. دوایێ تەماشای تفسیری (نیسابوور)م کرد دەفەرموێ: (أراد الوفاة علی حال الاسلام والخَتْمُ بالحُسنی كَقَولِ يعقوب لِوَلَدِه – ولا تموتُنَّ إلاّ وأنتم مسلمون–) رەحمەتی لێ بێ –.دوایێ وەك سائلین تَفصیلات وتَوجیهاتی بیان کردیە–﴿وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ آبائی کِرامی و سائری رُسُلی عظام. مَرتبەی صَلاح مُتفاوِتە. دیارە صلاحی اُلُ العَزم، فَوقی صَلاحی سائری آنبیایە! صلاحی أنبیاء فَوقی صَلاحی أولیایە! یا إلاهی ئەمە چ بەلایە چ مُصیبَتە چ نزعەیکە؟ شیطان هاویشتیتە بەینی ئەو دوو طائفە ئەو دوو فرقە لە برایانی! إسلام (سنّي و مُعتَزلي) لەهەر کوێێ کەلێنیان بۆ هەڵکەوت، بەسەرو پۆپلی یەك دادەدەن، ئاگایان لە روحی آیة نامێنێ! وهکذا ئەم نَزعە دەوام دەکات. ناظر تەماشای قووەتی إیمانی دەکا أمّا ئاسووودە دانیشتوە لە بَهْوي خۆی قەڵەم دەگێڕێ نازانێ بعضە شتێ وا هەیە نە دەلیل دەیلێ، نە إیمان دەیەوێ، وەك مسألەی قَومیّة! لە زەمانی ئێمە چەند هەزار کەسی بە دڵ وەرگێڕا، یا عَداوَة! بزانن عداوەتی عەرەب چی کرد بە تورك! پاش ئەو هەموو خزمەتە چۆن لە دین دەرچوون! ئەبا مُعتَزلیش و سُنّی بپارێنەوە خوا لەو نَوعە إلْجائاتیەیان بپارێزێ. – جا وەرە تەماشای تَوْجیهاتی مُفَسّرینان بکە بۆ جَوازو تَوجیهی تَمَنّای مَوتْ! – ﴿ذَلِكَ﴾ ئەو ماجرایە. ﴿مِنْ أَنْبَاءِ الْغَيْبِ﴾ بعضی کە لە أخباری غَیب، لە ئێوە بزر. ﴿نُوحِيهِ إِلَيْكَ﴾ لە

بەینی قومیٚ أمّی بۆ تووی بە وَحـي دەنێـرین خەبـەردارت دەکـەین ﴿وَمَـا كُنـتَ لَدَيْهِمْ﴾ لای برایانی یوسف نەبووی. ﴿إِذْ أَجْمَعُـوا أَمْـرَهُمْ﴾ گردبوونـەوە لەسـەر حُکمیان بـە إجمـاع قبولّیـان کردیـە یوسـفی باوێنـە بـیر. ﴿وَهُـمْ يَمْكُـرُونَ﴾ بـۆ هێنانە دەریٚ لە دەست بابی. ئەو إخبارە لاشَكْ آیتیٚ عَظیمە، رەوشنە، دەلیلـە لەسەر صدْقی رِسالەت پەناە ﴿وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ﴾ أهلـی مَکّة ئـەو وەقـتی وكَـذا بَعْدَه. ﴿وَلَوْ حَرَصْتَ﴾ لەسەر دەعوەتیان وإظهاری آیاتی نافعة ﴿بِمُؤْمِنِينَ﴾ بـە رسالەتی توو. مَعَ أنّهُ ﴿وَمَا تَسْأَلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ تا مُتَّهم بی بۆ مـالْ وریئاسـە ئەو هەرا هەرایە دەکات ﴿إِنْ هُوَ﴾ قرآن، یاخود (مـا أُوحـيَ إليـك). ﴿إِلاَّ ذِكْـرٌ﴾ پەندو تذکیرە. ﴿لِّلْعَالَمِينَ﴾ هەمو کەس، عەرەب مَکّی وغَیْـرە مَکّـی، وە غـیرە عەرەب. ئەمە فخـرە بـۆ ئێـوە زاتـیٚ لـە ئێـوە بیێتـە رەسـولی أنـام دەبـاپێش هەموو عالەم مسارعە بکەن بۆ إیمان ونصرەت دانی رسول، لکنْ تّذکر ناکەن بە آیاتی قرآنی إیمان نائینن! نە تەنها بە آیاتی کتـابی مُنَـزَّل ﴿وَكَـأَيِّنْ مِـنْ آيَـةٍ﴾ لا تُعَدُّ ولا تُحْصی. ﴿فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ لە کتـابی أکـوان، لـە عالـەمی عُلْـويِّ وسُفْلي. ﴿يَمُرُّونَ عَلَيْهَا﴾ بە سەیارە دەڕۆن، بە سطحی دەبیینن. ﴿وَهُمْ عَنْهَا﴾ لـە آیـات ﴿مُعْرِضُـونَ﴾ بـە عقـلْ ورۆیتــی مفکــرین نــاینۆڕنیٚ، روویـان لــیٚ وەردەگێڕن. أمّا عُلَمای نَحْـوی مُـسْتَغرقن لـە تەماشـای (کَـأیّن) وەگـەلیٚ کـەس مشغولْ دەبن بە قراآتی غیرە مَعتَبَرە، إشـعار بـە سـعەتی إطّـلاع! ﴿وَمَـا يُـؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ﴾ أکثـری نـاس لـەو قبیلانـەی کـە مـستفادە لـە (ومـا أكثـر النـاس) لـە پێـشەوە. ﴿بِاللّـهِ﴾ بـە وجـودی خـوای خـالقی سمـاوات وأرض. ﴿إِلاَّ وَهُـمْ مُشْرِكُونَ﴾ مُوَحِّدی راستی (قَلیـلٌ في قَليـل)ە. لـە بعـضە رسـائلی خـۆم عرضـم کردینە کە هیچ فِرقە نیە خـالّی بـیٚ لـە شـرك، یـا بَعضە ممکناتێکیـان بردینـە دەرەجەی واجب الوجود، یاواجب الوجودی دەبەنـە ڕیـزەی بعـضە ممکناتێـك، حتّا کەم یازۆر لە فِرَقی إسـلامیش، لـە هـەمووی خـراپتر مُتَـصَوِّفە ومُتَـشَیِّعن! لێرە قسە لە ریاکار نیە! ﴿أَفَـأَمِنُوا﴾ ئایـا أمیـنن؟ آمـین بـووین؟ ﴿أَنْ تَـأْتِيَهُمْ غَاشِـيَةٌ﴾ پارچـەیٚ کـە دایانپۆشـیٚ بەسـەریان دابـیٚ. ﴿مِـنْ عَـذَابِ اللّـهِ﴾ چۆن

غاشیەی جهل ئەوانی داگرتیە لە دیتنی آیات کوێر بووین! ﴿أَوْ تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ﴾ قیامەت. ﴿بَغْتَةً﴾ لەناکاو بێ مُقَدمة. ﴿وَهُمْ لاَ يَشْعُرُونَ﴾ ئاگادار نین، ئاگایان لە خۆیان نەبێ! ﴿قُلْ هَذِهِ﴾ ئەوە ﴿سَبِيلِي﴾ دَعوَتي إلى الله الواحد بێ شریك، رێی منه! ﴿أَدْعُو إِلَى اللَّهِ﴾ بۆ معرفتی صفاتی تَقَدُّسي ذاتي. ﴿عَلَى بَصِيرَةٍ﴾ بێ تَرَدُّدو وَهْم ودَغدَغه بە کَمالی قووەتی قَلْبی، تێك ناچم بە ادنی وەهمێ! ولَوْ تَأخیری وَعدیشم ببێ. ﴿أَنَا وَمَنْ اتَّبَعَنِي﴾ أوَّلاً بە إیمان، ثانیاً لە دَعْوَت. ئەوانیش دَعْوَتی إلى الله یان بە إتّباعی من (علی بَصیرة)ە. ﴿وَسُبْحَانَ اللَّهِ﴾ لە هەموو نَقْص وعەیب تنزیهی دەکەم. ﴿وَمَا أَنَا مِنْ الْمُشْرِكِينَ﴾ ئەوی مُشرکی بەحەقە، تنزیهی خوا ناکا! ئەوی تَقدیسی خوا بکا، مُشرك نیە! وە هەروەها ئەوی إتباعی بکا، نابێ مشرك بێ! بەلاّم مَعَ الأسَف شرك لە عالەمی إسلامی دا إنتشاری کردیە، أكثَری إعتقادیان، شِرْکە! أمّا بەناوی دین دایانپۆشی، وەشِرْکیان لە فەوقی شِرکی مُشرِکەکانی پێشیە، بە ناوی خوا شوناسیە! أمّا خوا —العیاذُ بالله— أمر بەرە، شَریکی أصْغَرە، بۆ تَوسیعی شرك توسیعیان دایتە قَدْرَتی إلاهی، ئەوەی بە خاطر وخَیالێ دانایێ، بۆ إلاهی خۆیان دەیخولقێنن! مُوَحِّدێ ئەگەر تنقیدیان بکا، دەڵێن: (ئەدی خوا مُقْتَدِر نیە لە تدبیری خۆی؟ خوا قدیرە شأنی خۆی بداتە کەسێ ئارەزوو بکا!!).

مەلا بێ هێزە، ناتوانێ قسە بکا بڵێ: (جەنابی حەق لە شئونی زاتیەی خۆی قُدرَتی نیە! ئەو نوعە أمورە مُقْتَضای ذاتیە! بۆ إختیارو بەخشینی، ڕێ نیە! ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالاً﴾ پیاوو إنسانێ وکی توو! مَلَك، نا! زاتی أقدّسیش خۆی هەرنەهاتووە! قسە لە ژنان، هەر نیە! ئەو مُتَكَبِّر وعنودانە إیمان بە زاتێ وەکی (محمد)(ﷺ) نایێنن، چ جێی خۆیەتی (سُجاح) مشهورە پاش رحلەیێ رسالەت پەناه ظهوری کردیە، نزولی ئەم ایەتە لە حەق ئەو، صحّەتی نیە! وەك (آلوسي) دەفەرموێ: (کَونه إخباری بالغیب بێ قرینەیە!). بەلێ إتباعی (سجاح) ئەگەر پیاوایان هەبایە، گوێیان لەو نوعە ایەتە راگرن،

ممکن بوو! پاش ئاشکرابوونی درۆی ئەو و (مُسَیْلَمه) یەکی لەناو مەردان واتباعی دەڵێ:

أمْسَت نَبيُّنا أُنثى نَطُوفُ بها ولَمْ تَزَلْ أنبياءُ الله ذُكرانا

فَلَعنةُ الله والأقوام كلهم على (سُجاحَ) وَمَنْ بالأفك أغرانا

أعني مُسَيْلَمة الكَذّاب لا سيقت أصداءهُ ماءَ مُزْنٍ أيْنَما كانا

حکایەتی لەگەڵ (مُسَیْلَمه) مشهوره! دەڵێن دوایی گەڕایەوە مسڵمان بووه، حَسُنَ إسلامُها یە- أمّا پاش فیش دانی مُسَیْلَمَة-. ﴿نُوحِي إِلَيْهِمْ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى﴾ شارو مملەکەت وە ئێوەش لە أهلی (أمُّ القُرى)ن، ئەڵبەتە أهلی (قُرای) زەمانی سابق زەکاوەت و طهارەتیان زیاد بووە لە أهلی (بَدُو) معاذ الله خباثەتی قلب قالب ئێستا لە شاراندایە، لادێ ئەگەر دەجّالەکان لێ یان گەڕێن زۆر پاکترن و زەکایان لە أیامی سالفه علی العموم لە ترقّی دایە ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الأَرْضِ﴾ ئەو منکرانە نەگەڕاین ﴿فَيَنْظُرُوا﴾ لە ئاثاری دیاران، یالە أهلی تأریخ پێکەوەن، بزانن ﴿كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ چیان کرد؟ چیان بەسەر هات چیان لێ هات؟ بە حیاتی دونیا بە لَذائذ ونِعَمْ فریتە بوون، دنیای فانی بێ خێر وبێر ﴿وَلَدَارُ الآخِرَةِ﴾ حیاتی آخره ﴿خَيْرٌ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا﴾ لە شرك گوناه بە إیمان وعملی صالح حیاتی دونیاشیان خۆشتر دەبوو. دین مَنعی إنسان دەکات لە أکداری حیات لە أموری قبیحەی کە لە شرفی إنسان نەوەشێتەوە ﴿أَفَلاَ تَعْقِلُونَ﴾ تێ فکرن عبرەت بگرن، لە عاقبەت بترسن، ئەو أقوامانەی قبوڵی دەعوەتی رُسلیان نەکرد، إنذار کران، فائدەی نەدا، حتّی ئەیانگوت: (گەر ڕاست ئەکەن، بابێ عذابمان بۆ بێ) عذابی إلاهی تأخیر بوو کافرەکان قەشمەریان پێ ئەکردن، (وەك قومی توو)، (شرور) و (قبایح) دەرحەق رُسُل أتباعیان زیاد بوو، دائم لە إشتدا دا بوو، أثری إمداد لە طرفی (مُرسل الرُّسُل) ظاهر نەبوو ﴿حَتَّى﴾ ضیقەت گەیشتە دەرەجەیەکی ﴿إِذَا اسْتَيْئَسَ الرُّسُلُ﴾ بێ ئومێد بوون، یأسیان بوو لە إیمانی مەلای قوم وەأتباعیان، یا لە إمداد ونصر بە سەریاندا، ئەوان بە قوەت وکثرەت، إتباعی

رُسُل بێ هێز و کەم ﴿وَظَنُّوا أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا﴾ دڵیان کەوتە دەغدەغە، ئایە ئەوەی بۆ ئێمە هات، دائر بە عذابی قوم ونجاتی ئێمە، أُمنیە و إخباری نفس بوو، یاوەحی إلاهی؟ ئەگەر وەحی إلاهی با بۆ تائێستا نەدەهاتە جێ؟ دیارە وەحی نەبوو، بەڵکو و خوا لەبەر غِنای ذاتی مبالات بەوانە ناکا، عذابیان نادا، درۆ بوو واردی خاطِرمان بوون لە طَرَف خوا نەبوو، ئەو حاڵە حاڵێ روحی ونفسی بوو زۆر ناخۆشە یەکێ وەك جەنابی رسالەت پەناه لە ابتدای حربی بە درجەیێ إضطرابی هەبوو، لەو هەنگامە ناخۆشە لەو وەقتە، بێ ئومێدی وهەناسە ساردی بێتە سەر ﴿جَاءَهُمْ﴾ بۆ رُسُلەکان ﴿نَصْرُنَا﴾ هەریەك بە نوعی بۆی هات، ئەم خۆشیە، ئەم فرحیە، ئەو دلگوشادی یە. پاشی تەنگی ﴿فَنُجِّيَ مَنْ نَشَاءُ﴾ رُسُل و إتباعیان ﴿وَلاَ يُرَدُّ بَأْسُنَا﴾ شدَّەتی عذابی ئێمە کێ دەی گێرێتەوە؟ ناگێڕدرێتەوە ﴿عَنْ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ﴾ شدائد، أولو العزم ئەهاوێتە زەلزەلەو إضطراب، وەکی کوردی ئەڵێ: (تاوی یەکانە و قسەی بەر ئاگردان نابێتە یەك!) ئێمە داخلی ئەو نوعە شدائدە نەبووین، معاذالله. بووباین، خوا ئەزانێ چیمان ئەگوت؟! خوای تعالان لەو (ظن) و (یأس)ە، عتابی لێ نەگرتینە، طعنەی لێ نەداین، چ حاجەت من خۆم ماندی کەم، خوا لەو حاڵە نصرەتی داین، بە لُطفی إلاهی لەو شدَّەتە قورتار بووین. فائدەی بۆ جنابی رسالەت پەناهو أتباعی خۆگرتنە بە خَطَرانیش رێ نەدەنە یأسُ و ظن. وە ضِمناً ئومێد ئەدا بە (فرجی بعد الشِدَّة) {إشكال} یأسی رُسُل لە إمدادی إلاهی وە ظنی مذکور لە دەوری صحابان، بە إشکال زاندراوە، حتّی ئەو مەعنای سابقا ذکر کرا، نەقلە لە (إبن عبّاس) بە (ذالي مَکسوري بێ شدَّە). لە طَرَف (أمُّ المؤمنین) عائشە، رەدکراوەتەوە، (أمُ المؤمنین) (كُذِّبوا) بە شَدّي (ذال) ئەخوێنێتەوە، وە نسبەتی بۆ رُسُل ئەدا، یەعنی رُسل ظنیان برد کە أتباعیان تکذیبیان ئەکەن. (إبن جریر) روایەتێ عدیدە لە (إبن عبّاس) نقل ئەکا (كُذِّبوا) بە قرائەتی مشهوری بی (شدَّة)، یأسی رُسُل لە إیمانی قوم، ظنی قوم کە رُسُل درۆیان کردیە. عذاب و عقاب نیە، یەعنی درۆیان لەگەڵ کراوە لە

طَرَف رُسُل. (إبن جرير) ئەم قرائەت و تأويلەی إختيـار كرديـە، بنـاء لـە تبـادل معنای أسـبق إلى الـذهن، بعـضیٚ مردنيـان لا سووك تـر بـووە، لـە قبـوڵی ئـەو (ظـنّ)ە، بعـضیٚ لەبـەر ئـەو ئايەتـە تمنّـای ئـەكرد، ئـەم سـوەرەتەی نـە خوێندبايەوە، تا بەو نوعە مەعنايان بۆ لێداينـەوە، خـاطر جمـع بـوون، نـائيلی فرجی بعد الشدّة بوون. ئەوانەی (جـوازی كـذب) نـەدەن، يـا (قَـول بـە جـوازی خُلفـی في الوعيـد) ئەكـەن،ڕەنگـە لێـرە چ إشـكاليان نـەبیٚ. ئـيتر گـەر ئـارەزوو ئەكەی تەماشای تفسيری (إبـن جريـر) و (سـيّدی آلووسـی) كـە بـۆ (قرائـات) و (تأويلات)، ﴿لَقَدْ كَانَ فِـي قَصَـصِهِمْ﴾ إختيـاری (إبـن جريـر) و (إمـام) قـصّەی (يوسف) و برايانی أصلی قصە ئيوانە، حـديثی جمـع و مفـرد سـهلە، قصـصی رُسُل (إمام) ئەفەرمویٚ: (وَ من الناس) يەعنی ناوی ئەو قائلـە نايـەنیٚ، صـنيعی (أبـو الـسعود) و (الوسـی) صـحيحە لـە إختيـاری ئـەو قـسەيە. قصـصی هەردوولايان، قصەی رُسُل لە سورەی سابقە، مُفَصلاً ذكـر كـراوە، لێـرە مُجمـلاً إشارەی بۆ كرا. قصەی (يوسف و إخوتی) قـسەی لـیٚ نـەكراوە، لـە پێـشەوە، قسە لەوانە لەم سورەتە مفصلا خوێندرايەوە. ئەمە مُختـاری (حقـير)ە، دوايـی ديم مختاری (إبن عطيـە)يـە ﴿عِبْـرَةٌ لِـأُوْلِي الأَلْبَـابِ﴾ صـاحبی عقـڵ و هـۆش و گۆش لە گوێدێران روايەت لە (مجاهد) عبرەتـە بـۆ (يوسـف) و برايـانی. أصـڵی واقعە ئەگەر ببێتـە عبرەت بۆ صاحبی واقعە، طبعا نقلـی ئەبێتـە بـۆ غـەير. لـە قصەی رُسُل ويوسف و برايانی عبرەت بۆ ئولول ئەلبابانە، لە رُسُل و أتباعيـان ئەوی عبرەت ناك نابیٚ، بیٚ (لُـبّ)ە (أجـوَف)ە كلـۆرە بۆشـە، آن زيـادە مقـصد خۆگرتنـە، مـأيوس نەبوونـە، ڕیٚ نيـشاندانی سياسـەت و إدارەيـە (خاصـّةً) لـە أيّامی شدّەت، حاصڵی ئەوی لُبّی هەبی ئەتوانیٚ بە گوێرەی حاڵ خۆی عبرەتی وەرگریٚ ﴿مَا كَانَ﴾ ما جری، ئی رُسُل، ئی يوسـف و إخـوە، ئـی هـەردوولايان، ياخود قورآن كە شاملی (كُلّ)ە ﴿حَدِيثًا يُفْتَرَى﴾ هەڵبەسـتریٚ ﴿وَلَـكِنْ تَـصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ لە بقيـەی كُتـب ئـەوی حـقّ و موافقـە إعتبـاری پـیٚ ئـەكات وە ئەڵیٚ:"راستە" ئەوەی زێدەو نقض و خرافاتە فڕێی ئەدا، أمّا نازانم گـەلیٚ نُقّـال

بێ تأمّل لە صنیعی إلاهی لە تفسیر گر یان ئەکەنەوە، حال لایخلو، یا وایە، یا وانیە، ئەگەر وانیە، نقلی خطایە، ئەگەر وایە، خۆڕایی نیە فرێ درایە. (ألبتّ)، ئایەتێ حکمەتێ روحێکی هەبایە بۆ رسولی خۆی ئەنارد، دقەت کەن دوای (یوسف) تا (موسی) باسی (بنی اسرائیل) لە قورآن دانیە، ئەگەر پیاوێکیان بوویا، ماجرایکی بە قدری بەسەرا هاتبا، بالمناسبە قورآن ذکری ئەکرد. ﴿وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ﴾ ئی بێتە بەر بەیان لُزوم بکا، أمّا إستغراقی حقیقی هەرچەند گەلی لە (ملیّون) دەربارەی کتێبی خۆیان، ئەو إدّعایە ئەکەن، لکن (حقیقةً) دەعوایەکە خۆی نیە، خصوص تفسیر کووا؟ حتّی گەلێك أحکامی شرعیّە لە حدیث وەردەگیرێ بەَ قیاس إثبات ئەکرێ ﴿وَهُدًى﴾ یەعنی ئەوەندە دەلالەت واضحە رێ نیشاندانی ئاشکرایە بوویتە هدایەت، بۆ کەسێ بە گوێرەی دەلالەتی وی حرکات بکا، (موصل)ە. ﴿وَرَحْمَةً﴾ بۆ خێرو سعادەتی دارَینْ، کافلە ﴿لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ إیمانی عملی ئەوی بە راستیی إیمانی بە قورآن بێ قەلب و قالبی پاك ئەبێ، أعمالی چاك ئەبێ، بێ شك نائلی رەحمەتی خودا ئەبێ.

(تفسیری سورەی یوسفمان لە الحمد تەواوکرد، ئەوجا سورەی (رعد)ە بەخۆو، هەور و، سێلی جۆشان و، خرۆشاتی سعەتی جنانی، پاشی سورەی (یوسف) وەك ئەو سالّەیە، پاش سەری قحط و غلاء، کە (فیە یُغاثُ النّاسُ وَفیە یَعْصُرون) تەماشای باغی ترێ کە آیاتی (٤٣)ی یە یا(٤٧)ە، هەمووی (مکیّ)یە یا (مدنی)یە یا (مختلطە) فەرقی نیە، إتصالێکی غایەت بە قوەتی هەیە.

# سورەتى (رعد)

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾

﴿المر﴾ گوێتان لێ بێ ئەى أولوالالباب ئەى ئەهلى إيمان ئەى أصحابى نظرو إعتبار ﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ﴾ ئاياتى كتابى مُكوَّن و مُنزَّل ئەو ئاياتى سمائى و أرزى عُلوىّ وسُفلى كە ئەو بێ بصيرەتانە بە سەريا تێ ئەپەڕن بە چاوى فكرو ديدەيى قلب ناى نۆڕنێ، تەماشاكەن چەند ظاهرن، چەند باهرن ئاياتى حەق، واضح و بێ ڕەيب و، شوبهە ﴿وَالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ لە حُكم و أحكام و عِبَر و مواعِظ و إرشاد ﴿مِن رَّبِّكَ﴾ رەبّێ كەريم دەرحەق بە عبادى بە إفضال و بە إحسان ﴿الْحَقُّ﴾ موافقە مطابقى نفس الامرە قصصى بێ درۆيە، بۆ هدايەت بە إعتبارە ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ﴾ هەرچەند تۆ لەسەر هدايەت دانيان بە حرصى ﴿لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ كِبرُو جهل و مەيلى سوء لێ ناگەڕێ، بە أتباعى شهوات و هواى نفس كۆر و كەڕ بووين، نابينن، نابيەن– ئاياتى عُلويە– ﴿اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ﴾ مِمكنە مرادى كواكب بن، ئەوانيش وەكى عەردى ئێوە معادِن، ثقيلن، لە جهەتى بسيطى إعتبار بە قەولى حكمايانى سلف مەكە، ئەو أجرامى عِظام الثقالە چۆن بڵند بووين، لەو جێگايانە وێستاوون، بە چ لايەكدا ناكەون؟ ﴿بِغَيْرِ عَمَدٍ﴾ كۆڵەگە، ﴿تَرَوْنَهَا﴾ بێ كۆڵەگەيێ كە ببينن، بەچاو دەركى كەن، ياخود ئەوا ئەبينن ئاسمان وێستايە، چ كۆڵەگەى هەيە؟ نەفسى ئاسمان ئەگەر نەشديترى بە إعتبارى كواكبى مركوزە ئەزاندرێ، ئەوەش داخلى رۆيەتە. ديارە ئەو كۆڵەگەيە قوەتێ إلاهى يە، قوەى تجاذبُ تدافعە

﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ بێ خوف و خشیەتی لە شُرکاء. لەسەر ئەو ڕەنگە، أریکەی حکمداری (وحده لا شریك له) قرارگر بوو، و إلاّ ئەبایە کەسی نظامی لێ تێك دابایە ﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ﴾ ئایەت لە شمس و قمر بۆ عارف و عامی ئاشکرا تر هەیە. ئەوانە بارێ بە نظرێ إعتباری تەماشەکەن چن؟ چۆن تسخیرکراون؟ بەو نوعە دێن و دەچن. شعاعی شمس لە ئەرزا، و کذا نوری قمر چ أثرێکیان لەسەر عەمدی هەیە؟ (لات) و (عُزی) و سائری إلاهیان، نَظر بە شمس و قمر چن؟ باقی دقائقی صُنع و إیجادو قَدرو هەیئەتی کُرات، با بۆ عُلمای فلك بێ. قمر شایانی عبادەتی نیە، وەکی خاکی خۆمانە، رۆژ هەرچەند نَیِّری أعظمە لە عالەمی خۆی، أمّا نظر بە شموسی تر وەك علمای جدید ئەیلێن، (سُها)یە، نوری کەمە. ئەو شموس و أقمار و سیّاراتە چەندن؟ خوا ئەیزانێ. چۆن تکوینیان بووە؟ کوو دامەزراین؟ هەرچەند مەلایانی طبیعەت و فلك قسەیان لێ کردیە، أمّا کەس بە قطعی ڕێی بە حقیقەت نەبردیە. ئاخری مُجبوراً هەر ئەبێ بلێن (بە إیجاد و دامەزراندنی خوایە) أمّا مجالی نظر ناگرین، زێرا إکتشافاتێ زۆری تێدایە، سدّی، بۆ بَشَر زۆر زەرەرە، ﴿كُلٌّ يَجْرِي لأَجَلٍ مُسَمًّى﴾ کُلّێ لە شمس و قمر، وکذا سائر الاجرامی عُلویّە. لاکن ئەوان تەماشای شمس و قمر یان نەدەکرد، فضل لە (عُطارد) و (زهرە) و سائری سیّاراتی مشهورە. چ سیّاراتی بەچاو نەدیتری، وەك (ئۆرانوس) و (نەپتۆن) ئەوانیش جَریان دەکەن، لە مُدّەیە معلوم. أمّا لای خوا و بەس تحدید ناکرێ بەکەس، وە (خیام) ئەلّێ:

(اغاز دوان گشتن این زرین طاس وانجام خرابی چنین بین اساس)
(دانسته نمیشود به معیار عقول سنجیده نمیشود به مقیاس)

قیاسی حەق وایە، دەم تێدانی هوذایە، سەد هەزاری وەك (إسماعیلی حضرمی) بە شمس بلّێ إشارەکا ڕاوەستا، ڕاناوەستێ، مەرحەباشی لێ ناکا، حتّی نازانی هەیە یا نی یە!

حكمای قديم و جديد مُتّفِقن قوای جسمانی متنـاهی‌یـە، ڕۆژ هەرچەند دەوام كا، ڕۆژێ دێ قوەتی نـامێنێ، ئەكوژێتـەوە، منظومـەی تێك ئەچێ. حتّی تـا (رادیۆم) كشف نەكرابوو، گەلێ لە علمای طبیعەت خوفیان بوو، لەو نێزێكە ڕۆژ بكوژێتەوە، دنیا تێك بچێ، لاكن بە (رادیۆم) قوەتیان زیاد بوو، منظومـە دەهـا دەوام ئەكا. أمّا دوامی قوای جسمانی بە إمداد لـە مبـدأێ قـوی حُكمـاش ئـەی سەلمێنن ﴿يُدَبِّرُ الأمْرَ﴾ پاش خەلق وإيجادی أصـول و وضـعی قواعـدی تكـوّنی متطورات، تدبیر و تصرّفە، إدارە كردنە، هەروەك تـەنها رفعـی سمـاواتی كـرد، تەنهاش بێ شریك إدارەی عالەم ئەكا. وامەزانن كواكب مُدَبِّرن، ئـەونیش وەكـی ئێمە مُدَبَّر ومُسَخَّرن بەڵكو وەكی (خیّام) ئەڵێ: (آنانكی مدُبرند سرگەردانەند).

﴿يُفَصِّلُ الآيَاتِ﴾ ئەی بڕێ، ئەی دووروێ، ئەی نێرێ، بـەیانی ئـەكا، إظهـاری ئەكا، لە عالەمی خەفاء، بۆ عالەمی شـهود وظهـور. هـەر ئایـەتی ئـەیلێی، هـەر تفسیری ئارەزووتە وایە، تخصیص بێ لزومە، ئەو تفسیرو بیانە بـوو، بـۆ ئێـوە ﴿لَعَلَّكُمْ بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ﴾ وَحْدَه لا شـریك لَـهُ، بـێ إعتمـاد لەسـەر شـفعاء، لـە ڕۆژی جزاء ﴿تُوقِنُونَ﴾ چ عذرتان نەمێنێ، بلێین (تێی فكریین) ئەگـەر بـە تفسـیری عقلّی نایزانن، بـە تفسـیری قـولی بیـزانن. مبـدأ ومرجـع خوایـە، لـە (خَلـق) لـە (تدبیر) لە (جزاء) بێ شریكە (ئایاتی سُفلیة) ﴿وَهُـوَ الـذِي مَـدَّ الأرْضَ﴾ پـان و بەرینی كردیە، بۆ ئێمەی ڕاخستیە، ئەگەر (كُره)ش بێ ئەو (مَدّە) ڕاستە، زێـرا (كُره)ی حقیقـی نیـە، كرویـەتی حِسّی وەك تـرنج، مـثلاً إنكـار نـاكرێ. بەشـەر دەوری أرضـی داوە، لـەم لاو لـەولا گەیـشتینە بـن قُطـب، ئـەو دەوری ئـەوی نەداوە، ئەوە زاندراوە، لەو حینە كە قطعەی (أمریكا) كشف كـراوە، لـە أصـلی تكوّنی أرض وگەورەبوونی تـا دەوری ظهـوری حیـات، وە طبقـاتی بـە تخمـین، عومر مُدّەی ظهوری بشری تا ئێستا قسەیان لێ كردیە، گەرچی هەمووی قطعی نیە، أمّا قسەكان معقولن، قـسەی (ملّیـون) ان، لـە تكـوّنی أرض ومَـدّی، أرض مجتمع بووە. لە (مَكّە)ی لە ژێـر (بیـت) مـدّی كردیـە، (إسمـاعیلّیون) وائـەڵێن،

(إسرائیلیّون) ئەڵێن: لە بن (بیت المقدّس) إحتمالی هەیە، سائری أدیانی تریش بڵێن "لە ژێر ئەو جێیەی کەلایان مقدّسە، گرد بووە و مد بووە" درۆیە إفترایە.
لاشك ئەمە توجیهە بۆ توجیهی عَوام. دەخیلەکەم مُعاشِرُ المسلمین داخل بە خەلقی عالەم و مساحەی أرض وطبقاتی گوێ مەدەنە (كَعْبُ الأحبار) وە إعتباریش بە کشفی أولیایان مەکەن، بەڵێ أرض سمسمەیان کشف کردیە، أمّا ئاگایان لە (أمریکا) نەبووە. ئەمڕۆ علمی هەیئەتی جدید، لەناو بَشَر تعمّمی کردیە، أکثر ئەیزانن تفصیلات بێ لزومە. (سـیَدي آلوسـي)دادی داوە، بەگوێرەی زەمانی خۆی قسەی نەستەقانەی فەرمووە. حەز ئەکەم حکایەتی لەو زەمانی کە (علی حیدر) والی (موصل) بووە، عرضتان بکەم (غروب پاشا قوماندانی جەبهەی رەواندوز لە حربی عظمی تشریفی هاتە کۆیە، من رأساً نەچوومە لای، تا خۆی طلبی کرد چووم، تۆ خۆش و من خۆش، سؤالی کرد،(أصولی تدریستان چۆنە؟ وە چ علمێکی ئەخوینن؟) ووتم: أصولمان إنفرادە فقێ چۆك دائەدا کتێب دادەنێ، بە محاکمە دەرس ئەخوینێ، بە حلقە نیە" ووتی: ئەمە زۆر باشە، بۆ إفادە و إستفادە أنفعە" گەلێ علوم ئەخوێنن (صرف) دووەم (نحو) سێیەم (منطق) چارەم (بلاغە) پێنجەم (عقائد) بعدە (قوزموغرافیا) یەعنی علمی هەیئەت" وتی: "کێ هە علمی هەیئەت؟" وتم: "علمی هەیئەت یەك علمە، دوو علم نیە" ووتی: "جانم دووە، یەکی إسلامی، یەکی یۆنانی، "وتم: "نەخێر، حاشا وانیە" وتی: "عرایزم، مەلای ائمە وادەڵێن، ئەو أرضە لەسەر شانی ملائکەتێکە، ملائیکەتەکە، لەسەر بەردێکە، بەردەکە لەسەر گاجووتێکە، گاجووت لەسەر ماسی یە "وتم: " حاشا.. حاشا ئەوە قسەی (رسول الله) نیە، لە طرف (كَعْب الأحبار) و (وهب) وسائری علمای إسرائیلی، ئەو مزخرەفاتە، لەناو عالەمی إسلامی پەیابووە، بە حورمەت بوون، قسەیان معتبر بوو، دوایێ کلامی وان شکلی حدیثی نَبوی وەرگرت، نەختێ بَیانی أقسامی حدیثم بۆ کرد، ووتی: بەشاهد بن، رووی کردە قائم مقامی مرحوم (احمد حلمی) ئەمن ألآن لەسەر دەستی فلان مسلمان بووم، وَالله تا

حالێ قلباً مسلّمان نەبوو بووم، ئەم ووت: "ئەو قسانە بێ أصلّن دیارە (محمد) چی نەزانیە" دوایێ ووتی: "لە حەق قصص الأنبیاء دەڵێی چی؟ "وتم: كتێبێكە سەراپا خرافاتە" ووتی: "الله راضی أولسن محمد افندی، من لە حدودی أیرانی یەعنی (سەردەشت) "قصص الأنبیاء"ناو كتێبێكم دەست كەوت، تەماشام كرد تحیّر مام، آن زیادە لە حكایەتی (سلیمان)، نظرمی جلب ئەكرد: (سلیمان هەزار ژنی هەبووە، هەموو شەوێ لەگەڵ ئەو هەزار ژنەی جماعی كردیە، عجایب ئەمە كوو ئەبێ؟ ئەو عملیاتە علی الأقل (٥) دەقیقەی پێ دەوێ، مُدّە ئەكا (٥٠٠٠) دەقیقە، شەو و رۆژ هەندە نابێ، كەوابێ وام تصویری "سُلیمان"ی ئەكرد، الەتی بە دەست گرتیە، لەو كونی دەنێ دەی هینیتەدەر، لەو كونی دەنێ دەی هینیتەدەر، (سوخر چقرر، سوخر چقرر) " ووتم: "ئەوە درۆیە إفترایە، آیا ئەو إختلاقە تۆ دەی كەی؟ "ووتی: "چۆن؟ "ووتم: تۆ ألآن، لە جەبهەیەكی گچكە قوماندانی، خەیاڵی چشتی وات دێتە دلّ؟ ووتی حاشا..حاشا، مستغرقی خیالآتی حریم، نازانم عاقبەتمان چی دەبێ، لە تهلكە داین" ووتم: "سلیمان لای ئێمە، هەم (رسول)ە، هەم پادشاە بووە، قوّەی تشریعی، قوّەی اجرائی عائدی ئەو بووە. لایە منتظری وحی، لایە نگاهداری مُلك، لایە إجرای أحكام، (خاصّةً) لە أبتداو أوائلی تشكیلی سلطنتی إسرائیلی بووە، دوژمنی زۆر بووە، (سلیمان) ئاگای لەو نوعە عملیاتانەیە؟ زۆر دوورە، درۆیە ئاشكرایە "ووتی: بەڵێ ئەگەر منیش قوەی ئەو نوعە محاكمەم هەبایە، ئەبوومە (ملا محمد افندی)، ئەگەر سفینەیی دەوڵەت بگاتە ساحەیێ سلامەت، ئەمن ئیشم بەتوو زۆرە، مع الأسف (دەوڵەتی عثمانی) ئێك چوو، ئەوجا بزانین، بێ إعتقادی طبقەی راقیە، باعثی مەلای نەزان وجلفە، هەتا كوێ ئەڕوا؟!

حكمای قدیم قسەیان لە طبقاتی أرض كردیە مُجملاً، وەلای بعض بێ هوودەیە، (علم) و (جهل)ی سیّانە، بەڵێ، لێ كوّڵینەوەی أرض وطبقاتی وە فائدەی عملی، بۆ باحثەكانی جدیدە، لێرە طول وتفصیلی مُوجبی مەلالە،

وەزۆر لە تفسیر ناوەشێتەوە ﴿وَجَعَلَ فِيهَا﴾ لەناو لەسەر ئەرزی ﴿رَوَاسِيَ﴾ چیای ثابت، ئەم چیایانە چۆن تکوّنیان کردیە؟ حُکمای طبیعی نویّ قسەیان نزیك ترە لە حکمای کۆن، ئەوەی قسە لە کیفیّەتی تکوّنی أشیاء ئەکا، مُعتَرِفة بە خَلق وأیجادی خوا، أمّا ئەخوازیّ کیفیّەت کردنی بزانیّ، بەڵکو بە تبعیّەتی صانعی حقیقی ئەویش شتیّ دروست بکا. ئێمە أولاً تەماشای کائنات ئەکەین، کە صانعی بۆ بدۆزینەوە، پاش ئەو معرفەتە، لە چلۆنی خلقی ئەفکرین، وەئەوی دەسەلأتمان پیّی بشکیّ ئەی کەین، ذاتاً علمی بیّ عَمل چەندان هەبیّ، کەڵك ناگریّ. رُسُلی عظام لە أوّلەوە قسە لەگەڵ مُشرك ومُنكر وبیّ عقلّ و شعورەکان ئەکەن، بە ئایاتی ظاهرە جَلبی نَظَریان ئەفەرموون، ئەوەندە کافیە تیّ یان بگەیەنن ئەوە بە خلقی خوایە پاشان وەقتی تحقیق وتدقیقی مباحث دیّ. (سیّدی ئالوسی) لەسەر مَذاقی حُکَمای قدیم بە نَقض و إبرام زۆری قسە کردیە، نظریەی قدماء زۆری باشە، گەلێکی لە نظر مُجَدِّدان موافق نیە. لێرە باسی فائدەی خەلقی چیا چیە، زۆر مُلائم نیە، مَقامیّ مُناسب وأنسبی هەیە دیّ. ئەوەندە ئەڵێم ئێمە ناشُکری نەبی لە مخلوقاتی إلاهی ﷻ إستفادەمان نەکرد، حتّی بعضە کتێبیّ حکمتی طبیعی ئەخوێنین، لە نظریّات بەولاوە، ئەویش ئەگەر قیل قیل لێی گەڕیّ، نَفعی لیّ نابینین، لە ترسی کافر بوون، ئەوانی لە طبیعەت نازانن علومی طبیعیەیان حرام کردبوو. حتّی لە أوائلی تحصیلّم زۆر تَنفیریان ئەکردین لە علمی هەیئەت وطبیعەت، لە بعضە أشعاری کوردی خۆم ووتیتم:

مەلای نادان بە عنوانی شریعەت    حرامی کرد لە تۆ علمی طبیعەت
لەبۆیە هەرچی لەو عەردە بەدەرکەوت    لەزێڕو زیو و پۆلأو وپاقڵ و نەوت
بە کوڵی کەوتە ژێر دەستی فەرەنگان    چیاو چۆلأن دەتۆڕن وەك پڵنگان
بیان تۆڕیّ چیایان چۆن ئەکۆڵن    هەتاکەی ئێوە هەر بەرماڵ بە کۆڵن؟

بەڵیّ واهات، وارۆیی، وادەڕوا، نوری علم دونیای روناك کرد، أمّا دڵ دڵی

(ملیۆنان) لە ظُلمات وخرافات وإعتقاداتی باطلەدا ماوە، بە (رۆنتکین)یش رووناك نابێ ﴿وَأَنْهَارًا﴾ جۆر جۆر جۆبارو زێ کە أصلی منبعیان دامێنی چیایانە، ئایا ئەو جبال وأنهارە، (لات) و (عُزّی) و (منات) دروستیان کردینە؟ یا بە أمری (وُدّ) و (سُواع)، (یَهوث)، (یَعوق)،(عیسی)و (بوذی) پەیابووین؟ لە وەقتی نُزول قسە لە (علی) و (شێخە)کان نەبووە. ئەوانە إلاهی إسلامن. چاوەرە، بکەوەناو بحری قسەیان، دائر بە (نیل) و (فرات) و (دجلە) و (سیحون) و (جیحون). ئەگەر مُراد (دەجلە)ی (بغدا) بێ، چاکە، (زابی کبیر) و (زابی صغیر)ی ئێمە بەبەرئەکەوێ، (نَعوذُ باللە) سەروچاوەی ئەو أنهاراتە معلومن، عرضم کردن، دائر بە کیفیّەتی خلق و أیجاد، إعتبار بە قسەی نقّالان مەکەن، لە أزمانی سابقە بَشَر ئەوەندە معلوماتی بە أحوالی أرض نەبووە. ئەمرۆ کورەی ئەرزی لە دەست بچاشان وەکی پرتقالێکە، هەلّی ئەداو ئەیگرێتەوە، رسالەت پەناە، سیّد الکونین، صاحبی کوثر وسلسبیل، قسەی خلاف حەق ناکا، قاعدەیێ أصولیە هەرچی بەدەرکەوت کە درۆیە، بێ أصلە، حدیثی رسول اللە (ﷺ)نیە. سیّدی ئالوسی ئەوی ظاهر البُطلان بێ، إنکاری ئەکا، بعضاً تابع الناس ئەروا خصوص کە (بُخاری) یا (مُسلم) حدیثێ نقل بکا، لێی لانادا. من بروابیم هەیە، بە (بُخاری) و (مُسلم) أمّا لە أحکامی شرعیە، لە أحکامی (کون) و (أیجاد) مُتوقّفم، علی الأقل ئەبی (تأویل) بکرێ، بۆ خاطری ناقلان، (ئالووسی) لەو مَقامە، بَحری علمی هاتیتە تلاطم، بە هەموو أطرافی شەپۆلان داوێ، چی بکەم (سیّد رشید)، نُقّادی أحادیث، مەلوانی بحاری تحقیقات، رەحمەتیان لێ بێ ﴿وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ﴾ بە إعتباری داری گولێ، هەرچی (ثمره)ی هەبێ، ﴿جَعَلَ فِيهَا﴾ لە أرض ﴿زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ﴾ دوو، نێر و مێ، لە أصلّی تکوین، وەك أنسان وسائری حیوان، میوەش محصولی دووانە، نێر و مێ، وەك (آدم) و (حوّا)ی ئێمە، لە زەمانی تکاثریش دا باس بە طریقی زواج ثمرات حاصلّ ئەبێ. یعنی دووەتی بە إعتباری نێر و مێ یەتیە، وە لَو ملیارو ترلیون زیادبن. أمّا جووتی بە إعتباری لَون: سپی و رەش، بەتام: ترش

وشێرن، قَدَر: گچکە وگەورە، کیفیّەت: سارد و گەرم، نظر بە عَوام باشە. أمّا نظر بە تحقیقاتی علمیە چاك نیە. فی الحقیقەت ئەو کشفی قورئانە بۆ قاعدەی زواج مُحیِّرە. مُنصِفانی مستشرقین إعتراف بە وحی (محمّد)(ﷺ)ئەکەن. ئایەتی صریح لەو معنایە، ئایەتی سورەی (یاسین)ە پاش (هەزارو سیصەد) و ئەوەندە ساڵە، لە طرف بحّاثانەوە کشف وإظهار کرا. تأثیری نور وحرارەتی رۆژ، بۆ پێگەیاندنی ثمرات دیارە، (کالشمس فی رابعة النهار) أمّا إدامەی مُلاقاتی أشعەی بۆ ثمرە ضرورە ئەی سووتێنی، بۆیە ئەفەرموێ ﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ﴾ بەشەو إنقطاعی شعاع حرارەتی شمس لێ ئەبێ وەلە نوری قمریش إستفادە ئەکات، دنیا فێنك ئەبێ، حرارەتی رۆژ لەناو ثمرات نامێنی تاسبەی باز رۆژ هەڵدێ و ئاوا ئەبێ، مشهورە (اللیّل حُبْلی) دیسان لەگەڵ (ثمرە)ی جوانە ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ﴾ لەو جعل وجَریان و(غشیان)ە ﴿لآيَاتٍ﴾ نەدە، نەسەد، هەزارەها ﴿لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ أمّا إنسانی بێ فکر چی لێ نازانێ، وەکی حەیوان بەسەر ئەرزی دا دەڕوا، ئاگای لە ئایەت وحکمەتی خەلق وإیجاد وتحوّلات وتطوّرات نیە، (یَزیدُكَ وجهُهُ إذا ما زدتە نظراً) واقعاً تاتێ فکرێ، ئایات زێتر، زۆرتر، ظاهر ئەبێ. ئەتوانم جزم کەم ئەگەر بَشَر زۆر بە باشی علمی طبیعی زانیبا، علمی بە أسبابی قریبەی کائناتی جوّ وأرض ومتصوّرات بوویا، شرك نەدەبوو، إنسان ئەبووە دوو قسم: موحّدی حقیقی وە جاحد. واتێ بگەم إقناعی جاحدەکان سهل ترە، لە إقناعی موەحدەکانی مُشرِك، وە ئەو ئایەتە لە ثمرات وەرئەگیرێ، ئەوجا وەرە تفکّر لە منبع ومنشأیان بکە ﴿وَفِي الأَرْضِ قِطَعٌ﴾ پارچە پارچە عەرد هەیە ﴿مُتَجَاوِرَاتٌ﴾ حسّاً وطبعاً لێك نیزکن، جیرانن ﴿وَجَنَّاتٌ﴾ باغات ﴿مِنْ أَعْنَابٍ﴾ ترێ بە أنواعها، لەو قطعانە چاندراون ﴿وَزَرْعٌ﴾ لە حَبّ و دانە، وغەیری دانە، لە جنّات وغەیری جنّات، ترێ لە دانە چاك نابێ، ئەبێتە چومیلکە، أمّا قەیسی و،خۆخ و، هەڵووچەکەو، باوی، بەدانەش چاك ئەبێ وە بەنەمامیش چاك ئەبێ ﴿وَنَخِيلٌ﴾ ئەویش ئەنواعی هەیە، ئەودارخورمایانە ﴿صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ﴾ کەڵ هاویشتنی داری ترێ و،

توو،و مشمش و، هەرمێ و،وە هکذا، أصڵی داری کەڵی زۆر زۆرە، أمّا لە خورما کەمە، لام وایە ئەگەر لە قەدەوە فصیلە دەرکا ئەی بڕن وە ئەی چینن، أمّا کەڵی داری دی، بە أکثریەت شین نابن، ئەبێ نەمامیان بەڕەگەوە بێ، لە أصڵی لغەت (صنو) بە معنا مثلە ﴿يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ﴾ یەك ئاو، ئاوی کانی، ئاوی نهر، ئاوی باران، دێم وبەراو ﴿وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ﴾ حتّی لەیەك نوع بەڵکوو لە یەك دار، لەیەك ووش ﴿فِي الْأُكُلِ﴾ لە ثمرە خۆشترە، لطیف ترە، گەورە ترە، ئاودار ترە، ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ﴾ لە ما (ذُکِرْ) ﴿لَآيَاتٍ﴾ زۆرو دەقیق (سعدی) ئەڵێ:

(بەرگی درەختان سەبز دەر نظری هوشیار
هەر ورقی دفتریست صنعتی پەروەردگار)

﴿لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ لە پێشەوە فەرمووی (بۆ ئەوانەی تێ فکرن) لام وایە ئایەتی ئەوێ، تفکر وتأمّل وإستعمالی عقڵی زێتر ئەوێ، ئەوەی دوایێ هەمووی (تحت الحِسّ)ە.

لە (إمامی ڕازی) تا (سیّدی ئالوسی) مفسرّەکان متبّحرەکان خصام وجدالیان لەگەڵ حُکمای حکمتی طبیعیـیە، ڤ الحقیقەت ئەوی شایانی خطاب بێ، ئەوانن، أمّا خصمێ قەوین پەنجەبازی لەگەڵیان سهل نیە، ئەوان دائماً خەریکن، دەلیلیان تجرەبەیە، ئەوەی إدّعای ئەکەن، بۆ خصم ئەیهێنینە عیان وظهور، هی ئێمە ئایات وأحادیثە، ئەویش ئاوا زاندرا، ناشکری نەبێ، ئەوەی ئەورۆ ئەبێتە رسول و نەبی لە حکمی علمی وسیاسی تابعە، خۆیان وقومیان وعقڵیان، تابعی حکومات وحاکمیانن، حتّی (بهائی) إیرانی إنکاری حشری أجسامی، تصدیقی (داروین) ئەکا، لە قاعدەی نشأو، إرتقاو، إنتخابی طبیعی، مع أنە (داروین) إعتراف بە نبوەت ناکا نازانم کێهەیان بووینە (رسول)؟ ذاتاً ئەوا رسالەتیش ئەکەن بە ملعەبەی سیاسیّون. (إمام فخر الدین رازی) ئەوەیە مَسلکی أشعری إختیار نەکردیە، ڤ الحقیقەت خۆی حکیمە، لە طبقەی عُلیا حسابە کأنّە علمی بَحری محیطە، هەرگیز حُکمای نەکردە خَصم. طبیعیّونی

پێشی نـازانم، أمّـا طبیعیّـونی ئـەمڕۆ تەماشـای أعمـالی طبیعـەت ئەکـەن، تـا إستفادەی لێ بکـەن، قـوای طبیعیـە ئەخەنـە ژێر دەسـت، بۆیـە نیـە بـە خـواو مُعْینی لە خوای بزانن. تەماشای سـعیان کـە، لـە إصـلاحی حیوانـات، نباتـات، ثمـرات، بنـۆڕە سـێوی أمریکـا، ألآن ڕۆژی چوارشـەموو (٢٠/ذی الحجـة) (٢٧ کانونی ثانی ڕۆمی) دوودانەم لایە، مانگێ زیاترە لە ناو پەنجەرەم دانایە، بۆنی دێ وەك عەترو عەبیر، هیچ قەیدی نەکردیە، تعجّب لە گەورەیی، لە ڕەنگی، لـە ساغلّەمی، لە بێ عەیبی ئەکرێ، هـەمووی نتیجـەی علـم وسـعیانە. دقـەت کـە، مثلاً لە موتوربە، لە باغێ بە علم وعقلێ بەخێو کرێ چـەند فـەرقی هەیـە؟ حتّـی ئەو دار مێوەی ڕەزبڕی چاك بیـبڕێ میـوەی زۆر باشـترە، لـەوڕەزەی ڕەزبـڕی ناتەواو تلقیحی کا، کەسیش إنکاری خوا ناکا، لاشك حکمای طبیعـەت تـادێ لـە دقایق وأسراری طبیعەت آگادار تر ئەبن، وەإختراعاتی چاترو عجایب تـر ئەکـەن ئەوانە بکەین بە خـصمی قـورآن تـێ ئەشـکێن، وەکـی حمّـالی تـورات ذاتـاً تـێ شکاین، تێ چووین، بەڵێ ئێمە ئەڵێین (ئـەو عالەمـەی ئـەی بینیـی، (معمـل)ە، (کارخانە)یە، (فابریقە)یە، طبیعەت قوای مُـسخّرن، مُـستَخدَمْن، مُرَتّـب ومَـدبّری (فابریقە) خوایە، (وَحْدَه لا شَرِيكَ لَهُ)، نە (جن)، نە (ملك) نە (إنس) نە (علـی و وەلی) مداخلەیان نیە.

إنسانی متفکر وعاقلێ، إستفادە لە صنعی صنایعی خۆی ئەکا، ئـەو حَـشرات بۆ أشجار وثمرات خراپ بێ، ئـەی فـەوتێنێ، داری نەخۆشـت بـۆ تـداوی ئـەکا، ئەوا شباط نێزیکە مێوی سەرداران مثلاً لە کۆنە کەلآن پاکژ ئەکاتەوە، تـا نـوێ یە کەلآن دەرکا بەری زۆر باش بێ، خـوداش هـەر خوایـە. نـازانم بـۆ تەماشـای حدیثی (لِقاح)ی (نَخـل) ناکـەن، دەرسـێ زۆر باشـە بـۆ ئێمـە، مَهبطـی قـورآن، صـاحبی وەحـی، ئەفـەرموێ (أنـتم أعلـمُ بـأمور دنیـاکم)، تـەمامی جـوازاتی (أشعری) با هەر لە جێی خۆی بێ، هەرکەسێ أدنی عقلّی هەبێ فرقی أثری علم وقدرەت ئەکا. کاری مُحکم و،منتظم بەدقـەت، بـێ علمـی تـام وقـدرەتی کامـلێ، نابێ. ئەوی بۆ ئێمە لازم بی، بەکەڵکمان بشێ خوایە، شریعەتە، طبیعـەتـە، بـە

إیمان بە وحدانیەتی خوا، لە أسارەتی مطلق نەجاتمان دەبێ، بە إتباعی شەریعەتی خالص مُطهرە، نظامی حیاتمان چاك ئەبێ، بە إستخدامی طبیعەت، نفعی زۆر لە مخلوقاتی خوا ئەبینین، أسرار دەردەخەین إختراع زۆر دەكەین، بە سیّارە و طیّارە، ئەچین بۆ حەج، بۆ زیارەتی رسولی كبریاء، لە كۆڵ حندحۆی حوشتر ئەبینەوە، حاصڵی بە علم وعمل ترقی ئەكەین. ئەگەر بێ ناموسی ئەروپایی لێمان گەڕێ، بە شەرەف ئەژین، بەشەرف ئەمرین، بە شرف زیندی ئەبینەوە والسلام.

ئەگەر تفصیلی أنواعی طُعوم وعلەتت ئەوێ تەماشای (شرح تجرید) كە تألیفی (قۆشەجی)وە رسائلی جدیدە زۆرن تەماشایان خالّی نیە لە نفع ﴿وَإِنْ تَعْجَبْ﴾ أیّها الرَسول! لەچی؟ لەبێ لُبّی! بێ عقلّی! بێ تَفكّریی! بێ نَظَری! بێ إعتباری ئەو قَومە. ﴿فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ﴾ لەسەر ئەو حماقتە بێ علمیە ﴿أَئِذَا كُنَّا تُرَابًا﴾ مردین، ڕزین، جَسَدمان بووە خۆڵ ﴿أَئِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ سەر لەنوێ إیجاد دەكرێینەوە؟ ئایا ئەوانە لە خَلقی حاضر چی دەزانن، تا إنكاری إیعادە بكەن؟ لە تطوّراتی حالیە ئاگادار بوون، إحاطەیان بە نهایەتی داوە، تا طَوری مُستَقبَل بە مُحال بزانن؟ لە نشأی أوّلی چی تێگەیشتن، تا منعی نشأی آخری بكەن؟ ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ﴾ بلا موجب وسَبَبْ كُفرێ كەرانە. ﴿وَأُوْلَئِكَ الأَغْلاَلُ﴾ طَوقی زنجیر –زنجیری تقلید–. ﴿فِي أَعْنَاقِهِمْ﴾ لە ملیانە. بە تقلیدی آبایان ڕووناكەنە آیات! إستفادە لە أسراری موجودات ناكەن! ﴿وَأُوْلَئِكَ﴾ ئەوانە ﴿أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ﴾ بە عەینی خۆیان چۆن لە دونیا بوون، دروست دەكرێنەوە دە[illegible] ڕێنە ناو ئاگر. ﴿فِيهَا خَالِدُونَ﴾ نایەنە دەر، ملیان لە طَوق، وەطَوقیان لەمل دەرناچێ –ئێستا جێی أهلی كَبائِر نیە!– ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ﴾ تالوكەی دەكەن لە توو ﴿بِالسَّيِّئَةِ﴾ عَذاب. خێرا بیانهێنە سەر. دیارە لەم إسْتعجالە وەك إخوانەكانی ڕابردویان تَكذیب وإسْتهْزایان مقصود بووە. ﴿قَبْلَ الْحَسَنَةِ﴾ أنّە لە صِحّة و دەوام وعافیەتیان پێ خۆشترە، پێش خواستنی حَسَنە، إسْتِعْجالی سیّئە دەكەن. ﴿وَقَدْ خَلَتْ﴾ ڕابورد. ﴿مِنْ

قَبْلِهِمْ﴾ پێش ئەوان ﴿الْمَثُلاَتُ﴾ مَثُلە، عقوبەی (خاصَّةً) وەکو گێو و کەپوو برین. پاداشی سیِّئاتیان وەکو أسلافیان، مَثُلەیانە! زێڕا ئەوەی بەسەر أقوامی سالفەیا هاتبێ بوویتە مَثُلە. لە مێژ نیە لە سورەی (یوسف) ذکر کرا أقوامی رُسُل چیان بەسەر هات، پاش یأس و ظَنِّی خُلُفْ، ئێمە ناکەوینە وَهم وشك نالێین بە صورەتی قطعی ئێوە مَثُلە دەکرێن، زێڕا دەزانین خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ﴾ یا مُحَمَّدی رؤفِ رحیم! ﴿لَذُو مَغْفِرَةٍ﴾ بێ ئەندازە. ﴿لِلنَّاسِ عَلَى ظُلْمِهِمْ﴾ قابلە عفوتان بکا لە عذابی دونیا، وەممکنە یأس وظَنِّی رُسُلی ڕابردوو لەبەر ئەوەبێ! ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقَابِ﴾.

وەك دەڵێ:

أگر چی دیل گیرَد سخت گیرَد

وە زۆر نێزیکیشە مَثُلەتان بکا، ببنە مەیمونە قوتە! ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەو کفرکەرانە. ﴿لَوْلاَ أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ﴾ أعجوبەیێ، خارقەیێ نادِرەیێ ﴿مِنْ رَبِّهِ﴾ لە طَرَف خوای خۆی کە دەڵێ من رەسولی ئەوم. آیاتی علمی لە نَظَر قَوْمی جاهِلْ بە آیَة حساب نیە! بَشَر سەیرە، ئێستاش وایە سَجْدە بۆ بەرد بۆ گاوو شبیهی کەر دەبا، طَلَبی آیَة لە رەسول دەکا! ﴿إِنَّمَا أَنْتَ مُنْذِرٌ﴾ دەیانترسێنی لە سۆی عاقبەت. هێنانی عذاب وآیَةْ بەدەست توو نیە! ﴿وَلِكُلِّ قَوْمٍ﴾ لە أقوامی ڕابردوو ﴿هَادٍ﴾ رەسولێ بووە هِدایەتی داون. بعضێ إیمانیان هێناوە، أکثَریان إیمانیان نەهێناوە! باوجودی ئەو جۆرە آیەتەی ئێوە دەڵێن بۆ معارضەکانی ئەوانمان نەهێناوە! ئێوەش مُعاندن! یاخود توو بۆ هەموو قومێ أُمّی و غَیرە أُمّی تاقیامی قیامەت، هادی!! ئەو کتابە ئەو آیەتە کافیە! فَوْقی کلّی آیەتە! فصل بە (لِکُلِّ قَوْمٍ) لە بەیینی مَعطوف علیە (مُنذِر) و (هادی) لام وایە زەرەری نیە! زێڕا فاصل لە متعلّقاتی (هادی)یە! لە مَعْنادا مؤَخّرە! هادی کُلّی قَوْم دەبێ آیەتی مُستَمِرْ بێ! مُعجزە، خارقە، وەك بروسکە دێو و، دەڕوا دوایێ دەبێتە حِکایەت. بنوارە آیَتی إلاهی هەمووی دائمن بۆ هەمو أقوام شامِلن مُشاهدەی دەکەن! إیمانی بُرهانی، قیاس لە إیمانی خَوارقی ناکرێ!

بەڵکو بە زێدە خَوارِقْ أُمَّةْ زێدە گەوج دەبن، لە تەرەقیاتی فکری مَحروم، وەبێ تأمُّل لە مَقام دەبن! أسلاف قسەیان لە (هادی) مُختَلِفە! نَظَری (شیعە) لە (علی) وأولادیە، باوجودی إقتِداو إهتِدای پێ ناکا! بە حُبّ گەر ڕاستە، گەر درۆ، إکتفا دەکات –ئێمە خوا خوامانە یەك دوو کەس لە گەورە گەورەکان مسلّمان بن، ببن بە هادی!–، (شیعە) ڕووی آیة دەکەنە خَلافَة حدیثێ دێنن مەلا بە گژ یەکدا دەچن – نعوذ بالله من الغَفْلَةِ والمَیْلِ الکاذب–. ئەی ڕەسولی مُجْتَبی تۆ هادی! دەوام بکە لەسەر إرشاد و بیانی آیات! آیەتێ زواجی نَباتات وأشْجاری مُثْمِر وتَفاضُلی ثماری ذکر کرا، ئەوجا بَیانی آیَتی زَواجی حَیْوان وتَکَوّنی فی الأرحام بکە. ﴿اللَّهُ﴾ ئەوەی مَدّ الأرضَ إلی آخره. ﴿یَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ کُلُّ أُنثَی﴾ ممکنە عام بێ، لە نباتات و،أشجارو، حیوان وإنسان. تەماشای خۆتان کەن، لە أولادتان فکرن، چۆن ئەبن، مادە کەوتە ناو ڕەحم چی بەسەری دێ؟ بە أصول و تربیە ئەگاتە دەرەجەی بوون. ئەو دقائقی صنع وإیجادە بەکێ ئەکرێ؟ شمس و، قمرو، نجوم و، أفلاك، کَلاّ مَلَك وجنۆکە حاشا نعوذ بالله. شێخە فەندی خێر خێر خێر. لات و، عزّی ألهة الولادة، ئەی بەبن کلکیان، کەی ئەزانن لە وەقتی حَمل مافی الأرحام و، أرحام چیە؟ ساغە، ناساغە، تەواوە، ناقصە، دوولێوە، سێ لچە، مذکرە، مؤنثە؟ نەختی أمارات هەن، لاکن مفیدی علم نین. بە (ڕۆنتکن) ممکنە، لاکن کشفە وەك ڕەگ لێك کردنەوەو، بوون، قسە لە حاڵی حاضرە، خوای تعالان گشتی ئەزانێ، غەیری ئەو کەس نایزانێ ﴿وَمَا تَغِیضُ الأَرْحَامُ﴾ ئی حەیوان وإنسان، هێلکە دان لە تەیران ڕەحمە ﴿وَمَا تَزْدادُ﴾ (ما) (موصول)ەیە (مصدریە)یە، نقص وزێدەیی عائدی نفسی (رحم)ە لە قوّەتی تصویر وتولید، یا ئی (ما فی الأرحام)ە، تامُ الخلق وناقص زیدە لە مُدّە، کەمتر لە مُعتاد بیگەیێنێتێ، یابەر باوێ، یا ئیك ودوو زێدە، لازم ومتعدّی، هەرچی مُفسّران فەرموویانە، عبارەتی عەرەبی هەڵی دەگرێ. ئەم نقص وزێدەیی یە، هەر خوا ئەیزانی هەر لە خوا بزر نیە. جا ئێوە ئەگەر أربابی نَظَر بن، تێ فکرن ئەزانن إنسان لە چ طوری ئەچێتە چ طوری؟

ئەمە کاری (أساف)و (نائله)یە؟ دووبەش ئەوەیە إنسان لە بعضە تطوراتی لەگەڵ گوجیلە صەی شەلا فەرقی نیە ﴿وَكُلُّ شَيْءٍ﴾ لە أحیاو غەیرە أحیا مادام محدود بێ ﴿عِنْدَهُ بِمِقْدَارٍ﴾ هەریەك بە قەدەری خۆی هەرچەندە چی تێدەکەوێ ئەبێ. مقداری کمّی وکیفی هەمووی بە میزان وتەرازووە، کیفما أتفق نیە مصنوعاتی مُحکم ومُتقن ودقیق ورشیق ومنتظم بەهند و ئەندازە، بێ علم وقدرەت نابێ ئەگەر جنابی حەق قُوای مخصوصە لە محالّی مخصوصە، بە وەجهی مخصوص، دای نەمەزراندبا، قوای عاملە طبیعیەی چی پێ ئەکرا؟ کەس ئەتوانێ بڵێ طبیعەت (غرامەفۆنی) إختراع کردیە؟ مع أنّە أعمالی طبیعیّەی پێ ئەوێ. مەلای مشهور چووە باغێ میوەی خوارد بعضیکي کردە باغەڵی، باغەوان هاتەوە وتی: مەلا بۆ هاتیە ناو باغی من؟ وتی: "با هێنامی" وتی: ئەدی ئەو میوە چی یە لە باغەڵت؟ وتی: نازانم، منیش متحیّرم، کوو کەوتیتە ناو باغەڵم؟ کەسێ خۆی گەوج نەکا، دیارە. إنسان خۆی آیەتێکە لە فوقی هەموو ئایات نازانم خۆی بۆ واسووك وچرووك کرد؟ سجدە بۆ کەر ئەبا سەرامدی علمای طبیعەت بۆ جغارەیی سەد تەمنّا ئەکێشی، علمای إلاهی وطبیعی زۆر نادرە، یالەبەر إلاە إنکاری طبیعەت، یا لەبەر طبیعەت إنکاری خوا ئەکا. حەق وایە کە عرض ئەکەم صانع بێ طبیعەت چی پێ ناکرێ، طبیعەت بێ صانع وجودی نابێ چی لێ دروست ناکرێ, وەغەیری ذاتی أقدسی واجب الوجود هیچ مَوجودی لە قواعدی طبیعەت دەرناچێ، داخلی طبیعیّاتە، ما فوق الطبیعەت، بەس خوایە ئیشی خواش بە قدرەتێکە لە ژێر إدارەی علمێ عملی مُحیط بە وردو درشت، مصنوعاتی کاری خوای نتیجە یە کەیفی نیە ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ قوەت مادّە، عقلّی وحسّی، حسّی داخلی، حسّی خارجی، زۆر و کەم، أصغری کائنات، أعظمی موجوداتی سرّ و علنی عبادی، لێ بزر نابێ ﴿الْكَبِيرُ﴾ گەورەیەکە، بەندەی بەسەر ئەکاتەوە، ضایعی ناکا، چ گەورە؟ گەورەیێ علمی وتَدبیری ونە حِسّی وزەلامی ﴿الْمُتَعَالِ﴾ فَوق الطبیعەتە، هەر ئەوە فوقی خارجی سلسیلە، لە ذات وصفات وأفعال وێنەی نیە. بۆ صانعی

علمی عملی بالضروره‌ته، عملی صانعی بێ علم تجلاً وتمیزی نابێ إیمان به نبوّه‌تی أنبیاء، بێ إیمان له علم به جزئیات ممکن نیه.

علمی کبریائی چونکی ذاتیه، یه‌کی له‌سه‌ر شرائطی علمی مُکتَسَب ناکه‌وێ. نَظَر به علمی ئه‌و ﴿سَوَاءٌ مِنْكُمْ مَنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ﴾ بزری کا به دزی، به سرته، به خلوّه له‌ناو ده‌روونی ﴿وَمَنْ جَهَرَ بِهِ﴾ ئاشکرای کا به‌ده‌ری خا ﴿وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ﴾ به‌شه‌ویش خۆی په‌نهان کا، کأنّهُ بزری ئه‌نده‌ر بزره ﴿وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ﴾ ئه‌وه‌ی بڕوا به ئاشکرا، به‌ڕۆژی ڕوناك خۆی به‌ده‌رخا. ئه‌وه‌ی ده‌رباره‌ی خوا ئه‌یلێن، ئه‌و تدابیری له حه‌قی رسولی مجتبای ئه‌که‌ن له خوا بزر نابێ. جنابی حه‌ق رسولی خۆی حفظ ئه‌کات ﴿لَهُ﴾ بۆ خوای هه‌یه له مملوکی زێر ئه‌مری ﴿مُعَقِّبَاتٌ﴾ کأنّه تعقیبی أشقیا ده‌که‌ن، بۆ إباده‌و مَنعی ضرریان ﴿مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ﴾ ئی رسول ﴿وَمِنْ خَلْفِهِ﴾ ده‌وران ده‌وریان گرتیه ﴿يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ﴾ له‌وه‌ی حفظی لێ بکرێ، وه‌ك (قتل) وأمثالی، نه‌ك (قضای مُبرم) چونکی جێی نیه، که‌وابی حاجه‌ت به قَلبی عباره‌ت ناکا، ألآن حکمای عصر خه‌ریکی طبّی واقین، ئه‌ویان لا باشتره، ئه‌گه‌ر تۆی پێشکه‌و، مێش و، کێچ و،ئه‌سپی و، مشك نه‌مێنی، إنسان له گه‌لێ أمراضی فاتکه حفظ ئه‌بێ. وه‌هه‌روه‌ها دکتۆرو میقرۆبی وَباو طاعون زۆرن، عباد الله له‌و به‌لآیانه‌ش محفوظ ده‌بن. ڕۆژێ له به‌غدا، (فقێ عبدالله) و (طاهر)ی معتمدم بردنه لای (شکری محمد) معاینه‌ی کردن، وتی: زۆر مُصیب بوی، ئه‌مڕۆ ئه‌وانه‌ت هێنا، تا یه‌ك دوو خطوه‌یان مابوو (معاذ الله) تووشی علّه‌تی خراپ بن" ته‌رتیبێکی بۆ دانان، (لَهُ الحمد) تحسّنی حالّیان بوو. ئه‌گه‌ر چه‌ند قرنی پێش ئێستا بَشَر إنتباهی ئێستای هه‌با، گه‌لی فه‌رقی ئه‌کرد. أمّا سبب به إعتقاداتی فاسده، علل وأمراض ئه‌وه‌نده زۆر بووه تعمّمی کردیه، به‌سه‌ر یه‌کدا هاتینه، چاره‌ی زۆر مُشکل بووه.

قسه له کَتبه‌ی نیه له حفظی یه، بۆ عموم نا، بۆ رسول، لام وایه، وه زۆر مُنسجمه. بۆ مسئله‌ی (ضمیر) لای صاحبی ضمیر، ئاسانه. مقام شاهده،

قەرینەیە، وە ئەو تدابیرە، هیچی مَخالفی قدری إلاهی نیە. ئاو ئەڕوا سەراوسەر، بەرە ژێر، جۆگەی لەبەر هەڵئەبەستی، بۆلایەتر، بە إنتظام داروباری پێ ئاو ئەدەی، چ مُقابەلەی قضاو قدری تیاهەیە؟ عجایەبە، ئەوەی مألوفە قسەی لێ ناکەن یاخود نایەتە بەر نَظَریان، ئەوەی غەیرە عادی یە نایەتە دەماغیان، إنکاری ئەکەن. ئێوە دەوام کەن لەسەر سعی وعملیات وتجربە، لای زۆر ممدوحە، بە نظریاتی عَمرو زَید علم وعملی خۆتان تێك مەدەن، مەترسن، خوا لە کیدی (نُظّاران)، حفظتان ئەکا ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ﴾ لە چاکەو خراپە نقمت ونعمت، إستغلال وأسارەت، عزەت و ذلەت، أحواڵیان ناگورێ ﴿حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ لە إعتقادیات لە صفاتی حقە باطلە، حمیدەو ڕەزیلە، حقاً ئەو ئایەتە دەستوری زۆر عظیمە، بە سفسطەی، نُظّاران ناگۆڕێ، قاعدەی مستمرّەیە مداری صعود وهبوط إستلاو إنقراضە. ئەو ئایەتە، یەکێکە لەو چوار ئایەتەی کە مُراعاتیان، موجِبی سعادەتی دونیا وئاخرەتە (غۆستاف لۆبۆن) فیلسوفی فرنسی، تألیفیکی هەیە (سِرُ تطور الأمم) کەسێ تەماشای کا ئەڵێ (ئەو کتێبە تفسیری ئەو ئایەتەیە) بەڵکو تأریخی تشکلی أقوام، چ قبائل، چ دُول بە نشأتیان ونمایان وتوقیفیان وإنحطاط وإنقراضیان شرح وإیضاحی ئەو ئایەتەیە. یاخود ئەو ئایەتە، مُجملی ئەو تفصیلاتەیە. سُبحان الله مسڵمانان بۆ إهمالی ئەو آیەتە عظیمەیان کرد؟ بۆ ئەمڕۆ لە حاڵی خۆیان نافکرن؟ پاش ئەو تعالی یە، ئەسبابی ئەو إنحطاطە چیە؟ قطعی عَلایق لە بەینی کائناتی (أشاعران) تقیید بە سُنّتی سَلفیان إیجابی أصلح علی الله مُعتزلی یان، لاف و گەزافی صۆفی یان، سَلبی قُدرەت و قوّەتی لێ کردین، دەست و پا بەستراو بووین، بە ئومێدی کرامەتی قوەی قدسی "أولیاء الله"یان لە أوجی عِزّەت، کەوتینە حضیضی ذلەت. قوەیی عقڵمان کەم بوو، وەتا عقڵ ضعیف تر بێ، درۆی زلتر و معظمتر ئەکا، عکسی معدە. مخالفەی هەر چوار ئایەتی خوامان کرد، بە أعتماد لەسەر ئەم وئەو إتّکال لەسەر نسب، گێڕانی خوا بە حائل، لە بەینی خۆمان ودڵمان رسوخی

إعتقاداتی باطله، إستحکامی أخلاقی ڕەذیله ئێمەی خسته هاویە، هەر کەس، هەر فرقە، دوای إمامێ کەوتینە، تمسُّکیان بە دامێنی وەلی یەکی کردیە، خۆیان لەسەر حەقن، إیتر لەسەر باطلن، گشتی (فی النّار)ن. خُلاصە أمّەت وا بلاّوبوویتەوە، قابلیەتی گردبوونەوەی نەمایە، أفکارو، وآمال و، مشارب و، مذاهب و، مبادئ و، مسالك سەراپا، مختلف وناڕێك و نالێك، عداوەتی یەك، دینی ودُنیوی، خصامی أجانبی لە فِکر بردینەوە. ئێستاش ئەڵێن (إختلافُ أمّتي رَحمةٌ)؟ یەکی لە سەرامەندانی دزەیی لیمی پرسی (ئێمە لەم ذلّەتە نجاتمان ئەبێ؟) وتم: (بەڵێ، أمّا بە شرط).

أولاً: جمعێ لە رجالی سیاسیی "تام السیاسە".

ثانیاً: جمعێ لە ملایانی حُفّاظی روحی إسلامەتی پاش تصفیە لە أخلاط ومَوادّی ردّیە.

ثالثاً: جمعێ مخترع خاصّة لە أسلحەدا، جمعێ دەست لەو ئەرزە گیرکەن، محصولی نباتی ومعدنی بەدەست خەن، ئەو خەزائنە ئەو دفائنە طبیعیە بەخۆڕایی نەڕوا، نەکەوێتە دەست أجانب، وە إلاّ دەها تَدنّی ئەکەین) ووتی: في الحقیقەت وایە، أمّا ئەو شرطە بە ئێمە ناکرێ) یەعنی نایکەین.

خوایە ئەمە چی بوو؟ أمّەت صاحبی ئەو ئایاتە بن، چۆن وا سەرەوبن ئەبن؟ لە هەمووی بەلاتر، تعمیمی إرادەیە (من حیث لا یتغیر) وەك ئایەتی ﴿وَإِذَا أَرَادَ اللَّـهُ بِقَوْمٍ سُوءًا﴾ عامّە وەك ذلەتی أسارەتی إستعماری، وەبەردەستی أجانب، کە لەو وەقتیشدا عەرەب گروفتاری بوون، قسمێ ژێر دەستی، قسمی ژێر چەپەڵۆکی إیران، بۆیە (سوئی) فەرمووە، تخصیص نیە، حاجەت بە تقدیری مُقابلی نیە وەمُراد لە (سوء) گوناه نیە، تابلێین ئەویش بە خلقی خوایە مَردّی نیە.

بۆ قەومی ئیش تێکدەر ﴿فَلاَ مَرَدَّ لَهُ﴾ چونکی رادّی نیە، تا ڕەد کرێ. ئەوەی ئەو قەومە ئومێدیان پێ یەتی هیچە، (مَدَدْ یا فلان السنوسی، یا گەیلانی، یا تۆپی کەلە، یا گەنجی عثمان) فەریاد ڕەس نیە، (لات) و (عزّی) و

(منات) و(أساف) و (نائله) و (مروه) و(صفا)؟ ﴿وَمَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَالٍ﴾ غەیری ئەو کەس نیە دەفعی ئەو خراپەیان لەسەر بکات، ئەویش بەیانی فەرمووە، بە تغییری فی الأنفس نەبێ چارە ناکرێ. قومی (بلغار) و (صرب) و (قرەداغ)، (رۆمانیا)، (یونان) چەند مُدە کەوتنە ژێر دەستی حکومەتی عثمانی، دوایە وردە وردە سعیان کرد، پیاویان لێ هەڵکەوت، إتفاقیان إستقلالیەتیان إعادە کردەوە. ئاخری وای لێ هات حکومەتی عثمانیان مغلوب کرد. رووس بووە ئەو رووسە کە زەلزەلەی خستە ئەرز، مشرق ومغرب لێ ی ئەترسا، وەلێ ی ئەترسێ، جزیەی ئەدا بە حکومەتی عثمانی، بەواسطەی خانی تاتار ئەگەیشتە خەزینەی دەوڵەت. کەس لە زادەکانی خانەدانی حُکمداری، مُشرّف بووبا بە عنوانی غلامی خان لەسەر هەموو عروسیّات إفتخاری ئەکرد تدابیری شێتە، کە پێی ئەڵێن (دڵی بطروس) رووسی گەیاندە چ دەرجەیەك، کە تاتار وعثمانی هێنا چ درەکەیی؟

عرضم کردن سەیری عالەم تفسیری ئەو نوعە ئایەتە. خوا ئەزانی بە غیری تدبیری إلاهی، کە وا بۆی بەیان کردینە، چارەێ نیە. دڵ لە غلّ وغش پاك کەن، غایەیەك بێ، تشـ[illegible] بە [illegible]ـراب بکرێ، ئەمڕۆ نا سبەی بەتەواوی بەسەر ئەکەون.

ئەمڕۆ لەسەر ئەو هەموو حاڵە، شیعە هەیە شیعەیە، خەریکی عَزای (حسین)و زیارەتی مراقدە، (وهابی) هەر وهابیە، بە سوننەت وبدعەت، دەست وپای مسڵمانان ئەبەستێ، (صوفیە) هەر صوفیە، شێخ واوو کرامەت وا، قطبی فرد هەر نازانم چی؟ لَوحە المحفوظ ئەوەی تیایە، ئەمەی تیایە، شێخ تەمامی ئەزانی، ماشاء الله مقدّراتی إلاهی لە (لَوحْ) ئەبینی، هەردوو چاویان کوێر بێ، شتێکی وایان نەدی، بۆ ئێمە باش بێ، إسلامەتی خێری لێ ببینیێ. ئەو هەموو أسبابە ئەیبینن، إنکاری أسباب ئەکەن، تا ئەو چەندە بە سواری حوشتری ئەچوونە حەج، بە چ مراڕەتێ، ئێستا بەسیّارە ئەچن، لە بەغدا تا مدینە بە شەش ڕۆژ. بارێ إلاهی بە تۆپ وطیّارە شتی حەقیان ناچێتە دەماغ، بە سووك

وئاسانی ئەو هەموو خرافاتە چۆن بە دەماغیانەوە ئەنووسێ؟ لێی نابێتەوە. رەبّی توو یان کردە حائل لە بەینی خۆو قەلبیان، أولیایان کردە حائل لە بەینی توو و خۆیان. بۆ هەواو هەوەس أصلاً ئاگایان لە باسی إرادە نیە، بۆ ئیشی چاکە، ئەبێ خوا إرادە بکا بە نصیبمان ببێ، ئەوی خوا حەز نەکا نابێ. ئەبێ ئەمڕۆ خوا حەز کا بە إستعلای کفرو ضلال لەسەر إیمان وهدایەت؟!

ألآنیش مُنازعەی خلافەتە، منازعەی خێرو شەڕ وخلقی أعمالە ﴿هُوَ الَّذِي يُرِيكُمْ الْبَرْقَ﴾ بروسکە لە (بدایەت ونهایەت) نقل ئەکا لە (محمد بنی سلم) (برق) ملکێکە، چوار ڕووی هەیە، ڕووی إنسان، ڕووی گا جووت، ڕووی نسر، ڕووی شێر، کە کلکی بەحەرەکە خست ئەو بَرقە پەیدا ئەبێ، خوا حفظمان کا، لەم درۆیانەش چەند بێ فائدەیە مناسبە، لە میانی ئایاتان، شرط وایە نازل ئاگادار بێ رجوعی إلی الآیاتە، ئایاتی جوّی، ئایەتی عجیب، بە ضرّو نفع ﴿خَوْفًا﴾ لە صاعقە ﴿وَطَمَعًا﴾ لە باران، وامەزانن ئەوە لە آلهەتانن، بەلّێ طمعی غیث بۆ عمومی یە، أمّا طمعی حکمای مخترع لە شتی ترە. وەرن بۆ خاتری خوا، شتەکتان عرض ئەکەم، گوێی دەنێ تا بزانن، فرقی نُظّاران لەگەڵ نُقّالان چەند زۆرە.

ئەو بروسکە چیە؟ لە چیە؟ إرائەی بۆ ئێمە چ فائدەی هەیە؟ خوا ئەزانێ چەند هەزار ساڵە خوا ئەو بروسکەیە نیشانی إنسان ئەدا، لەبەر أوهام وخیاڵ ونقلی نُقّالان، ئێمە ڕێمان پێ نەبرد، لەبەر نەڕەنەڕی "زەنگە سوورە" و"إمامی علی" گوێ یان لە هیچ نەبوو. حُکمای قدیم لەبەر ضیقی عناصیر ڕێ یان دەرنەکرد، لە بەینی دخان و بخار مانەوە، تەمیان بەسەردا هات! تا حُکمای جدید خۆفیان پەیا بوو، بە سوپەری صاعقە مدافعَیان کرد، ئومێدیان پێ بوو بە ماکنەی (أرتریك) إستفادەیان لێ کرد. بە إستخدامی ضیای کهربائی یَدی بَیْضای خۆیان نواند، شەویان ڕووناك کرد. ئیتر نازانم مفسّرەکانی پێشی چی ئەڵێن؟ قورئان لە هەموو أعصار ئەخوێندرێتەوە بۆ هەموومان مُعجزەیە، حَصری نَظَر لە قیل وقال محرومەمان ئەکا لە ئایەتی قورئان وئایەتی أکوان

﴿وَيُنْشِئُ السَّحَابَ الثِّقَالَ﴾ کثیف وگران، ئاوتێزای، ئەو نوعە هەورە، بە بروسك و بارانن، هەوری پف، ئی وردە باران و بەفرە ﴿وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ﴾ تقدیس وحمدی خوا ئەکا، ﴿وَالْمَلاَئِكَةُ﴾ کە ئەڵێن مُدَبِّرن، (بنات الله)ن، تقدیسی إلاهی ئەکەن ﴿مِنْ خِيفَتِهِ﴾ وێکڕا لە هەیبەتی جَلالی عظمت و وحدانیەت وکبریائی خوا، ئەترسن ئەلەرزن ﴿وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ﴾ ئاگر لە دەنگی هائل صاعقەیە، بە کوردی ناوی نیە، ئەو جێی لێی ئەدا، عەیناً بۆنی باروتی لێ دێ. تکوّنی صواعق أوائل زۆر چاکیان نەزانیە، أمّا ئەمە قەیدی ناکا بۆ غرضی ئێمە. زێرا إین نیّەت بۆ عامی معلومە، لمیّەتی بۆ علمایان بێ.

قورآن ئایەتێکە عارف و عامی إستفادەی لێ دەکا، ئەگەر علم و شت پەکی لەسەر لمیّەت کەوتبا عوام چیان نەدەزانی، چیان پێ نەدەکرا، خواصیش مُعَطّل ئەبوون، بەڵکوو لە برسان ئەمردن ﴿فَيُصِيبُ بِهَا﴾ بە صاعقە ﴿مَنْ يَشَاءُ﴾ پێی ئەگەیێنێ لێ ی ئەدا، دیسان لەبەر مَوقع (ویصرفها عمن یشاء) ونافەرموێ. دنیا پڕە لە معادن وموادّی ناریە ئەگەر جنابی حەق مدافعەی بە گەلێ شت نەکردبایە عالەم مەحو ئەبۆوە، باحثان نظّاران تتبعیان کرد، بەچی ئەکەوێ، بە چ ناکەوێ، چی ئەسووتێنێ، چ ناسووتێنێ، معلوماتیان کۆ بۆوە، تاکو سوپەری صاعقەیان دروست کرد. جنابی حەق تصریفی نظری أنام لە غیری قواو طبیعەت ئەکا، تا أهلی خیرەد -بعد الایمان بالله- تتبعی ئاثاری طبیعەت بکەن، ئەوەی حُکمای طبیعەت نسبەتی بۆ طبیعەت ئەدەن، قورآن نسبەتی بۆ خوا ئەدا، تا بزانین خلاف لە بەینی خواو طبیعەت نیە.

جنابی حق تدبیر و تصرف لە طبیعەت ئەکا، وە طبیعەت بە طبیعەت صرف ئەکا، مُعارضی قوّەت قوّەتە ﴿وَهُمْ﴾ ئەو بێ نظرانە ﴿يُجَادِلُونَ﴾ مخاصمەی شدید ئەکەن ﴿فِي اللَّهِ﴾ لە شأنی إلاهی ئەو أشیایانە ئەدەن بە مَلك وإلاهی باطل و خیالّیە ومُجرّدی طبیعەتی بێ مُدبّر ﴿وَهُوَ شَدِيدُ الْمِحَالِ﴾ زۆر بە قوەتە طبیعەت مُسَخّر ومُدَبّر ئەکات. حقاً طبیعەت بۆ کەس ڕام نابێ، مُخترعەکان لەلایە سەرئەکەون، لە گەڵێ لا ئەکەونە ژێر طبیعەت. صاعقەی طبیعەت لە

غفڵەتا لێ یان ئەدا، ئەیان سووتێنی، محویان ئەکاتەوە، شێخ وتی: "ببارێ" باری "مەبارە" نەباری هەورەکە، بە أمری پارچە پارچە ئەبێ. باوجودی نازانن إنشای سحب وباران و بروسکە و رعد و صاعقە، چ تێکەو لێکەو قوەت و قدرەت و علم، دقەتی پێ ئەوێ، خوودایە قووەت و قدرەت وعلم حیلەیی علمی خۆی ئەزانێ چی ئەکا. أمّا قسەی سەرزوبانی بالطبع لای ئێمە زۆر سهلە. أمری (كُنْ) فكانی كشأنێكە لە شۆونی ربّانی نابێتە ئی کەس، نادرێتە کەس، بەکەس نادرێ، ئەی واە چ بلێم لە حەق ئەوانەی نافذ الكلمەن، مسڵمانیان پێ هەڵخەڵەتان، سمعەتی قدرەتی إلاهیان كردە موجبی جهل وضلال.

زستانی پێش إعلانی حربی عالمی لە موصل بووم، ڕۆژێ لە خدمەت جنّەت مکان (شیخ سلیم)ی (بامەڕنی) چووینە گەڕان، لەلای (باب السنجار) تووشی (دەبۆ)ی میری بووین، دارێ بڵند لەسەر بانی چەقاندرابوو، شتێکی لەسەر بوو، ئەدروەشایەوە، وەك ئەڵماس، شێخ فەمووی: "بابۆ ئەوە چیە؟" وتم: "سۆپەری صاعقەیە" وتی: "بابۆ ئەوە چەوادەبێ؟" وتم: "لە باروت خانەی دەوڵەتان، موادی ناریە زۆرە، ئەگەر بروسکە لێی دا، مملكەت وێران ئەبێ، ئەو مادەیە، بروسکە جلب ئەکا، بەو تێلانە ئەچێتە خوار، ئەکەوینە ناو بیرەکانی، کەسەری تیلەکانی تیایە ئاگرەکە ئەکوژێنێتەوە"، فەرمووی: "بابۆ ئەمە شتی زۆر باشە، ژبۆ لنەك مە نیە؟" وتم: خەتای ئێوەیە، ئێوە خەتمە ئەکەن، ئەفەرمون: "چاوان بچوقێنن، (أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ)ەی شریف وسورەی (إخلاص) بخوینن، صلواتان لێ بدەن، کافیە" بەو حاڵەش ئەو نوعە بدائعە إختراع ناکرێ".

(محال) مُحالە؟ مِحال بە مەعنا بڕبڕەی پشتێ، وەلَوْ بیكەینە مثل؟ ﴿لَهُ دَعْوَةُ الْحَقِّ﴾ ئی وی بۆ عبادی، ئی عبادی بۆ ئەو، دُعای ئێمە هاوار کەینە بەر خوا، لەبەری بپاڕێینەوە حقە، مُوافقە، قویّ و قدیرە، ئەتوانێ مرامی عباد بەجێ بێنی. دەعوەتی خوا حەقە، بۆ هِدایەت ومصلحەت وشرف وکاری ئێمەیە ئایاتی کَونی، تفسیر وإیضاح ئەفەرموی رسول ئەنێری، تبلیغمان ئەکا،

پەردە لائەدا، توجیهی نظر بۆ ملکوتی سماوات وأرض ئەکا، دەعوەتی حەق وائەبێ، ئەوەی قبوڵی دەعوەتی کا ماربی پێك دێنێ ﴿وَالَّذِينَ يَدْعُونَ﴾ عُقلاً وجوامِد ئەوەی ئەوانە هانایان ئەبەنە بەر ﴿مِنْ دُونِهِ﴾ لە غیری خوای هەرچی هەبێ خۆیان دەعوەتیان نیە، ئەوانە ڕووی عبودیەتیان، بۆ سەر خاك دادەنێن، لکن گەلێکی وا پەیا بووین، بەناوی خوا، دەعوەتی ناس بۆ خۆیان ئەکەن. حتّی منعی دوعاو پاڕانەوە، لەبەر خوا ئەکەن، دەڵێن: ئێوە پیسن هانا کەنە من، من ئیشتان لای خوا ڕێك ئەخەم" (ئەوێت أفندمز!) إلاهی باطلە خۆیان صاحبی دەعوەت نین، ئەوانەی دەعوەتی ئەکەنی بە ئومێدی إجابەت، وەلَوْ بە شفاعەت بێ، ئەگەر ڕاست ئەکەن، ئەو إلاهانە با إیجابیان بکەن ﴿لاَ يَسْتَجِيبُونَ لَهُمْ بِشَيْءٍ﴾ بە هیچ شت بوجهٍ من الوجوە ﴿إِلاَّ كَبَاسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى الْمَاءِ﴾ أنّهُ دەست درێژ دەکا، لەبەر ئەو ئەپاڕێتەوە (ئامان ورە، بۆ خۆت بێ واسطە) ﴿لِيَبْلُغَ فَاهُ﴾ ئاوەکە خۆی بگاتە دەمی ﴿وَمَا هُوَ بِبَالِغِهِ﴾ ئاو خۆی ناگاتە زاریان، بنا لە قسەی قصّاصان وەکی أهلی بەهەشت ئارەزووی گۆشتی تەیری ئەکات لە خوڕا حاضر ومُهیّا ئەبێ، دێتە ناو دەم دەچێتە دەروونی، بێ شەویلاك تەقاندن کەسێ تێنی، لێو هیشك، دوو دەستی درێژ کا، بۆ ئاو، وەهەردوو کەفی پان کاتەوە، بەڵکو ئاوی ئەگاتی، لێوی پێ تەڕکا، بۆی ناگاتێ. ئەوەی ئومێدی تێر ئاو کردنی بەوکەسەبێ، ئەبێ ئەو حاڵی چۆن بێ؟ ئیتر تأمّل کە! ﴿وَمَا دُعَاءُ الْكَافِرِينَ﴾ یەعنی من دون الله ﴿إِلاَّ فِي ضَلاَلٍ﴾ لە ضیاع دایە، خۆڕایی وبۆڕایی هاوار ئەکەن بەر تماثیل وأمثال، تماثیل دەعوەتیشیان وایە، لە ضلال بۆ ضلالە، گومڕاهیان ئەکەن، عقڵیان لێ ئەستێنن، تا إستخدامیان کەن، وەك (حُمر)ی أهلیە. جنابی حەق، لە حقیان لطفی فەرمووە، بەو جۆرە تمثیلە. وەإلاّ فرعونی مصر، حامورابی صاحبی قانون، لەسەر قدم ڕاوەستی، سینیچە لەسەردەست، ئالیکی لەبۆ گاجوت ڕاگرێ، قورآن لەبەر نزاهەتی ئەدەبی نەبا، ئەبا ئەوانە مثولەکا، بە تمثیلی، کە بیانکاتە اَلْعُوجە ﴿وَلِلَّهِ﴾ هەر بۆ ئەو ﴿يَسْجُدُ﴾ إنقیاد ئەکا، سەر لەڕێ گەردان

دادەیی إطاعەیە ﴿مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ﴾ رووحـانی، جـسمانی، نێـری غـیرە نێـری ﴿وَالأَرْضِ﴾ عالەمی سُفلی، عناصـر و مُرکّبـە، قـُوای مُدرکـە و عاملـە و عاقلـە ﴿طَوْعًا﴾ ئەوانەی مەیلیان لێك نێزیکە عادەتەن محبّەتێکیان لەگەڵ یەك هەیە، زوو إمتزاج ئەکەن، رێك کـەون ﴿وَكَرْهًـا﴾ ئەوانـەی لێـك دوور و متبـاین الطـبعن وەك روح و بدن، ئاو و ئاگر، (مـع أنـە) ئاویـشی لـە دوو مـوادی ناریـە دروسـت کردیە، یەکی (مُحرِق) یەکی (مُحترق) وەئاو مبدأی حیاتە حیات بـێ ئـاو نابـێ. بەڵێ، بەڵێ شت لە نَظَری نەزانان زۆر ئاسانە، تاسەری نەدا لە دیوار، نازانی بە چ قوەتی ئەڕوا، تابەردی نەکەوێتە بەینی ددانان، نازانێ بە چ قـوّەتی خـواردن ئەجوێ؟ تەماشای دەورانـی خـوێن کـە، بنـوارە خطـوطی مواصـلاتی أرواح لـە بەینی حواس و دەماغ و بـەینی دەمـاغ و دڵ و دقـاتی دڵ. ئـەمڕۆش نـازنن لـە چیە؟ ئەو تسخیرو، تدبیرو، حەپس و، جرِیانە، بەگەمە ناکرێ ئیمان و أمزجەی بشریش وەك عناصر، مُتباعِد و فُنطادت ئەوێ بێ تکبّرو أنانیەت بێ، زوو إیمان دێنی، تا حسدو، مەیلی رئاسەت زیاد بێ، دوورتر ئـەبێ لـە إیمـان، لـەم مەیانـە مراتب زۆرە، أستادی ئەوێ بە حییەلی کیمیاگەرانە مزاج لەگەڵ إیمـان مَـرج کـا رێك خا ﴿وَظِلاَلُهُمْ﴾ وەکی ذی ظل سجدە ئەبا لە طوعی إلاهی، دەلیلی ظـل لـە ژێر حُکمیەتی، چ قەیدیە ضمیر عام بێ، لە (مَن) في السموات والارض ئـەوانیش وەکی ئێمە، بە سێبەر بن. هەر عالەمە لە إعتباری حاڵی خۆی إمتداد و تقلّصی ظلێ بێ ﴿بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ﴾ ذاتاً شەو و ڕۆژ، ئێـوارەو، سـبەینە، هـەر بـۆ ئێمـە نیە، بۆ هەموو منظومەیە هەیە، بـا إخـتلاف بـبی بـە طـول وقـصَری، سـبەینان سێبەر درێژە، وردە وردە کورت ئـەبێ، تـا وەقـتی إسـتواء، دوایـی وردە وردە درێـژ ئەبێتـەوە خۆشـی وەقـت، بـەینی مغـرب و عـصرە، (خاصّـةً) ئێـوارەی (چنارۆك) لە هاوین. حقاً، نشئەی هەیە (حاجی قادر) لە حقی کۆیە ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| لە بەینی باوەجی و هەیبە سلطان | نسەی ئێوارەو سایەی سبەینان |
| لەلام ظلی هومایە و چەتری سەنجەر | چ جایە سایەیی سەروی صنەوبەر |

تەماشا و إعتبار كردنی سایە زۆر علمی تیایە. وە ئەو عالەمە وەك سایەیە، بە نوری خوا ظاهر بوە. ئەگەر إنقطاعی ئەو نورەی لێ ببێ، عالەم نامێنێ ﴿قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأرْضِ﴾ كَشرحی بعضە ئایاتی سُفلی و عُلویان بۆ كردن، ئەڵێن چی؟ ئەڵێین: خالقی، ربّي، مُدبّري، مُكوّني، مُرَتّبي ئاسمان و أرض كێ یە؟ ﴿قُلْ﴾ خۆت جواب دەوە، جوابی دیار، ئەوەی گوێ دێر بێ، بنواڕێ ئەزانێ ئەڵێ: ﴿اللَّهُ﴾ ذاتێ واحد واجب الوجود، علیم و قدیر ﴿قُلْ﴾ مادام وا ئەزانن، وە مجبورا إعتراف ئەكەن ﴿فَاتَّخَذْتُمْ﴾ بۆ خۆتان تەماشای خۆتان كەن. ﴿مِنْ دُونِهِ أوْلِيَاءَ﴾ نازانم بلێم أولیا چیە؟ (وەلی) شتێكە هَدمی واحدانیەتی إلاهی دەكا، حتّی بعض لە ئێمە ووتویانە: (الارضُ أرضٍ والسماءُ سمائي) وە دەها قسەی بێ مەعنایان كردیە. قسمی لە مەلایان توجیهی غیرە وەجیهیان بۆ كردینە. ئەو أولیایانە چ جامد، چ نامی، چ ساكت، چ ناطق، چ زیندی، چ مردی ﴿لاَ يَمْلِكُونَ لأنفُسِهِمْ﴾ چ جایە بۆ غەیری ﴿نَفْعًا وَلاَ ضَرًّا﴾ نەئی (هان) نەئی (هوون)، چیان پێ ناكرێ. خوا ئەزانێ فەرق نیە، هەموو مُسخَّرین مَقْهوری طبیعەتین، دوای أوهام و خیاڵ كەوتینە ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأعْمَى وَالْبَصِيرُ؟﴾ ئەگەر چاوتان هەیە، بنۆڕن، كۆرو چاوساغ وەك یەكن؟ كۆر ئەتوانی تمثیلی چاودار بكا؟ حاشا، ﴿أمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ؟﴾ تاریكی و ڕووناكی ئایا وەك یەك ئەبن؟ ئەوجا تەماشای فەرق كەن لە بەینی خالقی سموات و أرض كەن وە بەینی أولیایەكانی خۆتان ﴿أمْ جَعَلُوا﴾ بە هەوەس و مەیلی خۆیان ﴿لِلَّهِ﴾ بۆ خوا ﴿شُرَكَاءَ﴾ لا تُعَدُّ ﴿خَلَقُوا كَخَلْقِهِ﴾ چیان لە گا جووت، لە (عیسی)، لە غەیر، لە زێڕ، دروست كرد، بە خەلقی خوا بچی؟ ﴿فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ﴾ لەبەر تشابە و وێك چوونی خەلق لاتان، ئەوانە مشابهی خوان. سبحان الله، ناتوانن جواب دەنەوە، لەبەر جهل نا، لەبەر تێ گەیشتن بعد التامل لەو ئایەتە، هۆشێكیان نەهاتە بەر، أمّا ئێمە پاش إستحكامی دین و خەتمی رسالەت ئەڵێین (فلان علمهُ كعلم الله، وقدرتە كقدرة الله) بەڵێ آمنّا صدّق بەدینم دەق وایە! ئەگەر وانەڵێ زەندیقە، بەكافری ئەمری

﴿قُلْ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ لە سموات و أرض (مَن وما فیهما). قسە لە إلاهی یە (سُنّي) و (مُعتزلي) ڕاوەستێ، با ئەمیش بڵێ (إنسانی مُكلّف أفعالی خۆی بە إختیاری خۆی ئەكا، جبری لەسەر نیە، بۆیە لە طرف خوا مُعاقبە مُثابە، إنسانی ناكاتە شریكی خوا، ئەڵێ عەبدی خوا فرق زۆرە) ﴿وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾ لە خَلْق وتدبیر و تطویری عالەم عاجز نیە، غالبە لەسەر طبیعەت، بە قوەت وجبر و لطائف الحیلی علمی، طبیعەتی طاغیە، تسخیر ئەكا، قواعدی بۆ داناوە. دیارە شریك ئەبی لە عجزەوەبێ ﴿أَنزَلَ مِنْ السَّمَاءِ﴾ سَحابی ثقال ﴿مَاءً﴾ باران ئاوی صاف و زۆر ﴿فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ﴾ شیوو دۆڵ هەڵدەستێ ﴿بِقَدَرِهَا﴾ گەورە بە گوێرەی خۆی، گچكە بە گوێرەی خۆی، دۆڵی وەك (دۆڵە مۆمن) بە أطراف و قووڵ، لافاوی زۆر ئەبێ ﴿فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ﴾ هەڵ ئەگرێ لافاو ﴿زَبَدًا﴾ كەف ﴿رَابِيًا﴾ لە هەندە گێژەنی پەیا ئەبێ كەف، لەسەری خڕ ئەبێتەوە، بەمل یەكا دێ، ئاخری لە كەناری خڕ ئەبێتەوە. ﴿وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ﴾ لەو شتانەی خەڵكی ئێوەنا، ناشكری نەبێ ﴿فِي النَّارِ﴾ أَنَّهُ لەناو ئاگری، ئاگری لەسەر هەڵئەكەن. زێڕا بە ئاگری بە شدّەت نەبێ مَعادن نایەتە جۆش و كەف ناكا ﴿إِبْتِغَاءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ﴾ زێڕ و زیو و ئاسن و پۆڵا و پاقڵ و مز وە هكذا ئەتاوێننەوە، تا صاف ئەكەن، موادی ردیە و أصلی لیك جودابێتەوە، ئەوجا ئەی كەن بە خشڵ، یا أسبابیماڵێ، قاپ و قاچاغ و، مالاك و، چەتاڵی مامە دەروێش﴿زَبَدٌ﴾ كەف ﴿مِثْلُهُ﴾ وەك كەفی ئاوی وادی ﴿كَذَلِكَ﴾ بەو تەرزە بدیعە، لایەقە ﴿يَضْرِبُ اللَّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ﴾ مثلی حق و مثلی باطلتان بۆ لێ ئەدا ﴿فَأَمَّا الزَّبَدُ﴾ كەفەكە ﴿فَيَذْهَبُ﴾ ئەڕوا ﴿جُفَاءً﴾ فڕێ دراو بە طرفی وادی، بەتاو هیشك ئەبێتەوە. سبحان الله لەو وڵاتی ترێ ئەگوشن، ئاوەكەی لە مەنجەڵ ئەكەن، ئاگری ئەدەنە بەر، جۆش ئەخواو، گڵێكی سپیان دۆزیوەتەوە، ئەختەكی ئەخەنە ناو مەنجەڵەكە، كەفی زفر هەڵئەدا هەرچەند خلط و موادی غەیرە سُكّری هەیە، فڕێی ئەدا، ئەو زفرە بە أطرافی مەنجەڵەكە ئەنووسێ، ڕەق ئەبێ وەك تەختە ئاسنێ تەنك، دوایێ مەنجەڵەكە دائەگرن،

ئەنیشیٚ، صاف ئەبیٚ، پێی ئەڵێن (زێرآو)، باز ئەیکولێنن، تا دێتە قِوام، ئەبێتە دۆشاو. هەرچەند خیالیٚ ئەکەم مفتاحیٚ نا دۆزمەوە وە، شیلاوکی تریٚ لەگەلیٚ ئەو گلە و سپیە چۆن ملاقاتیان بوە، ئەو آثرەیان لیٚ دیتیە؟! وە کذا کاردی گیابیێکە، کە هیچ ذی روح نایخوا، إنسان بیٚ هاویتە ناوزاری ئاگری تیٚ بەرئەدا، کوویان زانیە، بە سماق بی کوژن، شیوی پیٚ لیٚ نین؟ وە کذا پنجی لۆکەو ماست و ئەسپۆن، ئەکوتن، ئیکتر ئەکوژن، یەك ئەگرن، جەرکەو کوپەی پیٚ پنج ئەکەن، زۆر عجایب ئەی گریٚ مفتاحی ئەوانەش نازانم چیە؟!
﴿وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ﴾ لە ئاوو زێرو زیوی صاف ﴿فَيَمْكُثُ﴾ ئەمێنیٚ، قرار ئەگریٚ ﴿فِي الأَرْضِ﴾ لە ناوی لە سەری. زێرو زیویش لەناو ئەرزی زۆر ئەمینی، ئەبێتە دەفینە ﴿كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ﴾ أمثالی مُوافق، لەو ئایەتە بقای أصلح ئەفامرێتەوە. بەلیٚ تەماشای حەیوانات ئەکەی وایە، مەرو بزن و مریشك و سائری حیواناتی نافعە، با وجودی، رۆژی بە ملیون لیٚ ی ئەفەوتیٚ، هەر زیاد ئەکا. گورگ و بەراز لەولاتی ئێمە پڵنگ و باز و صقر و سائری حیواناتی مُضِرّە، با وجودی ناخورێن، هەر کەم ئەبن. أمّا أشجارو نباتات وانیە، دارو باری بە چقلیٚ و درك و بێبەری نافع، گیاو گۆلی بیٚ کەلك دائما، طغیان ئەکەن. لەسەر داروگیای چاك. داری نافعیش خزمەتی نەکەی بەری باشی نابیٚ، مێویٚ لیٚ ی گەریٚ ی بەری قلێۆك ئەبیٚ. لە أکثری شت، طبیعەت لە چاکی نافکریٚ، زۆر و بۆر.

لە دووبست عارد دارو، بەروو، هەنجیرە سوورکەو، قەسقان و بەلاڵوك، لە کۆنە رەزی من شین بوون، مێوێکیش چوویتە سەریان. هەنارو، هەنجیرو، سێوو، قەیسی، وردە وردە بەرکانیان لە عاردی وەر ئەکەن. داریٚ کە ئەبێتە گەبلە (گەبەلیٚ)ەکانی نەبری باش نابیٚ، بەهیچ دەرئەچیٚ. حاصلی تێکرا بۆ بقائی نوع تیٚ ئەکۆشن، بقائی شخص وجودتی بەرو، زێدە نفعی تەماشا ناکەن. نازانم بۆ وایە حشراتی هیچ وپوچ لەسەر دارو حیوانات وإنسان مُسلطن؟ أنواعی میقرۆب چ ئەکا، چ ئافاتێکە، بۆ إنسان وما ینفع الإنسانَ؟

عالەمی حَیات زۆر لە إضطراب دایە. جنابی حەق، کرەم ئەکا، ئەوەی أنفعە بمێنی، ئەوەی مُضّری لا یصلّحە بفەوتیّ، مع هذا إنسانیش ئەبیّ سعی بکا.

إنسان بۆ إصلاحی حیات مُتَمِّمە، لە زەمانی رسول حق غلبەی کرد، باطل زهوقی بوو، نقد وزیف بە دەرکەوت، لکن بە مروری أیّام ئیش تێك چوو، عالەم وا قەلب بوو، هەزار جار جۆش دەی لە خلط وغەش بەولاوە چی تر نیە. پاش دەعوەتی (بهائی وقادیانی) بە جاری دینی حەق نشستی کرد، نقد نەما رواج لەسەر (نۆت)ە، سکّەی مغشوش وپاقلّ و نیکلە ﴿لِلَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ﴾ ئەوانەی دەعوەتیان قبولّ کردیە، عبادەتی کەس ناکەن، غەیری ئەو، هەر لەبەر ئەو ئەپارێنەوە، بۆ ئەوانە ﴿الْحُسْنَى﴾ لە طرفی خوای حیاتی بیّ کَدر لە دنیاو لە عقبا ﴿وَالَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُ﴾ چ مُنکر چ مُشرك چ مائل ﴿لَوْ أَنَّ لَهُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا﴾ بە خزینەو دفینە ﴿وَمِثْلَهُ مَعَهُ﴾ مثلێکیشی لەگەلّ بیّ، هەرچەندیّ بگونجیّ ﴿لَافْتَدَوْا بِهِ﴾ فدیەی نجات لە حالّی حیاتی سوءیان پێی بدەن ﴿أُوْلَئِكَ لَهُمْ سُوءُ الْحِسَابِ﴾ بە گوێرەی سوئی أعمالیان. إبهامی (حُسْنی) تفسیری (سوء) زۆر جوانە ﴿وَمَأْوَاهُمْ﴾ مرجعیان مسکنیان ﴿جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾ مَهدُ مُستقرّە ﴿أَفَمَنْ يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ﴾ قورآن هو ﴿الْحَقُّ﴾ هەر ئەو حقە نە أرجوفەی کهنە وسَدەنە ﴿كَمَنْ هُوَ أَعْمَى﴾ ئەو بَصیرو ئەم کۆر کوو وەك یەك ئەبن؟ ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الأَلْبَابِ﴾ بیّ لُبّ ودلّ وچاو چ نابینن. ذاتاً مقصد لە دینن، دیتنی ظاهری نیە ﴿الَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ﴾ عَهدی جِبِلّی، عقلّی قورآنی وکتبی إلاهی، إیمان ومُقتَضای إیمان وشەرەفی بَشری، بەجیّ بێنن. ﴿وَلاَ يَنقُضُونَ الْمِيثَاقَ﴾ لە بەینی خواو خۆیان، أز جملە بیانی حق ﴿وَالَّذِينَ يَصِلُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ﴾ رەحمی جوار ومُعاشرە، غایە ئەمەیە نەیەلّن، رەخنە بکەوێتە واسطەی إجتماعیان ﴿وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ﴾ لێی بترسن وە لو زۆر بە حسنات بن، لە أولادی رُسُل بن، خۆیان بە مرشد وأولیا بزانن ﴿وَيَخَافُونَ سُوءَ الْحِسَابِ﴾ لە رۆژی جەزا، ئەوەی لە حساب بترسیّ خراپە ناکا، مادام الآمکان خۆی ئەپارێزی، وەإعتماد ناداتە فدیە

وشفاعەت ونسب. پێنج جُملەی فعلیە، صدری جُملە مضارع، وەتکریری بۆ موصول لەیەك دوو جُملە، دووەم، سێ ﴿وَالَّذِينَ صَبَرُوا﴾ بە إعادەی موصول وە سێ جُملە فعلیەی ماضوی، وە جُملەیە مُضارعی بۆ؟ صَبرکە تا حالّی مُقابلیان ذکر ئەکەین. صبری ئەوانە ﴿ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ﴾ بۆ رضامەندی خوایە، هیچ غرضیان نیە، إلاّ تحمّلی باری إلاهی وإعلای کلمەی خوا. کفرەش صابریان زۆرن، بەڵکو لە سعی وکۆششیان دەرئەکەوێ، گەلێ لە ئێمە صابرترن. بۆ نەیلی مطلب تحمّلی مشاقّ ومحَن ئەکەن ﴿وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ﴾ مفروضە یا عام ئەگەر ئەو ئایاتە (مدنی) بن، عموم خوشترە، وکذا ﴿وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً﴾ هەریەك بە گوێرەی خۆی بە دزی وئاشکرا، ببەخشێ لە خێرو لە واجب. لە (مکە) بە ئاشکری نەبێ حالّی وایان هەبوە؟ رێی نفقەیان لێ گیرابوو. فی الحقیقەت ئەو چەند ئایەتە بە (مدنی) ئەچن ﴿وَيَدْرَءُونَ﴾ دەفع ئەکەن ﴿بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ﴾ مقابەلەی خراپە بە چاکە زۆر چاکە لەگەڵ دەسەلات، ﴿أُولَٰئِكَ﴾ ئەوەی موصوف بی بەو صفاتە إلی یومِ القیامە ﴿لَهُمْ عُقْبَى الدَّارِ﴾ وەلو سَلّمنا ئەوە لە حەق أنصاران نازل بوە، ئەگەر (مکّی) بێ، (دنیا) زێڕا لەوێ مسڵمان زۆر مُضطرِب، أنَّهُ بێ مُؤَن بوون، ئەگەر (مدنی) بێ، (قیامەت) کە لە دوای دُنیایە، باهەر دووبێ، ذاتَ مسڵمان داری دنیای بوو، داری عقبای ئەوێ. ئەگەر لە دنیا بوو بە صاحبی دارو دیار، بەهەشت بۆ خۆی بۆی دێ ﴿جَنَّاتُ عَدْنٍ﴾ بەدەلە، ذاتاً عقبای ڕاستی ئەوە، دنیا مزرعەیە، (أبو البقاء) ئەفەرموێ: "دروستە مُبتدا بێ" جێی إقامەت ودڵگیر، ئەوی بیچێتێ پابەندی ئەبێ ﴿يَدْخُلُونَهَا﴾ ئەش چنە ناوی ﴿وَمَنْ صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ﴾ وێکڕا ﴿وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ﴾ دەچنە جنّە العدن، ئەوە دووخۆشیە، قرار گرتن لە جنّەت و گردبوونەوەی أصولّ وفروع وهەمدەمی دنیاو عقبا ﴿وَالْمَلَائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم﴾ زیارەتیان ئەکەن، ئەچنە لایان ﴿مِنْ كُلِّ بَابٍ﴾ دیارە بەهەشتێ واسع، دەرکەی زۆر ئەبێ. ممکنە هەر دەرکەیە إشارەبێ بۆ نوعە خێرێ. جاهەوەست لێ یە، گوێ گرە (أبی أمامە) و (أنس) و (إبن عباس) تا دەرکەی خیالاّتت بۆ

بکرێتەوە، بەهەر دەرکەیێ حەز ئەکەی بچۆ ژوورێ ﴿سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ﴾ سلامی خواتان لێ بێ، لێ یە، نائلی ئەو مقامە بووین ﴿بِمَا صَبَرْتُمْ﴾ لەسەر ئەوە لەئایاتی سابقە ذکرکرا ﴿فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ﴾ جنّە العدن عتبایە بۆ دنیا، یا بۆ جهنّم (العیاذُ بالله). ژنە کوێی (حقیقةً) دوعایە زۆر چاك بۆ خۆیان ئەکەن (یا خوا آخرت خێر بێ) لەبەر ئەم عُقبایەن عُقبا أولی بۆ دنیا بێ، لام خۆشترە.

تەماشای (روح المعانی) کە نحویان بو متعلّقی (بِما صَبَرتُم) چیان فەرمووە؟(حقیقةً) جمع کردنەوەی ئەو أقوالی مختلفە صبری پێ ئەوێ. یا خوا سیّدی آلوسی روحت بە جنات و العدن شاد بێ. ممکنە ئەو ملائکەتانە، ئەوانەی دنیا بن، کە ئەناردران بۆ نووسینی عمل وحفظیان. باز منازعەیە، مەلەك أفضلە یا بَشر؟ ﴿وَالَّذِينَ﴾ ئەوانە مُقابلی أولوا الألبابن ﴿يَنقُضُونَ عَهْدَ اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ﴾ پاش مەحکەمی کە چ شائبەی تجویزی هەڵوەشاندنەوەی نەبێ، ئەوی عهدی خوای بشکێنێ، عهدی بشری چۆن بەجێ دێنێ؟ أئِمةُ الکفر عهد؟ تەماشای سیاسیّونی عصر کەن، بەفەخرەوە ئەڵێن (رجلی سیاسی لدی الآیجاب عهد ومیثاق سوێند وناموس وشرف ووفاو دۆستی ئەهاوێتە ژێر پای) واقعاً وان. لەو جهەتە مسلّمانان زۆر ضرریان لێ دیتن. أمّا ئاگایان لە قورآن نەبووە. حتّی (ملك حسین) بە رەحمەتی لە بعضە إعلاناتی وا بەدەر ئەکەوت کە ئاگای لە ئایەتی (قاتِلوا أئِمةَ الکُفرِ) الآیة نەبوە ﴿وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ﴾ رەوابطی دینی دنیوی، حتّی رابطەی نسب ﴿وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ﴾ هەر کوێ بێ، کارو پیشەیان فتنەو ئاشوبە، تێك بەردانی (أنام)ە. نوێژ هیچ، صبریان لەسەر فساد زۆر بە قوّەتە، إتفاق ئەکەن أمّا بۆ جرّی منفعەت، أقلاً فلسێ بەرپایی، ئەوی مفسد بێ دیارە مقابلی چاکە، بەخوا ئەگات. لە أولوا الأباب تفسیری بعضە أموری لازمە، وك (صبر) و (نوێژ) و (زەکات) مُقابلن بۆ بێ لُبّی، قسوەت ودڵ رەشی، ئەوسێ یە پێکەوە کافیە، إستمرار لە هەموی مطلوبە، لکن بعضێ زیاتری پێ دەوێ. وەفای بە عهد ومیثاق کە لێك نیزکن، وەکذا (وصل) و (خەشیەت) و (خوف) ئەبێ دائم الحضور بن زۆر ئاگاداریان لێ

بکرێ. (صبر)و (نوێژ) و (إنفاق) لدی الآیجابن، مقصد تحققی وقوعە. هەموو دەم شدائد نابێ، نوێژ موقوتە، وەکذا (إنفاق) گاەگاهە (خاصّةً) ئەگەر مُراد (زەکات) بێ. یەك دوو مُقابلەی خراپە بەچاکە هونەر نیە، مُقابلە لەگەڵ کثرەتی، کە مستلزمی إستمرارە، خۆیەتی، ئیتر لام وایە جوابی سوٴالی سابقت بۆ معلوم بوو، گەرچی صاحبی (بحر) ئەفەرموێ: إختلافی بە مضارع وماضی تَفنّنە" أمّا (تفنّن) بێ نُکتە خۆی نیە، مع أنّە فائدەیەکی زۆر عظیمی نەبێ، من بە لسانی علم ئەڵێم کەیفم بە تفنّن نایە ﴿أُولَئِكَ﴾ ئەوانە کە مستمر بن لەسەر ئەو صفاتە، وە تۆبە نەکەن ﴿لَهُمُ اللَّعْنَةُ﴾ جەهەننەم بئس القرار.

کەسێ تەماشای عالەم کا، لە هیچ قەرنێ بَشَر وا بێ أخلاق وتربیە نەبوە، زەمانی جاهلیەت نسبەت بە ئێستا زەمانی سعادەت حسابە، عالەمی إسلامیەت حالاش بە عهد وپەیمانی ئەروپای یان هەڵ ئەخەڵەتێن، بە إفسادیان عداوەتی یەك ئەکەن، یا گەلێکیان ڕوویان لە دین پێ وەرگێڕاین. سیّداتی عاهرات، راقصاتی دانساتی، قومارو مسکِرات، شرفی دین و دنیای بردین حاصڵی وەکی لە وەقتی خۆی (مُعرّی) وتیتی ئێستا بە ڕاستی وایە (إنسان دوو فرقەیە: عاقڵی زەندیق، مُتدیّنی أحمق) کەنەختێ علمیان خوێند لە مکاتبی رسمیّە ئەبن بە (داروین) دیانەت وشریعەت لایان نامێنی، ئەگەر ماقووڵ بوون وبوون بە وەظیفە دار، ئەبن بە أتباعی هەواو هەوەس، ئەوانەی ئەهێنینەوە، علی الأکثر بە ناوی (طریق) لە إسلامیەت دەرئەچن، سەد خۆزی بەوانی دی. لەسەر ئەو هەموو ڕەزالەتە، حالاً نزاعی سُنّی وشیعە، سُنّی ومعتزلە، سَلفی وخَلفی، حُکم فەرمایە. قُیودی سُنّتی (إخوان)یش نازانم چی لێ دێ؟ ئەزانم ئەشکێ ئەگەر مَلایانی بە حکمەت وبەهێزەکان، نەکەونە فرقەیی سیاسەت وإدارەی ملك وسلطنەت وعبادات نەکەن أمّەت خۆی قیودەکە ئەشکێنی وە زۆر خراپ ئەبێ.

مداری ئەو هەموو سیّئاتە ئەمڕۆ، ئەگەر تێ فکری، تَبَسّطی فی المعیشەتە، وائەزانن وەك ئەوانی پێشی ئەگەر لەسەر قاعدەی دین بمێنن، بێ ڕزق ئەبن،

مع أنّه ئەو فکره زۆر غلطه ﴿اللّـهُ یَبْـسُطُ الـرِّزْقَ لِمَـنْ یَـشَاءُ﴾ چ مـؤمن چ کـافر إیمان به خوا مانعی طَلَبی دنیا نیه، غایەتی خوا چاکی و پاکی ئەویَ ﴿وَیَقْـدِرُ﴾ تەنگ ئەکا زۆر غەیره دین هەن له برسان ئـەمرن، وەگـەلیَ مـسلّمان هـەن، زۆر دەولّەتمەندن یا دەولّەتمەند بووین. مُؤمن با سعی کا، دنیا بەدەسـت خـا، لـدی الحاجەت له رِێی خوا إنفاقی کا، بۆی ئەبێته مایەی سعادەتی (دارەین).

ئەوانەی خوا بەسطی رِزقی بۆ کردینـه، لـه بَـدل شُـکران کردیتیانـه مُـوجبی کُفران ﴿وَفَرِحُوا بِالْحَیوتِ الدُّنْیَا﴾ فرحیَ آخرەتی له فکر بردینـەوه، تـاکو کُـدور به خاطِریان نەگا، به تەواوی لذّەت له حیاتی دنیا ببینن، إنکـاری جـزا ئەکـەن. سبحان الله جملەیی (الله یبسط الرزق) نَظمی آیەتی له بعضەکان تێك دایه، ئەی هاوێنه بابی (تقدیم) و (تأخیر) ﴿وَمَا الْحَیَاةُ الدُّنْیَا فِي الآخِرَةِ﴾ نَظَـر بـه حیـاتی عُقبا ﴿إِلاَّ مَتَاعٌ﴾ کەم بیَ دەوام، بیَ تام لذّەت، (تَعِبٌ کُلّها الحیاة) حتّا کەلیَ لـه ئەورووپایی له کردەوەی خۆیان پەشـیمانن، حَیـات ئەوەنـده گـران بـووه، پێـی ناتوانن ﴿وَیَقُولُ الّذِینَ کَفَرُوا﴾ رِۆچووەکانی له کفری بیَ لُـبّ پـاش ئـەو هـەموو طول تفصیلی ئایاته ﴿لَـوْلاَ أُنـزِلَ عَلَیْـهِ﴾ لەسـەر (محمـد)ی ﴿آیَـةٌ﴾ أعجوبـەیێ ﴿مِنْ رَبِّهِ﴾ نازانن ئایەتی حقیقـی وەك شـێخی (إبـن سـینا) ئەفـەرمویَ (علمـه) خاصّةً ئەو علمه بـۆ ذاتـه أُمّیـه. خـوارق بـۆ أخـذی أوهـامی عوامـه. مـن ئـەلّێم (إیمـان بـه خـوارق خـۆی نیـه، فـوارق سـەر ئەکیـشێته، عطـالـەت وجهالـەت وسفالەت، وەك بنی إسرائیلی، ریاضەت و میاضەت لەگەلیَ حـالّی أمّـەت توافـق ناکا، بەس نظر له ئایاتی أکوانی قرآنی نظـری عملـی، خۆیـەتی) ﴿قُـلْ إِنَّ اللّـهَ یُضِلُّ مَنْ یَشَاءُ﴾ کێن ئەوانه؟ ئەوانەن که پاش إستماعی ئـەو ئایـاتی سـورەته ئەلّێن (لَوْلا أُنزِلَ عَلَیهِ آیةٌ) ئەگەر أدنی قابلیەتیان هەبان شتێکی تیَ دەگەیشتن هیچ نەبا سکوتیان ئەکرد، لەو إقتراحه وازیان ئێنـا ﴿وَیَهْـدِي إِلَیْـهِ﴾ بـۆ جـانبی أقدسی خۆی ﴿مَنْ أَنَابَ﴾ ئەوی رِووکاته حـەق، گـویَ داتـه ئـەو ئایاتـه، ئـەوی دوای هەوای نەفس کەویَ، نەگەرِێتەوه، وەك سیاسیونەکانی مُفسدی بیَ وەفـاو بیَ شرط وسوێند، أبداً إستفاده له قورآن ناکا، بەلّکو ئەبێته خصمی، سعی لـه

إفنای ئەکات ﴿الَّذِينَ آمَنُوا﴾ بالفعل، وکذا ئەوانـەی مُهیّـان، إسـتعدادیان باشـە، بە فساد نەچوون ﴿وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ﴾ دڵیان ڕادەوەستێ بـێ دەغدەغـە ﴿بِـذِكْرِ اللَّهِ﴾ کلامی خوا، قورئانی کریم، کە پڕە لە آیات الله، ئەوانە دڵیان خاڵی یە لـە حسد وکبر وخیانـەت، (حقیقـە) ئەوانـە، هـدایتیانِ بـۆ جنـابی حـەق ئـەبێ. لـە ضمنیێ ئایەتێ ئایات إستفادە ئەکەن ﴿أَلاَ بِذِكْرِ اللَّهِ﴾ وحدە نەك خوارِق وحـای و حووی ﴿تَطْمَـئِنُّ الْقُلُـوبُ﴾ ئـەوی لـە أولـوا الألبـاب بـێ قـسە لـە حـضرەتـی رسالەت پەناە، هەر نیە. أمّا أصحابی گزین فلا شك ئەوان لُبّی لُبابن ئەوی لُبّـی یە، دڵ لُبّێ لەو ئایەتە بفکرێ، ئـەزانێ مـراد بـذکر الله قورئانـە، ئـەویش وەکـی ئەبینن پڕە لـە ئایـاتی عقڵـی کَوْنی، جێـی سـوێندو هەڵپـە هـەڵپی (قـادری) و (نەقشبەندی)یان نیە. دیارە إطمئنانی تقلیدی هیـچە. ئەگـەر بـۆ ئـەوانی ئێمـە قبولْ بێ، بۆ عوامی أدیانی دیش ئەبێ قبولْ بکرێ. بەڵێ (ألوَیْل کُلّ الوَیْـل) بـۆ رۆسایانە، ئەگەر علمای مذاهب وطرق لێرە بفکـرن، ئـەبێ زۆر بترسـن (خاصـّةً) ئەوانەی رابطەی أخـوەتی إسـلامیان پـساند، ئەگـەر تەماشـای فـصل ووصـڵی بعضێ رۆسای کـەی، سەرسـام ئـەبێ، تـأثیری قـدرەتی عبـد إنکـار ئەکـەن وە ئەڵێن: أجنّە قادرن، خۆیان متشکل ئەکەن بە أشکالی مختلفە، قطعی علاقە لـە بەینی کائنات چۆن ئەکرێ؟ إختلاف کوو ئەبێتە ڕەحمەت؟ ئەگەر وابـێ، ئـەبێ إتفاقی أُمّەت نقمەت وغلط بـی. فـصل و وصـڵی کتـابی بـدیعی کائنـات، قیـاس ناکرێ، لە فصل وصڵی علمی بلاغە. فصل وصلْ لە بعضە مقامی علمی ومعانی وەك (سعد) ئەفەرموێ (یُسْکَبُ لَهُ العِبَرات) لە مقامی إشتباهی فصل ووصلْ لـە بعض کات دا، ئەبێ إنـسان نـووری چـاوی بـۆ داڕژێنـێ. ئـەی هـاوار تەماشـای فصلی ئێمە کە، چۆن مفاصڵی لەبار یەك هێنانەدەر، تەماشای وەصـڵی خـەلق کە، قطعاتی أرضیان پێکەوە نووساند بە کهرەباو، رادیۆ، لـە هـەولێر گـوێم لـە قرائەتی مصری ئەگرت، أوّل کلامێ هاتە گوێم (لا إکْراه في الدین قَدْ تَبَیّن الرشد مِنَ الغَيْ) ووتم: والله وایە، أمّا أهلی غَـیْ نایـەن بـۆ رُشـد، غَـیْ بـە لباسـی رُشـد تلبیس کرا، إیتر چارە نەما ﴿الَّـذِينَ آمَنُـوا وَعَمِلُـوا الـصَّالِحَاتِ﴾ هەرشـتە نوعـە

کارێکی بۆ صالحە، ئەبێ بزانن عملی صالح چیە؟ ﴿طُوبَى لَهُمْ﴾ عیش وگوزەرانی خۆش زێدە بە لذەت، گەلێ لە ژینی بێ إیمان وفاسقان صافتر، ئەمە بۆ دنیا.

(حقیقةً) قومی مؤمن وچاك وبەچاکە، گوزەرانیان لە خەڵکی خۆشترە. مؤمن برای یەکن، معاونن بە کسابەت بە تجارەت بە زراعەت، بی دزی وڕێگری وسَلب ونَهب وإختلاس، ماڵی دنیا کەسب ئەکەن. مؤمن لە دەرەوە أنّە لەگەڵ برایانی خۆشەویست ومُشفِق هەڵدەستێ ودادەنیشێ.

لە ماڵی کە لەذتی دنیا ئەگەر ببێ، لەناو چوار دیواری خۆتە بە نظامێ جوان، ئەدەبی شیرین، ژن ومێرد لای یەك خۆشەویست ومحترەم، أولاد بە تربیە، کچەکە بە ئەدەب کوڕەکە بە مرحمەت ولطف لەسەر سینی مێزی سفرە، بە نکتەو لطائف و قسەی فرح ئامێز، گردبنەوە. خورشی متوسط عافیەت کەن لە بەینی إسراف وتبذیر ڕابوێرن. ئەو عەیشە لای بێ دین، لای فاسق، لای بێ تربیە، سيّءُ الخُلق بەد معاشرە نیە. گەلێ کەس مەلان، شێخن بە عبادەتن، حُسنی معاشرەیان نیە، إمراری حیات بە مرارەت ئەکەن، لذّەت نابینن، ئەوی تووڕە بێ، هەرباسی مەکە، لە خۆشی وەڕزە. بەهەشت و سایەیی سەروو، صنوبرو، شمشادو، عەرعەر لەگەڵ عەیشی خۆش خۆشە. بۆ ئاخرەت ﴿وَحُسْنُ مَآبٍ﴾ لام وایە، ئەو عەیشی کە بەیانمان کرد بۆ معنای (طُوبی) لای جمعێ زۆر دوور دیتراوە. ئەوجا (طُوبی)یان کردیە بە داری زۆر عجایب، بڕۆ تەماشای تفسیری (إبن جریر) کە، لە تەماشا کردنی (طُوبی) عاجز ئەبی، چاوت ئاوئەکا، وەچەند معنای لە (طُوبی) داوەتەوە، باشن، ڕەحمەتی خوایان لێ بێ چی بکەم (سیّد رشید) نەماوە! ﴿كَذَٰلِكَ﴾ بەو تەرزە، بە علم وحکمەت و فصلی ئایاتی کَوْنی، نە بە خوارق وأُعجوبەی بێ دەوام وإستمرار وفائدەی عام ﴿أَرْسَلْنَاكَ﴾ تۆمان نارد ﴿فِي أُمَّةٍ﴾ لە خۆیان بۆ خۆیان و سائری عباد ﴿قَدْ خَلَتْ﴾ ڕابورد ﴿مِنْ قَبْلِهَا أُمَمٌ﴾ زاناندیان، بیستبان، عاقبەتیان چی لێ هات؟ ئەوانەی طَلبی خوارقیان کرد، بۆیان نواندرا، چۆن تجاوزیان لە حَد

بوو، تێپەڕین لە ڕێی إیمان وەرگەڕان ﴿لِتَتْلُوَ عَلَيْهِمُ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ﴾ ئەمەش عەینی مەرحەمەتە قومێ أمّی رسولێ وایان بووبێ، فێری علم وحکمەت ونظام وتربیەو خطّ وقلمیان کا. قومی أمّی لە خوارق فائدێ نابینن، ذاتاً بێ فائدەیە ئەگەر فائدەیێ ببێ، إیمانە بە صاحبی معجزە، تاکو تبەعیّەتی بکەن، علمی لێ وەرگرن ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَانِ﴾ خۆیان لەو ڕەحمەتە بە غنی ئەزانن، إحتیاجیان بە سولێ هکذایی نیە، تا خوا ڕەحمیان پێ بکا، بۆیان بنێرێ ئەڵێن: "ڕەحمان چیە؟" ئایەت منظومە، سببی نزول ڕێی نیە ﴿قُلْ هُوَ﴾ ئەو ڕەحمانی ئێوە پێی کافرن ﴿رَبِّي﴾ أمری من بەدەست ئەوە، ئەو تربیەم ئەدا، بە تربیەیە ڕەحمانی، خۆی منی گێڕایە بەو إنسانە، لەناو قەومی وەکی ئێوە کە نازانن ڕەحمان چیە؟ ﴿لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ﴾ نەئی غضب نەئی ڕەحمەت هەر ئەوە، وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ ﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ﴾ لەسەر غەیری ئەو، نا ﴿وَإِلَيْهِ مَتَابِ﴾ هەر بۆ لای ئەوە مرجعی من، تأمینتان ئەکەم عاقبەت بۆ منە ﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْآنًا﴾ قورئانێ، کتابێ مُعنْوَنْ بەو عنوانە ﴿سُيِّرَتْ بِهِ الْجِبَالُ﴾ بەسەر چیاو ئەرزو عەردی دا بخوێندرێتەوە، لە هیبەت وجلال وکبریائی (مَنْ أنْزَلَهُ) چیای پێ بڕوا، لە مکانی خۆی نەمێنێ، جیگایەکەی ببێتە مزرعەو جنان، یا کێوی پی مسخر بکرێ وەك بۆ (داود)ی مسخّر بوو بوو ﴿أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ الأَرْضُ﴾ ئەرزی پێ پارچە پارچە بکرێ، جۆو جۆبارو کانی لێ بێتەدەر ﴿أَوْ كُلِّمَ بِهِ الْمَوْتَى﴾ مردی پێ زیندی بکرێتەوە، یا قسەی پێ لەگەڵ مردیان بکرێ، وەك ئەڵێن (عیسی) ئەی فەرموو (قُمْ بِإذنِ الله) مردی ڕاست ئەبۆوە، یان ئەڵێن مەلائکەت بانگی چەند هەزار کەلاکە مردی کرد، زیندی بووینەوە ومردی بوونەوە! یا فوویان تێ ئەکەن، وەکی هەمیانە (هەمبانە)ی چەقۆ کەران.

ئەگەر قرآنێ هکذایی لە طَرَف خوا بۆ جنابی رسالەت پەناە، نازل بوویا، چ ئەبوو؟ گۆی یا حسب الاقتراح والعهد، إیمانیان ئێنا، حاشا. مادام قورئان بێ وأحکامی تیا بێ، إیمانی پێ نایەنن، تکالفی خاصّةً تکالفی عالیە وعامە، تحمل ناکەن، دەنا بوونی ئەو مُقترحە ممکنە، لە خوا عاصێ نابێ ﴿بَلْ لِلَّهِ

الأَمْرُ جَمِيعًا﴾ هەرچی لە دائرەی إمکان بێ، لە قدرەتی خوا دەرناچێ، أمّا بۆ عالەمی متطوّر إماکنی ذاتی کافی نیە، إمکانی إستعدادی ئەوێ، کە (إستعداد) فەوتا قابلیەت نەما، تأثیری فاعل ئەبێتە مُحال، ئەگەر زێدە مەعنات ئەوێ، تەماشای (تفسیری کبیر) و (إرشادی عقلّی سلیم) و (روح المعانی) کە لای بعض وەك لە تفسیری (إبن جریر) ئەڵێ (ئەو شرطیە تعلّقی بە (یکفرون بالرحمن) هەیە). تقدیم و تأخیر نەبێ، ناخۆش نیە. مەعنای مُختاری (فخرالدین رازی)، (أبو السعودی عمادی)، (سید محمودی بغداد)یم زۆر لا خۆش نەبوو ﴿أَفَلَمْ يَيْئَسْ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ قسەیان لە (یأس) فەرمووە، مەعنای چیە؟ روایەت لە (إبن) ئەکەن (ییس) لە بۆرژانی کاتبە، أصلی (یتبیّن)ە. ئەوجا إنسان لە روایەت مأیوس ئەبێ، خصوص لە (إبن عباس) زۆریان إفترا بەزاری کردیە. لام وایە أکثر لەبەر إعتقاد، بە مەعنای آیەت نەکەوتوونە وە إلاّ دیارە (یأس) لەسەر مەعنای خۆیەتی، ئایا ئەوانەی إیمانیان هێنایە، مَأیوس و نائومێد نەبووین، لە إیمانی ئەوانە؟ هەر أملیان باقیە، ئارەزوو ئەکەن، مُقترحیان بێتە جێ، بەڵکو إیمان ئێنن، یان بەهانەیان ئەبڕێ؟ ﴿أَنْ لَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَهَدَى النَّاسَ جَمِيعًا﴾ لەبەر ئەو إیمان و إعتقادو ئارەزووە، چەند بار ووتومانە ئەوانە إیمان نایەنن، تحمّلِ هدایەت ناکەن، تابعی (محمّد)ی نابن. دوایە دیم (سیدی ئالوسی) رەحمەتی خوای لێ بێ، بەو نوعە مەعنای ئەفەرموێ، وە بە تەواوی تفصیلی ئەدا، تحقیقی ئەکا. ﴿وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەهلی (مکە) جهەتی (سوریە) و (عیراق)، قبائلی باقیە لە أطراف (مدینە) ﴿تُصِيبُهُمْ بِمَا صَنَعُوا﴾ لە (کفر) و (تفرقە) و بێ مبدئیو و بێ مسلکی و بێ غایە ﴿قَارِعَةٌ﴾ ضربەیێ، أمّا ضربە، ضربەیە جوولەکانە. ئەبێ أهلی مستعمرات حاڵیان کووبێ؟ ﴿أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِنْ دَارِهِمْ﴾ ئەیانگاتێ، یا نێزیکیان ئەکەوێ، ئەمڕۆ نا، سبەی نۆرەی وانیش دێ، کە لە أطرافەوە عەرەبستان إستیلاکرا إستیلای (حجان)یش ئەکرێ. ئەوە دەوام ئەکا ﴿حَتَّى يَأْتِيَ وَعْدُ اللَّهِ﴾ ئەگەر رێك کەوتن، یەك

معبود، یه‌ك قائد، یه‌ك غایه بوون، باشه نجاتیان ئه‌بێ. وه إلاّ خوا ئه‌زانێ چیان به‌سه‌ر دێنێ.

﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ شامل بۆ وه‌عدو وعیدی قطعی، ئه‌مه قابلی خُلف نیه، تخصیصی عام، تقییدی مُطلق، خُلف نیه. (شێخی إبن العربی) خُلفی وه‌عیدی لا، ممدوحه، بۆ جه‌نابی حه‌ق، تجویزی ئه‌دا. عرض جنّه‌ت مکان (شیخ علی أفندی)م کرد (ایّوه له (خُلفي في الوعید) چی ئه‌فه‌رموون؟ شیخی عه‌ره‌بی (تجویزی ئه‌کا) فه‌رمووی (سبحان الله که‌سێ ده‌عوای عبودیه‌ت و ئه‌ده‌ب بکا مسئله‌یه عنوانی خُلف بی، کوو نسبه‌تی بۆ جنابی حه‌ق ئه‌دا؟!)

به‌عضێ ئه‌ڵێن (مُراد به (قارعه) سَرایای رساله‌ت په‌ناه بووه، ناردیتیه سه‌ر عه‌ره‌بان) به‌ڵی ئه‌گه‌ر ئه‌و ئایاته، له (مدینه) – بَعد الإذن بالحرب) – نازل بووبێ، باشه ﴿وَلَقَدْ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِنْ قَبْلِكَ﴾ مثلا (نوح) سفینه‌ی ئه‌کرد، ریشه‌خه‌ندانه‌یان پێ ئه‌هات. رساله‌ت په‌ناه له (مکه) له (مدینه) – مع الأسف – گه‌مه‌ی پێ ئه‌کرا، له طرف صنادیدی قومی و منافقان ﴿فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ مُدّه‌یه لێ یان گه‌رابن، به‌ڵکوو عبره‌ت ئه‌گرن، دێنه هۆش، نه‌بوو ﴿ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ؟!﴾ بعضه کتان بۆ بَیان کرا ﴿أَفَمَنْ هُوَ قَائِمٌ عَلَى كُلِّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ﴾ له‌سه‌ر سه‌را وه‌ستایه، مُطّلع و ئاگاداره، مثاقله ذره‌یه له کائنات لێ ی بزر نابێ، وه‌کی چی؟ ئه‌گه‌ر حماقه‌تی ئه‌و نوعه بَشره نه‌بێ، جوابی نیه، بلێین وه‌کی چیه؟ وه‌کی کێ یه؟ کێ وه‌کی وی یه؟ ئه‌وی بلێ: (مراد، مه‌له‌که) له شرك دوور نیه، مه‌له‌کێ قائم به أعمالی شخصێکی له کێ؟ ذاتێکی واحدی، قائمی علی کُلِّ نفس له کێ؟ خۆزی ئه‌و نوعه تفسیره مَأثوره نقل نه‌کرایه ﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ﴾ أمّا چ شَریك؟ که خۆیان به شه‌ریکی خۆیانی حساب ناکه‌ن. بَشَر سه‌یره ئه‌وه‌ی چ نسبه‌تی نیه، له‌گه‌ڵ خوا ئه‌ی که‌نه شه‌ریك و کوڕو ژن و کچی خوا! ئیتر زێده تصریح ناکه‌م. پێیان ئه‌ڵێم (شریك چه‌نده؟) حسب المیله؟ دوو سه‌د هه‌زار ملیۆنه؟ وه‌ك فلیکۆنی قدیم، تا إشکالیان زیاد ئه‌بوو، پارچه فه‌له‌کێکیان زێده ئه‌هێنا، پینه‌یان پێ لێ ئه‌دا،

ئاخری وای لێ هات، پینەی هەڵنەگرت. ئەمانەش شتێکیان دی، خوایەکی بۆ تَوَهُم ئەکەن. ﴿قُلْ سَمُّوهُمْ﴾ ناویان بینن، تا بزانین سِماتیان، صِفاتیان، ئاثاریان چیە؟ خوا کەس بە شەریکی خۆی نازانی، خۆی ئەناسێ و کائنات ئەزانێ هەمووی چیە؟ مەملوك و مخلوقی یە. ئێوە ئەڵێن (شەریکی هەیە) دەبی عالم ترین لە خوا ﴿أَمْ تُنَبِّئُونَهُ﴾ ئایا خەبەری ئەدەنێ؟ ﴿بِمَا لاَ يَعْلَمُ فِي الأَرْضِ﴾ دیارە ئێوە خەبەری ئاسمانتان نیە، ئەگەر بزانن شتێ لە حاڵی أرض دەزانن. ئایا علمتان بەدەرەجەیەکە، ئەزانن خوا شریکی هەیە، ئەو نازانێ؟! ﴿أَمْ بِظَاهِرٍ مِنَ الْقَوْلِ﴾ یا هەر وا، قسەیەکە سەرزارەکی؟ ئەمە إلاهی شەڕە، ئەوە إلاهی خەیرە، هۆوە إلاهی ضریە. ڕۆژی مُراجعەی إلاهی (ڕۆما) کە ﴿بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مَكْرُهُمْ﴾ ئەوانەی بوت پەرستیان پەیا کردیە لە بەشەر، وایان صلاح دیت بۆ عوام، هەیکەلێ دانێن، أنَّهُ ممثلی خوایە، تا لە ئۆغریا جان ئەفشانی بکەن. گۆیا لایان وابوە دەعوەتیان کەن، بۆ خوای نادیدە إیمان نایەنن، حتّی (ئەفلاطون) لە (جمهوریەت)ی خۆی شتێکی وا ڕائەگەیەنی، کە تمثیل بۆ عوام لازمە. کەچی بالآخرە رئیسەکانیش تێوە گلان، حُبّی تماثیل لە دڵیان جێ گیربوو، ﴿وَصُدُّوا عَنِ السَّبِيلِ﴾ مەیل شەقاواتانەو وجاهلانە مەنعی کردن، لە ڕێی خوا، بە خیاڵ و وەهم تێوە گلان، خوایان لابوە مُجَسَّم ومُمَثَّل، بەڵکو مُتَطَوِّر، بە أطواری أجنّەی حیوان وعَلقەی ف الأرحام، بەو مەیلە ضاڵ وگومڕاە بوون ﴿وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ﴾ عالم بێ، مُرشد بێ، خۆی گومڕاە بێ، بەداوی خۆیەوە بووبێ ﴿فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾ بە کوردی ئەڵێ (خەڵکی شێت بن، ئەیان بەنە ماڵی شێخان، ئەگەر شێخ شێت بوون، ئەیان بەنە کێ؟!) گەلێ قسەی پڕوپووچ هەیە، عالەمێکی پێ وەرئەگەڕێ ﴿لَهُمْ عَذَابٌ﴾ گران ﴿فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ ئەی چێژن ﴿وَلَعَذَابُ الآخِرَةِ أَشَقُّ﴾ گرانترە، ئەلَمی بە تەواوی دەرك ئەکەن ﴿وَمَا لَهُمْ مِنَ اللَّهِ مِنْ وَاقٍ﴾ ئەوەزۆرە، عالەم بە تەمای ئەوو ئەم، خۆیان لە خوا کردیە، عاقبەت نائومێد بووین، بە فەریادیان نەگەیشتیی، لە عذابی خوای وقایەو حفظیان پێ ناکرێ، ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ﴾

وەصفی حاڵی کورت ومفید مناسب، تقوی و پەرهێز کاریە لە شهوات، چ مشروبات، چ مأکولات، تحمّلی مشاق لە ڕێی خوا ﴿تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ أنهاری خۆی، (نیل) و میل نا، سەروچاوەیان معلوم بوو. أنهاری ئاو، أنهاری لبنیّات وعسلیّات وطُهریات، هەرچی شایەنی وێ بێ، ئەوەندە زۆرە، أنهاری لەبەر هەڵدەستێ. ﴿أُكُلُهَا دَائِمٌ﴾ ئەوەی لەوێ قابل بێ بوخرێ (لا ینقطع)ە، خلاص نابێ، بەهەموو دەم میوەی چاکی هەیە. ئەمڕۆ لە دنیاش وایە، میوەی (آسیا) بچی بۆ (أمریکا) ئی (أمریکا) بۆ (آسیا) میوە لاینقطع ئەبێ، وەکذا سبزە، وسائط سریع تر ببێ، ئاسانتر دەبێ ﴿وَظِلُّهَا﴾ سایەی گەڵای دارەکانی کە ناوەرێ، دائمی یە. دائما أهلی بەهەشت لە ژێر سایەی درەختان بە إسراحەت ڕایی ئەبوێرن ﴿تِلْكَ﴾ ئەو جنّەتە خوڕەم ودڵ گوشایە ﴿عُقْبَى الَّذِينَ اتَّقَوا﴾ کە ألآن بۆ وان، حاضرو مُهیّایە، هەندەسەی گیرایە، دەستی پێ کرایە، با لە قصور و باغاتی زیاد کرێ تا ڕۆژی خلود ﴿وَعُقْبَى الْكَافِرِينَ النَّارُ﴾ (نار) بەس نیە؟ کە گوتت (نار) ئەبڕێتەوە، نە أنهارە، نەجۆو جۆبارە، نەدارو، شکۆفەو، أزهار وأثمارە، نەسێبەرە، نە نەستاە!

﴿وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ﴾ ئەوانەی ئەهلی چاکەو وطالبی حەقن ﴿يَفْرَحُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ لە شکوك و أوهام و خرافات دەردەچن، ضمیریان راحەتئەبێ، مسرور ئەبن بە نَیلی حەق ﴿وَمِنَ الأَحْزَابِ﴾ بعضِ لە أهلی کتاب کە تَجربیان کردیە، دینیان کردیتە قومیّەت ﴿مَنْ يُنكِرُ بَعْضَهُ﴾ ئەوەی مُخالفی مەیل وفکریان بێ، ئەوەی عەیبیان دەرخە ذاتاً ڕۆسای دینی یهودو نصرانی، بۆیە کەیفیان بە قورآن نایە. عجایب ئەوە ئەو امەتەی کە قورآن ئارەزوو ئەکا، لە دەست ئەوانە، قورتاربن، لە أسارەت نجاتیان بێ، دوژمنی قورئانن ﴿قُلْ إِنَّمَا أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللَّهَ وَلاَ أُشْرِكَ بِهِ﴾ شَيْئاً، ئێوەش ئەتانەوێ بتان پەرستن، قبوڵتان کەن، بە أریاب ﴿إِلَيْهِ أَدْعُو﴾ دەعوەتی أنام بۆ لای ئەو ئەکەم، هەر ئەو ڕەبیانە هەر ئەو إلاهیانە، کەس نەپەرستن، کەس بەخوا نەزانن، إلاّ ئەو نەبێ، طبعا ئەوەش لە طبعی ئێوە گرانە. مُوافقی مەیل و مزاجتان نیە ﴿وَإِلَيْهِ

مَآب﴾ ئەمری کُلّی عەبدێ هەرچی هەبێ، رجوعی بۆ لای ئەوە، ئیتر کێ إتخاذ ئەکەن بە شەریك؟ (بیضاوی) وەك لە (روح المعانی) وەرئەگیرێ ئێرەی خاص کردیە، ئی (مَتاب) عام، لە جنابی رسالەت و مخاطبەکانی زۆریان قسە لێ کردیە، فی الحقیقەت ئەگەر رعایەتی تۆبەی تێدا نەبێ، معکوس مناسبە، ئێرە (عام) ئی وێ (خاص) ﴿وَكَذَلِكَ أَنزَلْنَاهُ﴾ قورآن ﴿حُكْمًا عَرَبِيًّا﴾ صریح و فصیح، بێ مجاملاتی سیاسیّ و نزاعاتی قومی و نفاقی، کلامی حاوی لەسەر أحکام، أمر ئەکا بە وەفا بە عهد، مقابلەی خراپە بە چاکە، خوف و خشیەت لە خوا، محاسبەی نفس لە ترسی ڕۆژی جەزا، ئەوان لە چیاوو ئەرزی بێ ئاوو بەردی بەدترن. وە إلاّ ئەبا بەو قورآنە حکمدارە، زیندی بوویانەوە. ینابیعی حکمەت لە دڵیان دەرکوڵی، بکەونە سێرو حرکەی علمی و عملی ﴿وَلَئِنْ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ﴾ مەیلی إظهاری خوارق، إیجابەیان بە نوادر ﴿بَعْدَمَا جَاءَكَ مِنْ الْعِلْمِ﴾ علمێ نافع بە أموری مُقرّرە، بە ملکوتی سماوات و أرض، بە أصول و فروع و أحکام، أحکامی عالیە، راقیە، شریفە. موافقی مەیلی مەردان بە ناموسان، بە کرامەت و عزەتی نفس، أحکامی رُقّاص و مُغنّی یان نا. وەزانانەدت توالی مُعجزات حسب إقتراح الامّة، ضررە دەرکەی فکرو مجاهیدەیان لێ ئەگری ﴿مَا لَكَ مِنْ اللَّهِ﴾ لە طَرَف ذاتی أقدس ﴿مِنْ وَلِيّ﴾ ناصر ﴿وَلاَ وَاقٍ﴾ وقایەت کا لە أموری سیاە. مع الأسف پاش زەمانی رسالەت بە کەمێ، أمّەت ڕوویان کردە غەیبیّات، مەیلیان دا بە خوارق، لە هەموو لایە فێریان کردێ، ڕاست و درۆ تێکەڵاو بوو، دەستیان لە نظرو عمل هەڵ گرت، گاهی بەناوی قرابەت قیودیان شکاند، دەمێ بە ناوی سوننەت، دەست وپای أمّەتیان بەست، نەگوێ یان لە ئایاتی قورآنی بوو، نە چاویان لە ئایاتی أکوانی، تێك بەر بوون، أجانب فرصەتیان دەست کەوت، لە آیاتی خلق وإیجاد کراوە، چیایان کۆڵی، کردیانە جادە، لە أعماقی أرض معادن و غازات و أنهاریان هینادەر، جهنەمێ وەك ئاوروپایان کردە بەهەشت، جَلبی أرواحیان کرد، ئەوا لەگەڵ (أموات) قسە دەکەن، تەماشای تفسیری(طنطاوی) کە...

جا مع الاسف ئێمە بێ خودان ماینەوە، بێ وَلّی و بێ واقی، هاوار (بانی مارانی) فەریاد (کەڵکە سماقی)! پاش طعن لە ئایەتی، طعن بۆ ذاتی هُمایون رسالەت پەناه، لکن طعنی بێ وەجە ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً﴾ زۆر ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ لە پێش تۆو إرسالی تۆ ﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا﴾ فوق العُشرة بَل فوق العادة، ﴿وَذُرِّيَّةً﴾ نێرومێ.

تعدّدی خێزان، تلذّذ بەوان چ منافاتی هەیە، لەگەڵ رسالەت و نبوّەت؟ ئەگەر (عیسی) و (یحیی) بێ ژن بوون، (موسی) و (إبراهیم) صاحبی عائلە بوون، مع أنّهُ بێ مەیلی (عیسی) و (یحی) لە موجباتی طبعی بووە، یەکێ نیوە بشر، یەکێ محصولی پیری، قیاسی (زکریا) و (إبراهیم) نظر بە زەمان لێك ناکرێ. لە بعضێ نُقول دەرئەکەوێ، عومری (إبراهیم) رۆژی (خَتنی) بە قدری عومری (زکریا) بووە، لە رۆژی دوعا، بۆ وەلد بوون، کەوابێ (یحی) نابێ بە (إسحاق) وە (إسحاق)یش متزوج و أولادی وأعقابی زۆر بووە. ئەو ئایەتە لە (مدنی) ئەکا، إلقائاتی إسرائیلیەکانە. دەرزی لە چاوی خەڵك ئەبینن، گاسنی لە چاوی خۆیاندا نابینن! مسئلە مسئلەیە فطری یە. تعدُّد دەخلی بە (حِلّ) و (حُرمەت) نیە، مَدار مُراعاتی مصلَحەتە. (سیدی ئالوسی) قسەیەکی هەیە، ئەگەر ئی خۆی بێ، هەزار ئافەرینی لێ بێ ـ(فی الحقیقەت تعددی زوجات، زێدە (سیّبات) حالّی إنسان، مخالفی سرّ و عَلنی دەردەخات، لەو تعدّد و أحوالّی أمهات المؤمنین دەرئەکەوێ، جنابی رسالەت پەناه، کوو لە دەرەوە (رسول) بوە، لە مالّیش (رسول) بوە، ئادابی مُحسّنی سرو علنی یەك بووە، (معاذالله) ذەرّیە شتێکیان لێ دیبا، لێیان لە هەرا ئەدا) — ألآنیش ئاوروپایی لەو وادی یە هَزیان ئەکەن، بعض لە مستشرقەکانی بە إنصاف جوابێ معقولّیان ئەدەنەوە. حتّی بە جوازی تعددی زوجات، زۆر قدەحیان لە دینی إسلام ئەدا. أمّا بعد الحرب العظمی زوبانیان کورت بۆوە، ملّەتی محارب و مُستعلی إحتیاجی بە تعدّدی زوجات هەیە. لام وایە تعددی زوجات بە حەق رعایەت کرابا، قەحپەخانە کەسێ تیا نەئەبوو ﴿وَمَا كَانَ﴾ نەبووە ﴿لِرَسُولٍ﴾

أيّ رسولٍ فی أيّ قوم و أي زمان ﴿أَنْ يَأْتِيَ﴾ بۆ قومێ ﴿بِآيَةٍ﴾ لە ئایاتی كَوْنیّە و شَرعیّیە ﴿إِلاَّ بِإِذْنِ اللهِ﴾ هەم خالق و هەم شارع، هەر ئەو ئەتوانێ تطبیقی حیاتی تشریعی لەسەر قواعدی حیاتی طبیعی بكا، بە گوێرەی طبائعی أُمم ئایاتی كونیان پێ ئەدا، بَعْدَهُ آیاتی حُكمی ئەنێرێ ﴿لِكُلِّ أَجَلٍ﴾ وەقت و مُدّە لە أعماری أُمَمْ ﴿كِتَابٌ﴾ حُكمێكی هەیە لە أجلی قومی تر ناوەشێتەوە، وەك ئەڵێ، (لكل زمانٍ دولةً ورجال)تتبّعی أحوڵی حیوانات كەن، دائر بە بەخێوكردنی فەرخۆڵە، بنۆڕنە أحواڵی أرض و إختلافی أقالیم وقطعاتی و تفاوتی لیل و نهار و مناخی، تبدّلی فصوڵی شرعی، لە (مصر) داندرابێ، زستانێ لە (كۆ)یە كوو تطبیق ئەكرێ؟ حقا هەرزەمانە نوعە حكمێكی هەیە، هەر حُكمە نوعەزەمانێكی هەیە. بَلاغەتی كلامی، رعایەتی مقتضی الحالِ بۆ لازمە، بلاغەتی تشریعی و وضع أحكام و قواعد و إصلاح و تربیە، مقتضای حالێ و مَقامی گەرەك نیە؟ حاشا لازمترە.

شریعەت بێ تطبیقی فطرەت و طبیعەت نابێ ﴿يَمْحُوا اللهُ مَا يَشَاءُ﴾ لە ئایات لە أحوال لە أطوار ﴿وَيُثْبِتُ﴾ بعض أموری عامە هەیە، مشترەكە، (من أوّلِ الفطرة الی الإنقراض) لا يتبدلُ لا يتغيّرە، بۆ عالەمی حەیوان لازمە، (حقیقةً) علمای كلام ترتیبی جوانیان داناوە، أُموری عامە، أُموری (خاصّةً) بە جواهر، (خاصّةً) بە أعراض، (خاصّةً) بە جنابی أقدس، وەك علمای (منطق) ئەفەرموون (بعض سریع الزّوال، بعض بطیء الزّوال).بعض دائم، بعض ضروری، ذاتی و غیرە ذاتی. بەو نهجە ئایاتی إلاهی، تكوینی وتشریعی ﴿وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ﴾ أصلی لا يتغيّر لای ئەوە، عائدی ئەوە، وەك (قانونی أساسی) كە قوانینی مُتفرّعە، ئەگۆڕێ، ئەو ئەگەر لێی گەڕێ ناگۆڕێ. ئێوە ئەی صنادیدی قریش، ئەی سرامەدانی عەرەب، ئەی رؤسای إسرائیل، طلبی خوارق مەكەن، ڕوو لە ئایاتی علم و عمل و توسیعی علوم و معارف بدەن. زەمانی أوهام و خیالآت تێ پەڕی، دەوری عقلێ و علم و فكرە، دەوری ترقی بَشرە، دەوری (حدس)ە، زەمانی إنتباهە، جا بەرق، بكەنە نبراس، دەركی

کەن، بە دەستی خەن، یَدی بیضاء بنوێنن، لە أعماقی أرض ئاو دەرێنن، جۆگا لە أنهار هەڵبەستن، لە چیاو کێوان معادن دەرخەن، پردان دروست کەن لەسەر بەحران، إنصاف بکەن ئەمڕۆ أحکامی (تورات) و أحکامی (بَرحی) کوو تطبیق ئەکرێ؟ ئەوی علمی بە حکمتی خوا بێ، ئەزانێ قانونی (بَرحی) قانونی إلاهی نیە. ئەی (سَلَفی) تۆچۆن لە إدارەیی ملك و سلطنت و تدبیری أمورو تدویری حرب، أمّەت مُقیَّد ئەکەی بە (سُنَّەت)؟ بەڵێ سُنَّەتی نبوی هەیە کە لایتغیَّر و مقیَّد بێ بۆ نایکەن؟ بە کەڵەك و سەفینەی شُرّاعی، مُقابلەی أسطول ئەکرێ؟! بە حوشتر بەرابەری سیارە و قطار ئەبێ؟ بە نێزەو مگوار و شیر، پەنجە بازی ئەبێ لەگەڵ طوپ و شەرابنێل و غازی مُخنق؟ ئەگەر أملی نجاتتان هەیە، تەماشای حاڵ بکەن، ماضی چوو، ئەمڕۆ بۆ إستقبال، بۆ إستقلال تێ کۆشن، بنۆڕنە سُونَّەتی خوا، تطوّراتی أمم، إجاباتی زەمان بە قوەتی ڕوحانی و جسمانی، مادّی و مَعنوی بڵند بن، گوێ لە ئایاتی قورئانی گرن، (لوح المحفوظ) چیە؟ چیتان لێ دیتیە؟ ئێمە لە تَدنّی أجنبی لە تَرَقّی، ئێمە بۆ (مَحو) وئەوان بۆ زێدە ثبوت ئەچن! ئیتر چتان ئەوێ؟ بە محضی إرادە، یا بە علم و سعی و عمل شکاندنی أغلالە؟ مَحوو إثبات لە عالەمی خۆمان نابینین؟ وەجهی نازانین؟ تا بڕۆین بۆ(لوح) قوی ضعیف ئەخوا، لَیْلەی نصفی شعبان و آجالی بنی آدەم، لێرە دەخلی نیە. بەڵێ بحث لە آجالی ظاهری یە، بۆچ لادەدەن؟ بۆ ڕوو لە إختراعات ناکەن، بە حکایاتی کرامات و شواذ هەڵ ئەخەڵەتێن. لە جادە بۆ ڕێی پێچووکە و خوارەکە ئەچن، لِأيِّ سَبب؟ ئایەتێکی ڕوحی تیابێ، بۆ حیاتی إجتماعی و شەرەفی زیندەگانی کەڵکی هەبێ، بە مەعنای هیچ و پووچ مەحوی ئەکەن. جا چارە إتحادە، قوەتە، دڵ لە مزەخرەفات پاك کردنەوەیە، سعی حاڵ، إحتراس بۆ إستقبال ﴿وَإِنْ مَا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ﴾ لە عذاب ﴿أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ﴾ کە ئەوان إنتظاری ئەکەن ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ﴾ گەیاندنی أحکام ﴿وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾ مجازت و مُکافات، خوا ئەمێنێ بە ڕەقیب لەسەروان، بەمردنی توو قورتار نابن، هەرکەس

وەظیفەی خۆی بویّ بەجیّ ئێنیّ ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِي الأَرْضَ﴾ بلادی وان ﴿نَنْقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا﴾ وردە وردە ولاّتیان کەم ئەکا، مسلّمان إستیلای ئەکەن، ئەم آیەتە (مدنی)بیّ ئەو مەعنایە موافقە، چ بە مردنی أشرافیان، چ بە مغلوبیان و تقلصی مسیریان، ئەگەر (مەکی)بیّ، ئەبیّ حمل کرێتە سەر أممی سالفە و تنبیە و إیقاضی ئەمانە. ئێوەش أمین مەبن، ئەوی بەسەر وان هات، بەسەر ئێوە دادیّ، مەگەر لە إیمان تدارکی کەن. ﴿وَاللَّهُ يَحْكُمُ﴾ حکمی تکوینی وتشریعی، بحولِ الله عن قریب دەرئەکەویّ، کیّ بەسەر ئەکەویّ ﴿لاَ مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ﴾ کیّ هەیە تعقیبی کا، ببی بە مانع و دافع ورافع؟ ﴿وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾ عن قریب حسابیان ئەبینیّ، تالّووکە مەکە ﴿وَقَدْ مَكَرَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ بە رسولی خۆیان، خەبەرتان زانیوە ﴿فَلِلَّهِ الْمَكْرُ﴾ تدابیری ورد ورد ﴿جَمِيعًا﴾ هەمووی خاصی ئەوە ﴿يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ﴾ چی لیّ بزر نابیّ، إنسان هەر چەند سیاسی بیّ، علمی ناقصە، ناقص العلم لەگەلّ کامل العلم چی پیّ دەکریّ؟ ﴿وَسَيَعْلَمُ الْكُفَّارُ﴾ زۆر دوورنا ﴿لِمَنْ عُقْبَى الدَّارِ﴾ لە هەردوو جهان عاقبەتی خێر بۆ کیّ ئەبیّ؟ ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ بە صراحەت ئەو إقتراح و مقترحە نهایەتە ﴿لَسْتَ مُرْسَلاً﴾ بە کوردی ڕاستە و ڕاست، لەبەرچی؟ چیان بە دەستەوە نیە ﴿قُلْ كَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ بە ئایەتی قورئانی و أکوانی شاهدیم بۆ ئەدا ﴿وَمَنْ عِنْدَهُ عِلْمُ الْكِتَابِ﴾ قورئان ڕەوشت و سیَری أنام، ئایاتی أکوان.

ئەتوانم بلّێم کەسیّ علمی بەو سورەتە ببیّ، شاهدی ئەدا کە صاحبی ئەو سورەتە رسولی خوایە. حقا سورەتێکە پڕ لە ئایاتی نافعە، هەر ئایەتیّ مفتاحە بۆ ئایاتیّ غیرە عدیدە. (سُبْحانَ مَنْ يُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ) حەقی شاهدی ئەدا.

أوّلاً: بَشَر مُحتاجی هدایەتی رُسُلە.

ثانیا: (محمد المصطفى)(ﷺ) رسولی خودایە، (معاذ الله) ئەو رسول نەبوویێ، کەس رسول نەبووە.

ثالثا: ئەوەی رسولی أکرم تصدیقی رسالەت فەرموو بێ، إیمانم پێی هەیە رسولە. ئەتوانم نظر بە أحوالّی روحی و وەقتیان، شاهدی لەسەر رسالەتی (نوح) و (إبراهیم) و (موسی) بدەم، لە حالّیان دەرئەکەوێ، (خیالّیون) نەبوون، حالّیان بە حالّی جنابی رسالەت پەناه ئەچی.

رابعا: (محمد المصطفی)(ﷺ) خاتم الانبیاء والرُّسُلە. (لِکُلِّ أجلٍ کتابٌ) أجلی رسالەت و نبوّەت، نهایەتی بە رسالەتی ئەو هات. شاهدی ئەدەم، زەمانی رسالەت و نبوّەت، تشریعی و غەیرە تشریعی لەسەر ئەو خەتمە، پێغەمبەری ئاخری زەمانی رسالەتە. زەمانی وی زەمانی ترقی عمومیە، زەمانی إدراکی قواعدە، زەمانی دقّەتە لە أموری معتادە، غایەت بە إفادە، زەمانی سقوطی خوارق و خرافاتە، هەر جنابی (محمد)(ﷺ) بوو، یەکەو تەنها مقابلی عالەم ڕاوەستا، کورّەیی أرضی دوژمن بوو، دوامی کرد، صبری نواند، مُوفق بوو. ئەوانی دوای ئەو إدعای پێغەمبەریان کرد، چیان کرد؟ غەیری دەعوەتی پێرێژنانە ئەمەش ئیشێکە، ئیشێ نا مەردانە! لە بەینی (سُجاع) و (کذّاب) ئاشکرایە لەو مەیانە، أمثالی (بها) فەندی، رسولی سلامن؟ وەی مُبارەك نەبێ، لەوەتی تشریفی نا مُبارەکیان پەیا بوە، بەجارێ فتنە و فساد و خلاف بەرپا بووە! بە ڕاستی ئەمانە بەناوی سلام، دوژمنی سلامن. سلام سلامی خوایە، حضرەتی (محمد) (ﷺ) بشارەتی پی دایە (السلام علینا وعلی عبادِ الله الصالحین) لە طرف ئەو إعلان کرایە. مەرذبن، ببن بە عبادی صالّح، صالّحی دونیاو قیامەت، ئەمە خۆیەتی باقی هەمووی هاش و هووش و هەبایە، والسلام علیکم!

وەبعد کُلِ الشّهادة، شاهدی ئەدەم، حضرەتی محمد(ﷺ) زینەت وشکۆهو جلال وعظمەتی دا بە رسالەت. حەقە رسالەت فخر بە حضرەتی محمد المصطفی(ﷺ) بکا، إلاهی شهادەتم قبولّ کەی.

ئەوجا وەرە ناظران چیە بە (وَمَنْ عِنْدَهُ عِلْمُ الکِتاب) کردیە سورەی (رعد) تفسیری تەواو بوو، نۆرەی سورەتی (إبراهیم)ە.

## سورەی إبراهیم

(مكّی)یە، (مَدنی)یە؟ فەرقی نیە، بێ ناسخ وَمنسوخـە ﴿إنَّ الإنسانَ لَظَلُوم كفّار﴾بە ﴿إنَّ اللهَ لَغَفورٌ رَحيم﴾ نسخ نـابێ. نـازانم (عبـد الرحمـانی بنـی زیـدی بنی أسلم) بۆ چی وای فەرموە؟ نسبەت بـە (بـصری) و (كـوفی) و (مـدنی) و (شـامی) ئایـاتی لـە (٥٠–٥٥)ە. إرتبـاطی بەسـورەتی پێـشی وەك سـیّدی (ئالووسی) ئەفەرموی جداً واضحة.

(بسم الله الرحمن الرحيم)

﴿الر﴾ ئەگەر ئاگاداری، ألوا الألبابی، عالِم بە كتابی ﴿كِتَابٌ أنزَلْنَـاهُ إِلَيْـكَ﴾ ئەوەی علمی پێ بێ شاهدی ئـەدا، لەسـەر رسـالەتت، فائـدەی إنـزالی ﴿لِتُخْـرِجَ النَّاسَ﴾ هەموو، یا (مَنْ بَلَغَ الدعوةُ)؟ ﴿مِـنْ الظُلُمَـاتِ﴾ كفـرو شـرك وجهـل وبـێ إدراكی وشعور بە أحوالّی كائنات، بێ خەبەر لە ئایاتی بَیِّنات، لـە ئاثـاری أرض وسماوات ﴿إِلَى النُّورِ﴾ مُقابلی إیمان بە وەحەدەتی خواو علم وشعور بە ئایـات، إسـتفادە لـە موجـودات ﴿بِـإِذْنِ رَبِّهِـمْ﴾ بـە توفیـق وتَیْـسیری ربُّ النـاس ﴿إِلَـى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ ڕێی خوایە، بە قدرەت وغالِب ومُنعِم زۆر ستایش كـراوە. نە إلاهـی زەلیلـە، بـێ خێـرو بێـرە. ﴿اللَّـهِ﴾ واجـب الوجـود، جـامعی، كمـالات ﴿الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ قـسە لـە أفعـالی عبـاد نیـە، مقـامی دەعوەتە. عمومی (ما) بۆ كائنـاتی عَیْنیّـە لـە جـواهر وأعـراض كافیـە ﴿وَوَيْـلٌ لِلْكَافِرِينَ﴾ ئەگـەر كُفریـان بـە خـەلقی خوابـێ، وەیـل بـۆ بۆوانـە؟ قەباحـەتیان چیە؟ ئەگەر ئەڵێن فعلی خوا مُعلّل نیە رسالەت ئـەڕوا، قـسمی أعظـم لـەئایاتی

قورئانی ضائع ئەبێ. ئەوی (طوبی) بکاتە داری سایەدار، ئەبێ (وَیل)یش بکاتە شتێ مُقابلی ئەو. جێ یە وابێ باسی لێ نەکرێ باشە.

ظاهر لە کلامی (إبن جریر) کە تفسیری (وەیل) بە وادیێ هکذایی ئەکا، (مـن) لە ﴿مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾ تبعیـضي یـە. عبـارەتی نقـل ئـەکا تـا عرەبـی زان تێـی فکرن (اَلْوادی الذی یَسیرُ مِن صَدید أهلِ جَهَنَّمَ لمنْ جَحَدَ وَحدانیّتـهُ وَعبـد مَعـهُ غَیرهُ مِن عذاب الله الـشدید) أمّـا مُحقیقـەکان بـە (هـلاك) و (حـرارەت) تفـسیری ئەکەن ﴿الَّذِينَ﴾ ئەو کافرانەی ﴿يَسْتَحِبُّونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا﴾ حتّی وا کـە ترجیحـی ئەکەن ﴿عَلَى الآخِرَةِ﴾ خۆیان لـە متابعـەی هـەواو هـەوەس ناگوێزنـەوە، عـلاوة علی هذا ﴿وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ﴾ منعی عباد ئەکـەن لـە ڕێـی خـوا، لـە ڕێـی ڕاست ﴿وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾ ڕێی خواریان ئەوێ، یـاخود ذمّـی ڕێی خـوا ئەکـەن، ڕێی خوارە، قابلی سلوك نیە ﴿أُوْلَئِكَ فِي ضَلاَلٍ بَعِيدٍ﴾ غـەرقن تێـی دا خۆیـان گومراهن، خەڵقیش گومراە ئەکەن، وەریـان ئـەگێڕن، ئەوانـە نایەنـە سـەر ڕێـی ڕاست أبداً. ئەوانە ألآنیش لە (ئاوروپا) لە (أمریکا) زۆرن، تشویهی دینـی حـەق ئەکەن، أنواعی کارەهـایی ناشایـستە، نـسبەت بـە حـضرەتـی رسـالەت پـەناە ئەدەن. لە وەقتی إستلای إنگلیز، حاکمی سیاسی کۆیە (ڕەندیل)ناو، تەماشای ئێمەی ئەکرد، لە قیام وقعود وئادب وخواردن ولباسی آدەمیانـە تعجّبـی ئـەکرد ئەی وت: لە مەکتـەب ئێمـەیان دەرس ئـەدا، (کـورد) قـەومێکن، وەحـشی، آدم خور، وەك گورگی هار!" ئەمانەش رۆسای دینی (عیـسی)ان، رسـولی سـلام؟!

﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ﴾ ئاوروپـایی إیمانیـان بـە (موسـی) و (عیسی) هەیە لەگەڵ إختلافی لغەت وقومیەت. رسولی عەرەبی بـە (فرسـانی) و (عبری) چۆن وەحی بۆ دێ لە ناو قومـێ عـەرەبی؟ إبتـدای رسـالەت لـە نـاو چ قومێکە بە لسانی وان ئەبێ، جنابی رسالەت پەناە، هەرچەند عمومی رسـالەتی هەیە، لکن بعثتی بە لُغەتی عەرەبە، عرەبێکە نـشأتی لـە نـاو وانـە. نـازانم کـێ خیاڵی ئەوەی ئـەکا، جنـابی رسـول بـە لـسانی هـەموو شـعبی عـەرەب إرسـال کراوە؟ عەجەب ئەوەیە، لـە (بحـر) نقـل ئەکـەن (سـببی نـزولی ئایـەت-گۆیـا-

قریش وتوویانە (بۆچی کتێبەکانی دی هەموو أعجمیە، ئەو کتێبە عەرەبیە؟)، لە (أبو بکری واسطی) نقل ئەکەن قورئان (٥٠) لغتی تیایە لە غیری عەرەبی بەس (فارس) و (نبطی) و (حبشی) و (بربری) و (سُریّانی) و (عبرانی) و (قبطی) ذکر کردیە، (کوردی) و (تورکی) بحثی نیە! ﴿لِيُبَيِّنَ﴾ ئەو رسولە کە ﴿لَهُمْ﴾ بۆ قومی خۆی. چۆن ئەبێ قوم عەرەبی، لسان عبری؟ ﴿فَيُضِلُّ اللَّهُ مَنْ يَشَاءُ﴾ کێ؟ ﴿وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ﴾ لە تفاصیلی ئایات علَلْ دەرئەکەوێ، وإلاّ دوودڵی، مساوی بۆ قبوڵی حق، یەکێ بەهەوەس کفری تیا خلق کا، یەکێ إیمان، نایەتە خیاڵ وتصوّرو مستحیلە لە جنابی (حق)، (رَبُّ العالَمین، أرحم الراحمین، مُرسِل الرُسُل، هادی السُبل) ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ حکیم کاری بێ جێ ناکا، وەلَو، قادر وقهّاریش بێ ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى﴾ (علیە السلام) ﴿بِآيَاتِنَا﴾ بۆ قومی خۆی، بە چ لسانی؟ بە (هندی) و (دَیلمی)؟ حاشا ﴿أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ﴾ خاصةً ئەو ظُلماتی بە سایەی خوارق کە وتبوونی ﴿إِلَى النُّورِ﴾ علم، نَظر، فکر، أخلاق، تربیە، إستفادە لە ئایاتی (کَون)یە ﴿وَذَكِّرْهُمْ بِأَيَّامِ اللَّهِ﴾ بەو أیّامەی کە وقائعی گەورە گەورەیان تیا واقع بووبوو، ئی خۆیان، وەئی سائری أقوامی رُسلی سالفە ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ﴾ لەو تذکیرە بۆ إنسانێ گوێدێر ﴿لَآيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ﴾ تەماشای أحواڵی مؤمنەکان کەن، چۆن صبریان گرتیە؟ لە چ شدائد ثابت قدم بووین؟ أهوالیانبەسەردا هاتیە، تا گەیشتینە دەرەجەی یَأس، ئێوەش لدی الأیجاب صبر کەن ﴿شَكُورٍ﴾ تەماشای نجاتی مؤمنەکان وگرفتاری أعدایان کەن، أدای شُکری خوای بکەن وبزانن، عاقبەت بۆ وانە ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ﴾ ئەمەی بێ شك بەشێ إسرائیلینە. ﴿اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ گەلێ کەس، گەلێ قوم، أیّامی محنەتیان لە فکر نامێنی، مَغرور ئەبن، ئەکەونە ناو بحری شهوات، دوایە خراپتریان بەسەر دێ. کەم کەسێ، کەم قومێ، قومێ بە طالع وبەخت و شانس و عقلێ، أیّامی سابقەیان لە یاد ناچێ، دائم الأحتراس ئەبن، لە مَنکوبی ومَغلوبی، غایەت ئەترسن، ئەمڕۆ غەمی پاش هەزار ساڵ ئەخۆن ﴿إِذْ أَنْجَاكُمْ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ﴾

خۆتـان ئـەزانن چ جبّـار وقهّـار ومتـسلّط بـوون لەسـەر ئێـوە ﴿يَـسُومُونَكُمْ﴾ دەرخوارديان ئەدان ﴿سُوءَ الْعَذَابِ﴾ أنواعى مَراتبى شدّتى، خۆتان ئەيزانن، لـە هەمووى زەحمەت تر ﴿وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ﴾ تـا إنقـراض بـن، پياوتـان نـەمێنى. ﴿وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ﴾ ئەوانيان ئەهێشتەوە، ألبەتە غرضـى نالايـەقيان بـووە، لاشك خۆيان ئەيانزانى ﴿وَفِي ذَلِكُمْ﴾ لەو نجاتـە ﴿بَلاَءٌ﴾ إمتحانـە، إبتلايـە بـە نعمەت، شُكرى ئەكەن، يا لە فكرى ئەكەن؟ ﴿مِنْ رَبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾ گـەورە مُـوجبى شُكرىَ بێ پايان. نجات بوون لە عذابى ذلّەت، فوق النّعمەتە ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ﴾ بۆ ئێوە، وەكذا بۆ هەموو عالەم، إعلان ئەكا، لەو مَقامە (تَأَذَّنَ) قياس لە (قال) ناكرێ ﴿لَئِنْ شَكَرْتُمْ﴾ بە لِسان نـا، بـە عمـل ﴿لأَزِيدَنَّكُمْ﴾ لـە نجـات ئەچـن بـۆ (إستيلاء) ﴿وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ﴾ خۆتـان هەڵخەڵـەتێنن، مـادام خـوا نجـاتى دايـن، لـە فرعون، نايەڵێ تووشى بەلاّيان بين، بۆ دفعى إعدامان، حاجەت بـە سـعى ئێمـە نيـە ﴿إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾ واگرفتـار ئـەبن دەرناچـن. واقعـاً قـومى إسـرائيلى، شكرانەى خوايان نەكرد، دووچـار بوونـەوە، وەكـذا قـومى عـەرەب، پـاش عـزّو إستيلاء كەوتنە ذلّ وإستعباد ﴿وَقَالَ مُوسَى﴾ ئەى أمّەتى محمد گوێتـان لێ بـێ ﴿إِنْ تَكْفُرُوا﴾ كفرى إيمانى، يا كفرى إحسانى ﴿أَنْتُمْ وَمَنْ فِي الأَرْضِ﴾ إلى الأبـد ﴿جَمِيعًا﴾ بلا إستثناء فَردٍ أو قَوْمٍ أو شَعبٍ ﴿فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ﴾ لە ئێوەو سـائرى مَنْ في الأرض، وە لە شُكرتان وەإيمانتان ﴿حَمِيدٌ﴾ لـە ذاتـى خـۆى، جـا مـەڵێن (ئێمە خۆشەويستى خـواين، عنايـەتى دەربـارەى ئێمـە زۆرە، ذُرارى رسـول و (رُسـل)يـن، أوليـاء الله وأحبّـاءُ الله وأبنـاءُ الله يـن) ئـەوا جـوو هەڵخەڵـەتان، موسـڵمان بـۆ؟ مـادام أيمانيـان هـەبوو، رسـوليان خـاتم الرّسُـلە، كتێبيـان آخـر الكُتُبـە شـرعيان نهايـەتى شـرائعى سماويـە، نـە ئـەبا بـە إسـرائيليات خۆيـان بفريوێنن، دواى هدايەت و نوور، ظلمـات تـراكمُ كـا بەچـى إزالـە ئـەكرێ؟ ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ﴾ ئەوانى پێش ئێوە لە أممى سالفە ﴿قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ﴾ نوعاً ما أحواڵى وانمان زانى ﴿وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ﴾ پاش قـومى (نـوح) و (عـاد) و (ثمـود) ﴿لاَ يَعْلَمُهُمْ﴾ بـە تفـصيل كَمّـى وكَيفـى ﴿إِلاَّ اللَّهُ﴾ ذُو العلـم

المحيط. لازم نیە هەموو نَسب مجهول بیَ، لکن (کَذَبَ النسّابون) ڕاستە، (خاصةً)، زەمانی بێ قَلم وتأریخ ﴿جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ﴾ خُلَصی أقوال ئەمەیە، ئایاتیان بۆ نواندن ئەوی إقتراحیان کرد، بەجێ یان هینا ﴿فَرَدُّوا﴾ قەومەکان ﴿أَيْدِيَهُمْ﴾ دەستی خۆیان ﴿فِي أَفْوَاهِهِمْ﴾ تەماشای (ایدی) و (أفواه) کە بە إعتباری (حقیقەت) و (مجان) وەمرجعی (ضمیر) چەند قسەی أفواهی تێدایە؟ جێی تعجُّبە. رەنگە إنسان ئەنگوستی خۆی بگەزێ لە تأثُر و جبرەت، وەکەس معنای (فی) بە ظرفیەت نەفەرمووە، هەر بە (علی) و (إلی)، با منیش دەستێکی تێ وەردەم، زوبانی قَلمی بۆ بە حَرکە خەم، (ضمائر) بۆ قَوم، (أیدی) و (أفواە) بە مەعنا دەست و زار، (فی) ظرفی، ظاهر وایە لە وەقتی دەعوەتی (رُسُل) ئەمانە دەستی خۆیان هاوشتبێتە ناو زاریان و هاتوچۆیان پێ کردبێ، لەگەڵ دەنگ، بە هەیئەتێ، ناشیرینی مستهزئانە، رُسلیان مشوّەش کردینە، لەبەر هاووهوویی غەلدەغەلدە، کەس گوێی لە قسەیان نەبووە. ﴿وَ﴾ وە بە صریحیش ﴿قَالُوا﴾ بە رُسلیان ووتیە ﴿إِنَّا كَفَرْنَا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ﴾ بە رسالەت، بە دلائل، بە شریعەتتان ﴿وَإِنَّا﴾ بالخاصة ﴿لَفِي شَكٍّ﴾ شکێ گەورە ﴿مِمَّا تَدْعُونَنَا إِلَيْهِ﴾ لە کلمەی (لا إلهَ إلاّ الله) خوا هەریەکە نابێ بە دوو ﴿مُرِيبٍ﴾ ئەمان خاتە قلق وإضطراب، دڵمان بۆ توحید ناچێ ﴿قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ﴾ لە وەحدانیەتی إلاهی شك وریب وتردّد هەیە؟ ﴿فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ عالەم شاهدە، نَظمی ناطقە بە وحدانیەت ومُبْدعی ﴿يَدْعُوكُمْ﴾ لەسەر زوبانی رُسُل ﴿لِيَغْفِرَ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ﴾ لە سیّئاتی سابقە، علمای کلام ئەفەرموون (وحدانیەت بە وقولی رسول إثبات ئەبی) بەڵێ پاش تصدیقی رسالەت وایە. أمّا أصلی وجود بە قول إثبات نابێ، لەبەر (دَور).

بە تەواوی شرائعی رُسُل نازانین، تابڵێین (مِنْ) (تبعیضی)یە یا (بیانی) یە؟ نظر بە حدیثی رسالەت پەناە، لە دین، (مُبَیِّن)ە (الإسلام.. یَجُبُّ ما قَبْلَهُ حُقوق اللهِ وحُقوق العِباد) ﴿وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ أجلی طبیعی، فی الحقیقەت دین، بۆ حیاتی إجتماعی وەك (طِبّی واقی) وایە،، (سلب) و (نهب) و (قتل) و

(حرق) كەم ئەبێ، یا نامینێ. ئەگەر أحكام بە حَق إجرا بكرێ، دوشمن ناتوانێ طماعیان تێ كا، ما دام بە إتفاق بن، رابطەی إخوەتی دینیان بە قوّەت بێ، چ جایە بمرن؟ أمەتێ دی، زیندی ئەكەنەوە. عومری نوێیان پێ ئەبەخشن. لكن ئەو حیاتە بەو روحە زۆر كەمە. هیچ أقوامی بعد الأیمان بە تەمامی رعایەتی دین ناكەن، خلافەتی إسلامیە كە روحێ مجرّد بۆ حیاتێ خۆش بوو، مع الأسف مدەیی تشكلی وتكاملی وتوقفی وإنحطاطي وە إنقراض لە (٣٠) سالْ تێ نەپەڕی! ﴿قَالُوا﴾ قوم ﴿إِنْ أَنْتُمْ إِلاَّ بَشَر مِثْلُنَا﴾ فطرةً، چ زێدەییتان نیە. جێی تفاضُلی إنس ومَلَك نیە، مع أنّە ئەوانەی ملائكە بە (بنـاتُ الله) ئەزانن، مَلَكیان بە سەد هەزار درەجە، وەك (مُعتزلی)یان، لا لە إنسان گەورەترە. قَومێ عبادەتی گاو و سەگ بكەن، ئەبێ شرفی بشریەتیان لا چ بێ؟ ئێو وەكی ئێمە رسول نین ﴿تُرِیدُونَ﴾ بە دەعوای رسالەت ﴿أَنْ تَصُدُّونَا﴾ وەرمان گێڕن ﴿عَمَّا كَانَ یَعْبُدُ آبَاؤُنَا﴾ رئاسەتی دینی، گەورەیی ببێتە ئی ئێوە ﴿فَأْتُونَا بِسُلْطَانٍ﴾ بُرهان وحُجّەت ودەلیلێ ﴿مُبِینٍ﴾ واضح وئاشكرا، تا ڕێی قسەمان نەمێنێ. ئەو (بیّنات)ی (إرائە)یان كردبوو، لایان چ نەبوو، إقتراحی زیاتریان كردیە، تا گەیشتینە (أرِنا الله جَهرةً) ﴿قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ﴾ بە نەرمی ولُطفی، بەلێ وایە ﴿إِنْ نَحْنُ إِلاَّ بَشَر مِثْلُكُمْ﴾ معلومە دەعوای مَلَكی ناكەین ماهیەتمان ئێكە، أمّا تفاوتی عقلێ وعلم وهۆش وتفكّر وتدبُّر إنكار ناكرێ ﴿وَلَكِنَّ اللَّهَ یَمُنُّ عَلَى مَنْ یَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾ لە أوّلی نشأت بە مواهبی فطری، دووەم بە مأثری كسبی، إمتیاز ئەداتە بعضێ عباد، بە قوایە زۆر تفوّقی ئەكا، حتّی بعضێ لە علمای حكمەت إدّعا ئەكەن أرواحی بشری مختلفی باطاهیەتن، نفسی مجرّدی رسول وحكیم، نابێ وەك نفسی گاوان وشوان بێ،كوردی ئەلێ:(تا خوا كێوان نەبینێ بەفریان ناوێتێ) سبحان الله بَشَر لەگەلْ بَشَر چەند خراپە، بَشَر چەند چاو لە دەرە، چەند لە چاكەی یەكدی بێ خەبەرە! مع أنّە إنسان بۆ إنسان روحە، أعضایە، بۆ دەردی دەرمانە بۆ نەخوشی طبیبە، بۆ فقیری دەولّەتە، بۆ بێ دەسەلاّتی قوّەتە، بۆ بێ كەسی كەسە، بۆ هاواركەری فریاد رەسە، یارە،

یاوەرە، غەم خۆرە، غەم بەرە. وەك (سَعدی) ئەڵێ: (بَنی أدەم أعضایی یەکدیگرند...) منداڵێ بگریە، بەکێ ژێر دەبێ؟ بەکێ دەسرەوێ؟ خلاصە بَشَر بێ بَشَر چی پێ ناکرێ. وەقتی درەو بێ سەپان دروونە ئەبی؟ مع هذا دائم لەگەڵ یەك عَدون، چاوەنوڕی ملائکە و جنۆکانن، منەتی یەکدی نازانن. حقیقە إنسانێ چاك لە هەموو عالەم بۆ إنسان چاکترە. إنسانی خراپ بۆ إنسانی لە هەموو شتێ خراپ ترە. ئەگەر رۆسای أدیان و أقوام نەختی باش بان، قەت إنسان لەگەڵ یەك وا بەد رەوشت نەدەبوون. هەریەك بە ناوی شخصی، بوون بە دوژمنی یەك، بێ عهدو وەفا و نمەك! ﴿وَمَا كَانَ لَنَا﴾ نەبووە ونابێ، لایجوز لایصح ﴿أَنْ نَأْتِيَكُمْ بِسُلْطَانٍ﴾ بە گوێرەی إقتراحتان ﴿إِلاَّ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ إذنی تکوینی عائدی ئەوە، إرادە بکا ئەیکا ﴿وَعَلَى اللَّهِ﴾ دونَ غَیرِه ﴿فَلْيَتَوَكَّلْ الْمُؤْمِنُونَ﴾ لە أیّامی محنەت صبر گرن، إعتمادیان لەسەر خوا بێ ﴿وَمَا لَنَا إِلاَّ نَتَوَكَّلَ عَلَى اللَّهِ﴾ مُوجب وسبب چیە؟ ﴿وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا﴾ هەر قەومە بە گوێرەی ظروف نوعە رێیەکی هەیە، پێیدا بڕوا ئەگاتە مقصد ﴿وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَى مَا آذَيْتُمُونَا﴾ أذیّەتی (ما) بە الأذیّة ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلْ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾ مُؤمنی مُتوکل دَوام کات ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەوە أساساً قولی رۆسایەکیانە، ئەوانیش بێ تَبَعە چیان پێ ناکرێ. سَوادی أعظم أمر بەریانن کەوابێ قول قولی هەموویانە ﴿لِرُسُلِهِمْ﴾ هەر قومە بە رسولی خۆی دەگوت ﴿لَنُخْرِجَنَّكُمْ﴾ لە گەڵ أمّەتتان ﴿مِنْ أَرْضِنَا﴾ دەرتان ئەکەین ﴿أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا﴾ یا ئەگەڕێنەوە، دێنەوە سەردینی ئێمە، دینی خۆمان. ئەوجا أین المفرّ؟ کوو لە دەست قەومیان نجاتیان ئەبی؟ گەڕانەوە نەممکن، ئاوەڵەکردنی دارو دیاریش تحمّلی مُشکلە، فما النَّذیر؟ ﴿فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ﴾ لەو وەقتە وەقتێ بێ چارەیی و بێ دەسەلاتی ﴿رَبُّهُمْ﴾ بە صورەتی قطعی ﴿لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ﴾ دیارە ظالم کێنە، وە لە آیەتی ﴿وَلَنُسْكِنَنَّكُمْ الأَرْضَ﴾ لە داروديارى خۆتان ﴿مِنْ بَعْدِهِمْ﴾ پاش هلاکیان دەرئەکەوێ مُراد ئەوانەن کە عنادیان لەگەڵ رُسُل ئەکرد ﴿ذَلِكَ﴾ ئەو دوام وسُکونی ئێوە فی الأرض پاش فەوتانی قوم، ﴿لِمَنْ خَافَ مَقَامِي﴾ لە

مَقامی خوا مَرتەبەی ألوهیّەت ورُبوبیّەت و خالقی بترسێ، لای بە حورمەت وجلال بێ، شریکێ بۆ صاحبی مقام پەیا نەکا. حضرەتی کبریائی نەهێنێتە ریزی ممکنات وطبیعیات هیچ شت لە ممکنات و طبیعیات، نەباتە مقامی إلاهی. مع أنّه هیچ أمّەتێ هیچ قومێ ، حتّی حُکمای إلاهیّون بە تەواوی حفظی ئەو مقامەیان نەکردیە، سَوادی أعظم لە (ملیّون) لەو جهەتە، لە مشرکان خراپترن ﴿وَخَافَ وَعِيدِ﴾ وە لە وەعید وإنذاری خوا بترسن ﴿وَاسْتَفْتَحُوا﴾ هەردوولا، یا رُسُل ئەوە أظهرە، جنابی حەق دوعای قبولّ کردن. ﴿وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ﴾ مُتَکبِّر عالِ ﴿عَنِيدٍ﴾ حەق نەسەلمێن بە هیلاك چوون، تکبّرو تجبّر بە نعمەت، غرور ئەدا، بێ تأمّل وتفکّر وإحتراز ئەبێ صاحبی، ئاخری ئەفەوتێ، ئەوە بۆ دنیای ﴿مِنْ وَرَائِهِ﴾ دوای ئەم جبّاری عنیدی قاسی یە، لە داری عُقبا بۆ ویە (بۆی دێ) ﴿جَهَنَّمُ﴾ أنهُ دوواوەی هەمووی ئەگیرێ، نجاتی نابێ. تفسیری (ورا) بە (قُدّام) بە (بین یَدیە)، لام خۆش نیە، إحتیاجی بە تأویل هەیە. سَواء مشترکی لفظی بێ بە مەعنا (قدّام) و (خلف) بێ، یا معنوی بێ، بە مەعنا (ما تواری) و بزر بێ، یعنی جهەننەم و قَعری ﴿وَيُسْقَى مِنْ مَاءٍ صَدِيدٍ﴾ کێم و خوزاوك لە بَدَل موادی کۆولی (أشربەی روحی) ﴿يَتَجَرَّعُهُ﴾ قوم قوم بە یەك جُرعە ناتوانی نۆشی گیانی کا ! ﴿وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُ﴾ لە گەرووی ئەمێنی، نێزیك نیە بە سهولەت بە گەرووی دا بچێتە خوار ﴿وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ﴾ أسبابی مردن ﴿مِنْ كُلِّ مَكَانٍ﴾ لە هەموو أطرافی دنیا، لە هیچ جهەت خۆی نەدەپاراست لە آخرەت بالمناسبە، لە هەموو جهەت أسبابی مردنی بۆ دێ، هەر بمرێ (جبّاری عنید) بە کوردی پێیان ئەلّێن (لووت ولمۆز، قەپۆز بلّند) خصوص دوای ذلّەت ببێتە عالی، مُتجاوز لە حَدْ ﴿وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ﴾ زۆریش حەز ئەکا بمرێ، أمّا نامرێ، زەمانی مردن پۆیی (لِکلِّ أجلٍ کِتاب) ﴿وَمِنْ وَرَائِهِ﴾ لەگەلّ ئەو هەموو آلامە ﴿عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾ تیر، خەست (کماءٍ صدید) نَظَر بەو مائی مقطّرە، حدّی نەبێ (کوثر)ە ! ﴿مَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ﴾ مرّبی ومنعمیان —لای حَقیر— کُفرانی نعمەتی وەحدەت و إتفاقە، شُکرانەی خوا ناکەن، بە تَکبّر وتجبّر وعناد وغرور،

متفرق ئەبن جەنگی خانەگیان ئەکەوێتە، مابَین.أصلی تفرقە لە ئاراء ومیولیانە، وەظهوری وخامەتی لە أعمالیان دەرئەکەوێ، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ﴾ مشکی خۆی قوّەتی نیە، سووتاوە ﴿اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ﴾ بە مشکی یەکە، کەبا، بیبا بە سُرعەت ﴿فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ﴾ لە رۆژی رەشەبا، رەشەبا لە بعضە أیّامان زۆر زۆر بە قوّەت ئەبێ، إنسان ئەترسێ بُنیانی مَرصوص لە بناغەوە هەڵکەنێ! ﴿لاَ يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا عَلَى شَيْءٍ﴾ لە رۆژی لێ قەومان، لەوی کردوویانە لە زەمانی کُفران، وایان زانیە باشە، کەڵکیان ئەگرێ، ئەوێ رۆژێ فائدەیەکی لێ ئەبینن. لکن هیچی لێ وەرناگرن. قومی جَبابِرە رێك ناکەون، إنسانی مُتکبّری عَنود إستشارە ناکا، لەبەر غرور فکری إصابەی نابێ، هەموویان خائب وخاسر دێنە دەر ﴿ذَلِكَ هُوَ الضَّلاَلُ الْبَعِيدُ﴾ زۆر دوور لە حەق صواب ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ أیّها الرّائی، الجبّار، العَنید، نظر کە ﴿أَنَّ اللَّهَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ لە ئایات بۆتان معلوم نەبوو کەخوا خەلقی ئاسمان وأرضی کردیە؟ ﴿بِالْحَقِّ﴾ بە وەجهێ لایق چ نظامێکی هەیە، بۆ ئێوە، چەند أنواعی نعمەتی تیایە، نازانن خالقی واعظیم وغالب، لەسەر عُلویّ وسُفلی، غەنی لە ئێوە، چ پەکی لەسەر ئێوە نەکەوتووە، إسرائیلین، عەرەبن، إسماعیلیین، کوردن، تورکن، أولادی رُسُلن، أحفادی گاوانن، (کُلُّهُ سُوی) ﴿إِنْ يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ﴾ ئەتانبا، ئەفەوتێن، مَحوو نابوود ئەبن، وك رَمادی بابردی ﴿وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ نوێ، علاقەی لەگەڵ ئێوە نەبێ. چەند شعوب فەوتان، دوای وان، أقوامی دی تشکُّلیان کرد. چ بوو؟ أرض وآسمان وەك خۆیەتی. ئەمە لەنگەرێ، أرض وآسمانە، ئەمە (حجّةُ الله) یە، ئەوە (آیة الله) یە، (ناقةُ الله)یە، بە ئەمری ئەو ئەڕوا، دەوری دۆڵابی فلك وەك خۆیەتی. ﴿وَمَا ذَلِكَ﴾ ئەوی ووترا ﴿عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾ زەحمەت نیە، بە ئاسانی ئەی کات، گرانی مادّی، معنوی نیە. ذلّی ئێوە دیارە، جَبروتی بە لاف و گەزاف وتهوّر وبۆفە. ئەوا هلاك کران، زیندوو بوونەوە ﴿وَبَرَزُوا لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ رئیس ومرؤوس، تابع ومتبوع، ضعیف وقوی، جبّار ومجبور ﴿فَقَالَ الضُّعَفَاءُ﴾ بە جبّارەکان و مُستکبرەکان ﴿لِلَّذِينَ

اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا﴾ رەعیەو کرمانجی ئێوە بووین، بەدوای ئێوە کەوتبووین. جبّاری بە ڕاستی، غالب بە قوەی معنوی، لەسەر قلوب ومیول ومشاعر، شێخەکانن، ئەبوو زۆر ئاگایان لەو ئایەتە بێ ﴿فَهَلْ أَنْتُمْ مُغْنُونَ عَنَّا﴾ دەفع ئەکەن لە ئێمە ﴿مِنْ عَذَابِ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ﴾ شتێ لە عذابی ئەتوانن لەسەر ئێمە لای دەن، هەڵی گرن، بنۆڕین چتان پێ ئەکرێ؟ لەدنیا بە قسان هەڵتان خەڵەتاندین! ﴿قَالُوا﴾ مشایخەکان، رئیسەکان لەرووی عجزەوە ﴿لَوْ هَدَانَا اللَّهُ لَهَدَيْنَاكُمْ﴾ مع أنّه بەڕاستی درۆ ئەکەن. خوا هدایەتی دابوون، ڕێی بۆ ئاشکرا کردینە، رُسُلی بۆ ناردینە، بە هدایەتی خوا راضی نەبوون، إبایان کرد لەبەر تاوی حقوق. كِبْر وأنانیەت وحُبّی رئاسەت، گومراهی کردن، ئەوانیش بە سَلبی عُقولێ، بە إیجای عَواطِف ومیول رەعیەیان مَنع کرد، لە إتّباعی حەق با وجودی، نفعی وانی تیا بوو، لە دین ودونیا. سبحان الله مسئلەی خلقی أعمال، کوو تفرەقەی خستینە ناو، بێ هێزی کردین، ڕێمان لێ گۆڕا (تَشابَهَ الخَلْقُ عَلَينا، إنّا لله) ﴿سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَجَزِعْنَا﴾ بێ ئارامی، فەریاد، هاوار هاوار، پەل پەل، هەڵپە هەڵپە کەین؟ ﴿أَمْ صَبَرْنَا﴾ تحمّل کەین ﴿مَا لَنَا مِنْ مَحِيصٍ﴾ گرفتار بووین، قورتار بوونمان نیە، چ جێ یە نیە، تیا نجاتمان بێ! أقویاء، جوابیان دان بەو جوابە ﴿وَقَالَ الشَّيْطَانُ﴾ جبّار الجبابرە، مُضِلّ ومُغوی أنام، رئیس ومرؤوس، حتّی عالمی تامُّ العِلم، صاحبی قوەتی قاهرە، لە تلبیس وتمثیل، لای خیالێونان، لەسەر ئەو حاڵەش نطقی إیراد ئەکا، جوابێ حەقی لێ دەست ئەکەوێ ئەوجا تەماشاکە، ئەوانە لە أبلیس بە تلبیس ترن! ﴿لَمَّا قُضِيَ الْأَمْرُ﴾ حُکم تەواو بوو، إنفاذ کرا، حساب خلاص بوو، هەر کەس بە جزاو پاداشتی خۆی گەیشت ﴿إِنَّ اللَّهَ﴾ جَلَّ جَلالُهُ وعَمَّ نَوالُهُ ﴿وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ﴾ لە دونیا، ئەوا دیتان چۆن مُوافق دەرچوو، کەچی بێ وەجهو بێ معنا، بەڵکو بە مُتابعەی مەیل وعواطف، بڕواتان بە وەعدی نەکرد ﴿وَوَعَدْتُكُمْ﴾ وعدێ باطِل، گوێ مەدەنە رُسُل، قیامەتی چی؟ حساب وکتاب بۆ حیاة هەر ئەوەندەیە، لذائذی دُنیا لە دەست خۆیان مەدەن، ئەگەر قیامەتیش بێ، خوا أرحم

الراحمینە، رسولی أکرم تکاکارە، ئێوە ذُرّیەتی رُسُلن، أُمّەتی خۆشەویستن، خوا ئێوە عذاب نادا، بە بەرەکەتی، أولیاء الله یان خوا لە ئێوەش خۆش ئەبێ (بەبها، نەمیدەهەت، بە بەهانەیە، دەهەد) ئێوە بڕواتان بە من کرد، دوام کەوتن ﴿فَٱخْلَفْتُكُمْ﴾ ئەوە ئەبینن، هەمووی بۆف بوو ﴿وَمَا كَانَ لِي عَلَيْكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ﴾ چ قوّەت وقدرەتم بەسەر ئێوەدا نەبوو، تۆبزیم لێ نەکردن ﴿إِلاَّ أَنْ دَعَوْتُكُمْ﴾ وەك صەی بۆ نان، کوچی کوچیم بۆ کردن ﴿فَاسْتَجَبْتُمْ لِي﴾ دەعوتتان قبولێ کردم، دوام کەوتن، بناءاً علیە ﴿فَلاَ تَلُومُونِي﴾ لۆمەم مەکەن ﴿وَلُومُوا أَنْفُسَكُمْ﴾ سەرزەنشتی نفسی خۆتان کەن. حقیقةً (أعدی عَدوِّكَ نَفسك التي بینَ جَنْبَيْك) کەسێ بە حس بێ، لە خۆی فکرێ ئەزانێ شتێ هەیە، لە ئەندەروونی نا سەکنێ، علی الدوّام تحریکی إنسان ئەدا، بۆ خراپە. أصلاً ڕێی چاکەت نیشان نادا، بە خەیاڵیش. بۆ سیّئاتت ئەبا، ئەگەر ئەوە نەبێ شەیتان چی پێ ناکرێ. قُوای نفس، کە ضعیف بوو، هەزار جار إبلیس فووی تێ کا، دەماری ناجووڵێتەوە. ئەو قُواو لذائذ وشهوانیە یە إنسانی مغلوب ئەکا. لە داخلی ئەگەر أمین بی، دوشمنی خارجی چی پێ ناکرێ. دز بە شارەزایێ ماڵت ئەتوانێ دزیت لێ بکات. حقاً ئەگەر ئەو جەندرمەیەی داخلیە نەبێ، گَیدی شیتان زۆر واهیە، سلطان وجبری نیە. ئەبێ إنسان ئاگادری نفسی خۆی بێ. أمّا خیالیّون، بە خیالی واهی خۆیان قوّەت وقُدرەتی عجیبیان دایتە شەیتان، (خۆی ئەکاتە مُمثلی خوا، عَرشێ (بَین السَّماءِ والأرض) بنا ئەکا، ملائکەت لە دەوری رادەوەستن، حەول ئەدات، بەو نوعە، صدیقان إغواء ئەکا) حاشا ثم حاشا، هەمووی خیالاتی خۆیانە، ئەگەر ئەو صدیقانە لایان وانەبێ، خوا تَمثُّل ئەکا، وەخۆیان دائماً خەریکی تمثیلی خوا نەبن، شەیتان ئەو تلبیسەی پێ ناکرێ. (مع انە) تلبیسی خۆیان، قوّەیی تمثیلیان تەواوە لەبەر سهولەت وائەزانن، شت بۆیان تمثّل ئەکا.

ئەوەش سَببی چاو قووچاندن وخیاڵ لە عالەمی نورانیە. بعض ئەڵێن (پێغەمبەری دەدزن، شێخی دەدزن) خۆت ئەزانی خوایە ئەمە چۆن ئەبێ؟

تەماشای مَلکوتی سَماواتی أرض کەن، لە ئایاتی خوا إستفادە بکەن، مُحقّق بزانن ئەوانە بە فریادی ئێوە نایەن، وەك شەیتان بە فریادی أهلی جحیم نایەن ﴿مَا أَنَا بِمُصْرِخِكُمْ﴾ هەزار ساڵ هاوار کەن، بێ هوودەیە ﴿وَمَا أَنْتُمْ بِمُصْرِخِيَّ﴾ هەرچەندە هاوار کەم، ئێوە بە هاوارم ناگەن، بۆ نجاتی یەك چمان پێ ناکرێ ﴿إِنِّي كَفَرْتُ﴾ خۆم إیمانم نەبوو، ﴿بِمَا أَشْرَكْتُمُونِي﴾ لەو أمورە عظیمە کە لە خوا ئەوەشێتەوە، ئەو قدرەتە، ئەو سلطنتە، ئەو هونەریّاتە، ئەو علمە مُحیطە تَصرّفە بە أدنی دغدەغەیە باوێمە، دڵی دوو ملیار بَشر، ئەوانە کاری من نیە، غەیرە ممکنە، کافرم بە شرکتان بە (ما بە أشرك)تان ﴿مِنْ قَبْلُ﴾ لەداری دنیا. حاصلی خۆتان بە أوهام وخیالاّتی خۆتان منتان کردە شریکی خوا! (حقیقةً) لای خیالیّونان (إلاه الأرض)ە! ﴿إِنَّ الظَّالِمِينَ﴾ مُتَجاوِز لە حَدْ ﴿لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەتوانم بلێم عَذابی ئەو ظالمانە لە عَذابی شەیتانی بە ئێش ترە تووخوا بنۆڕن بعضە نقّال ئەڵێن (شەیتان لە بەینی دوو لێوی پێغەمبەری چەند فقرەیەکی خوێندیە، هەموو بە قورئانی تێ گەیشتینە، پێغەمبەر چ ئاگای لێ نەبووە حتّی نەی بیستیە، جا لە بینی ئێوەو شەیتانی لە رۆژی خۆی بەچاوتان دائەداتەوە (کەی من ئەو تاوانەیەم بووە، وەقتی حَبیبی أکرم، قُرآن بەسەر عباد دا بخوێنیتەوە، من لە بینی دوو لێوی مُبارەکی ئەو قسە بکەم؟!) وەی، وەی برادەرە بە تەواوی گوێ بگرنە ئەو (قصّة)یە، واخەیاڵ کەن حاضری ئەو وەقتن. دقەت لە إیمان وعملی خۆتان کەن، جنابی حق وقعیە، پاش چەند هزار ساڵ واقِع ئەبێ، بۆتان بیان ئەفەرموێ، تا تووش حسرەت وندامەتی ئەوێ رۆژی نەبن. بە جِدالی (أشاعر)ەو (مُعتَزِل)ە خۆتان محروم مەکەن، بە قسەی غزالی وأمثالی وەلَوْکی نواتێ زۆر گەورە بن، دائر بە قوّەت وقدرەت وخارقی شەیتانی وتمثیل وتَمَثُّل، لە رێی خوا خۆتان ماڵ وێران مەکەن. لە شەیتان أمین مەبن، بەسەر خۆتانی غالب مەکەن، وەبزانن خُطّەیی شەیتان وجوابی رئیسەکان أمّا ئەوان لە شەیتان خراپترن ئەو إعترافی شەیتان ئەی کات، ئەوان نای کەن. وەدقّەت کەن، لە نظمی قورئان، چ جوانە، چ

ممتازە! ﴿وَأُدْخِلَ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ إیمانێ صحیح ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ دڵپاکی کارچاك، هەرچاکەیە لە موقعی خۆی.

ئەگەر خۆمان لە خوا نەکەین، أیمانی بێ عمل وچاکە، چ قیمەتی نیە، بۆ دنیاو قیامەت، بێ وەزنە. ئەگەر أُمْنیّات لێ گەڕێ، إیمان قوّەت ئەستێنی، بەسەر هەواو هەوەس ئەکەوێ، تَجَبّر وتَكَبُّر وعنادو تَلَبُّسْ نایەڵێ ﴿جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ یەکێ لە شُعرای عَصر بیستەم لە دۆستێکی خۆم کە پێی ئەگوت: "حضرەتی محمد (ﷺ)، چونکە لە بلادی حاڕە دابووە، بلادی گەرم، بێ باغ وداغ وجۆو جۆبار. لە دەست گەرما عاجز بووە، بۆیە ئەوەندە (كَرّاراً)،(مراراً) وەعدە ئەدا لەگەڵ خەڵکی بە بەهەشت وقصور وأنهار، ئەگەر لە بلادی باردە بایە، موژدەی ئەدانێ بە مَواقعی گەرم) خوا ئەزانێ باغی سەبزو وخورەم وپایەدار بە کۆشك وسەراو وأنهار، ئاوی صاف وزولال خۆشگوار، چلەی زستانێ لە (سبریا)یەدا، خۆشە، بەتەماشای دڵ ئەگەشێتەوە؟ ئیتر بنواڕە قسەی أهلی عصرو، وَسوسەی إبلیس فرقیان چەند زۆرە، بەڵی لاشك شیاطین الإنسْ لە شیاطین الجنْ بۆ إنسان خراپترەن ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ لەناو باغ وباغات خُلود ئەکەن ﴿بِإِذْنِ رَبِّهِمْ﴾ لەهەر دوو سەرا، إدامەی حیات بە قُدرەت وقوەتی ئەوە، پاش زیندی بوونەوە، إنسان نابێتە واجبُ الوجود دوامی وجودی بە إدامەی خوایە. تعلقی بێ (أُدخِل) لام زۆر بە دقّەت نیە. لام وایە تعلّقی بە (أدخل) قطعی علاقە ئەکا، لە بینی إیمان وعملی صالح، وەبَینَ دخولی جنّەت. دوایی دیم بعضێ مُحَقّق ئەوی عرض کرا إستحسانی کردیە – زۆر شكر– ﴿تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا﴾ لە جنّاتی دا ﴿سَلاَمٌ﴾ خۆبە خۆیی، یا ملائکەت یا هەردوولا، خاڵیە لە هەموو أكدار، حتّی لە (جار و مجروری) نحویان! لەگەڵ یەك بە أمینی رائەبوێرن ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ أيُّها الرّائي أيّها الجبّار ﴿كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً﴾ دای رژاندووە، لە قالبی سکّەی لێیدایە ﴿كَلِمَةً طَيِّبَةً﴾ کلمەیە پاك وخاوێن، بێ غلّ وغشّ وخیانەت، جامعی بین القلوب، لێك بەستی دلان ﴿كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ﴾ تمثیل کراوە، بەدارێ بێ علّەت، بە شوق

ونظارەت ﴿أَصْلُهَا ثَابِتٌ﴾ دەماری بە أرزا ڕۆییتە خوار، مَحْکَم بووە، بەبای (صرپصرِ) و (کرِ کرِ) لە جێی خۆی رانەقەنێ ﴿وَفَرْعُهَا﴾ کەلی (فِي السَّمَاءِ﴾ بڵند بووە بۆ ئاسمان، رەشەبا نای شکێنێ، نما ئەکا، ناشکێتەوە ﴿تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ﴾ بەهەموو وەقت بەر ئەدا ﴿بِإِذْنِ رَبِّهَا﴾ خالقی مُبدعی، مُمکن نیە بڵێین (بەقصدو إرادەی صاحبی) تربیە وخدمەتی تأثیری هەبێ لە حالی دارەکە، أمّا وابزانە، ئەگەر مَقصد هەموو فصل بەر ئەدا، ئەودارە لە داری دنیا نیە. لام وایە بعضێ ئەڵێن (ئەوەداری بەهەشتە) ئەگەر (اُکُلْ) عام کەین، لە میوەی تەڕوهشك، (نخل) و(مێو) وانە، میوەیان هیشك ئەکرێتەوە. لە زستان وبەهار ئەیخۆن، إقتیات وتلذذی پێ ئەکرێ، دوایێ تەماشای تفسیری (أبو السعود)م کرد، ئەی فەرموو: کُلێ وەقتێ کە خوا داینـاوە، بۆ بەردانی دار" زورم لا خۆش بوو. فی الحقیقە دار مُثمر وەك داری(دارخورما، سێو، قەیسی، هەرووچکە، هەرمێ، کرۆسك)،حتّی گێوژو، بەلاڵوك بعضە ساڵ ئەگرن، بعضە ساڵ ناگرن، یاتەواو ناگرن، یا خراپ ئەبێ. دارێ هەموو ساڵ لە وەقتی بەر گرتن، بەری خۆی بدا، تەواو چاك، خدمەت وعنایەتی پێ ئەوێ، حفظی لە حَشَرات گەرەکە، (خاصّةً) لە (شۆك)ە، ئەو حفظ وعنایەتە، بە ڕاستی هەر بە خوا ئەکرێ ﴿وَيَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ﴾ تصویری معقولێ بە محسوس ﴿لِلنَّاسِ﴾ مؤمن وکافر، ئی چاك وئی خراپ ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ بۆ تێگەیشتن شتێ زۆر باشە، جێی ئومێدە، حتّی بۆ کەم فِکران، ئەوە مَثلەی کلمەی طیّب ﴿وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ﴾ پیس مُوجبی تفرقە وبەلەکی، دلێ پیسی ﴿كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ﴾ نە عروقی بە أرزا چوویتە خوار، نە فروعی بۆ ئاسمان بڵند بووە، نەبەرێ خۆشی هەبێ. ﴿اجْتُثَّتْ مِنْ فَوْقِ الأَرْضِ﴾ جُثّەی لاشەی شخصی گیراو لەسەر ئەرزی، دەستی دەیە لە ڕەگ وریشە دەردێ ﴿مَا لَهَا مِنْ قَرَارٍ﴾ لە ضربی إلاهی دەرئەکەوێ، مثلی پێشی ثابتە، مثلی ئێرە غەیرە ثابتە (فأفهَمْ)، إیمان کە لەدڵاندا، شین بوو، رەگی داکوتا، بە دەماراندا رۆیی أعمالی صالحە لە جوارحی ظاهِرە نِما ئەکا، لە هەموو وەقت عملی صاحبی، نفع ئەدا بۆ عبادی خوا

﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ أيمانێ راسخ ﴿بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ﴾ مُقرّر لە بەینی خواو و ئەوان یەعنی (توحید) ﴿فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ قرار گیر ئەبن، ڕەگ دادەکوتن، لە وطنی خۆیان سەر بەرز ئەبن، بە إستقلالیەت ئەژیەن، دەستی کەس بەسەریاندا ڕانابرێ ﴿وَفِي الآخِرَةِ﴾ مُخَلّدی في الجنان ئەبن، حتّی ئەوان عَهدی خوا نەشکێنن، خوا ئەوان ناشکێنێ، حَمْلی لەسەر جوابی قبری قوولّی مردیانەیە. خلاصە لە هەردوو جهان ئەگەن بە مَقصدێ لا یَزول ﴿وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ﴾ ڕێ بە مقصد نابەن، لە هەردوو جهان گوم ئەبن، بێ قَدر وقیمەت، ئاوارەیی دار و دیار بە عذاب وإضطراب ئەبن ﴿وَيَفْعَلُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ﴾ بەو نوعە کە إشارەی بۆ فەرموو، پابەندی أقوام وأشخاص نیە. مُمکنە لەو ئایەتە وەرگرین، ئەوی راسخ الإیمان بێ، إیمان چووبێتە ناودڵی، تیای قرار گرتبێ، سوءی خاتمەی نابێ. ئەوەی بەبێ أیمانی لە دنیا ئەچێتەدەر، لە حیاتی دنیا، إیمانی نەبووە بە ڕاستی وەبە قوّەت نەچوویتە دڵی، چ حاجەت بەسەرەمەرگ، لە صحەت وعافیەت، ناخۆشیەکی بێتە بەر، هەزار کَلمەی کُفری لە دەم دێتە دەر. گەلێ مُتصوّفە هەن، خوایان ئەوێ بە أمر بەر، ئەگەر شخصی خلافی مَشرەبیان شتێ بکا، هجومی ئەکەنە سەر، لە دین وإیمان دەچێتە دەر، ئەو نوعە (العیاذُ باللّه) حقیقةً مؤمن نین، چ جایە (سوئی خاتمە)! ئەگەر خۆیان تمثیلی خوا نەکەن، بە تمثیلی شەیتان وەرناگەڕێن، ئەگەر خۆیان قُدرەت وقوّەتی سلطانی شەیتان وا توسیع نەدەن، بەو نەوعە شەیتان غالب نابێ، ئەگەر چی ذاتێ وەکی (غزالی) مقصدی إعلامی عبادە، بۆ مهیّا بوون وإستعدادو مُقابلەی. أمّا سُلطانێ وا بە سَطوەت وهیبەت وحشمەت وقُدرەت إنسان خَوفی إستیلای لێ ئەکا، هێز لە إنسان نایەڵێ، بە غەیری إنقیاد چارەیە نابینێ، ئێوەو خودا کەسێ أمر کاتە چیایان شەڕە بەرانی بکەن، داك وبابت زیندی کاتەوە، پێت بڵێن (ڕۆڵە إیمانی پێ بێنە، ئەوەخوایە) کێ مقابلی ئەو مُعجزە خۆی ڕائەگرێ؟! ئیتر إنسان لازمە لە عدو بترسێ، أمّا نابێ وای خیاڵ کا، کە (بِوَجهٍ منَ الوُجوه) لەبەر عظمەت وکبریائی معارضەی پێ ناکرێ. خُلاصە ترسی

(إحتراس) نە ترسی (یأس) ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ أيّها الرسول ئـەی صـاحبی نظـر وإعتبـار عطفی نگاهت نەکردیە؟ ﴿إِلَى الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَةَ اللَّهِ كُفْرًا﴾ کلمـەی طیبـە بـە کلمەی خبیثە، قەومی خۆیان کردە جاهل بەتربیـەی خـراپ عقلّیـان لێ گـۆڕین، سلبی قُدرەتیان لێ کردن، بەبێ قوّەتی مادّی ومعنوی کەوتنـە گـۆڕێ ﴿وَأَحَلُّوا قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ﴾ بازاری کَسادی، بێ ڕەواج وبێ قیمەت، بە کسادی بـە فـساد چوون ﴿جَهَنَّمَ﴾ (دارَ البَوار)ە، جێی بە فساد چوانە. ئەو رۆسـایانە لـە دُنیـا وا مُهَیّا یـان کردوونـە، بـۆ جهـنّم، أنّـهُ ألآن بالفعـل لـەناو جهنّـەمن ﴿يَصْلَوْنَهَا﴾ ئەبرژێن، گەرمی ئەچێژن ﴿وَبِئْسَ الْقَرَارُ﴾ قرارگاهیـان قراریـان ﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا﴾ جبّارەکانی أقویاء، بـە عقـلێ وهـۆش وحیلـە کـار، بـۆ عـوامی بـێ عقـلێ شُـرکان، لای (رۆمـا) و (یۆنـانی) یـان وأمثـالی ئـەوان زۆرە، (رَبُّ النَـوْع). (أفلاطون) یش شتێکی وای هەیە، هیاکلیان بۆ إلاهی (مُخَیَّل)ە دروست کردیـە، عبـادەتی ئەکـەن. خواصّیش وەك عَـوام زۆر ئـەبێ، خۆشـین بـە مـەیلی عقلّـی باطنی متأثِر ئەبن، وەك عَوامیـان لێ دێ. بۆیـە ﴿لِيُضِلُّوا﴾ بەهـەردوو قرائـەت خۆشە، هەرچەند بۆ إضلالی قوم تمثال ئەکەن، خۆیانیش ضال ئـەبن. زمامیـان لە دەست عقلّی واهی، دەچێتەدەر ﴿عَن سَبِيلِهِ﴾ ڕێـی راسـتی خـوا، وەرگێـڕن وەرگەڕێن: ﴿قُلْ تَمَتَّعُوا فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ﴾ رئیس ومرؤوس ﴿إِلَى النَّارِ﴾ زۆر جـار تفکر ئەکەم، ضَلالی عَوام خەتای خواصّە، یا خەتای خۆیانـە؟ لەگـەلێ شت بـە حالّی حاضِرە، وا دەرئەکـەوێ خـەتای عوامـە، روویـان لـە حَقّـی خـالِص نیـە، إنسانی بێ غلّ وغشیان خۆش ناوی، وائەبێ بەگەلە ئەڕۆن بۆ خرافـات وأمُـوری سخیفەو کەرانـە، بەهـەزار دلیـل وبرهـان وظهـوری سوئی عاقبـەت، یـەکت پـێ ناگەڕێتـەوە، لەبـەر ئـەوە وابـزانم أربـابی حیَـلْ بـە گـوێرەی مـەیلیان، جلبیـان ئەکەن، بارێ چ نەبێ وەك بَهائم إستفادەیان لێ ئەکـەن، حقـاً ئەوانـەی لەگـەلێ ملّەت وأمّەتی خۆیـان سـاغن وەکـی (غـەزالی) (شـێخی عربـی)، (فخـری رازی)، (شێخی أبن حجر)، (شێخی شعرانی) ذواتی نوافذ الكلمە ئەبا لە قـسەی خۆیـان بفکرن، أمّەت إستفادەی لێ ئەکا، یا ضَرر؟ بۆ عَدمی ئـەبا یـا بـۆ وجـود بلّنـدی

ئەکا؟ یا نیوەی قدرەتی إنسانی تأثیری نیە؟ أمّا (جِن) قدرەتیان هەیە، خۆیان تشکّل ئەکەن بە أشکالی مختلفە.

تووخوا تێ فکرە، چەند کلمەیە بێ معنایە، کلمەی طیّبە لای خوا خۆش ئەوەیە: إنسان بەرزکا، بەقوّەت وثمرەیە، زۆر باش بیکا بە شجرەی طیّبە. لکن مع الأسف هەر کەس لە دائرەی مەیلی خۆی لە فضایە غیرە محدود، خیالّ وفکری جَوَلان پێ ئەدا! مع الاسف مسلّمان بە إتّباعی مُیول، بێ مراعاتی عقلّی واعی کەوتوونە (دارُ البوار)، ئەگەر معاذ الله لەو أفکارەدا بمێنن، نایەنە دەر (إنَّ الله لا یُغَیِّرُ ما بِقَوْمٍ حتّی یُغَیِّروا ما بأنفسهم) صَدَق الله وکَذَبَ المنَجِّمون ﴿قُلْ﴾، یا (محمد) أیّها الصادقُ الخالص، مُحِبّی إنسانیەت، حافظی شرفی بشری، واعی، بێ غَلّ وغش ﴿لِعِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ إیمانێ خاوێن بە حق إیمان ﴿يُقِيمُوا الصَّلاَةَ﴾ رووله خوا کەن، سجدە بەس بۆ ئەو ببەن، بەتەمامی، زەریفی، أرکانی بەجێ بێنن ﴿وَيُنفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ﴾ لە محصولاتی أرض، لە قوەت، لە فکر وعلم، لە قسەی چاك، رِزقی بَدنی وروحی، بۆ مُستحِقّان إنفاق کەن ﴿سِرًّا وَعَلاَنِيَةً﴾ بێ مُلاحظەی روو وریا، بە مُلاحظەی مواقعی حالّ و وەقت. حاصلّی لە عبادەتی خواو چاکە، لە حەق عباد بکۆشن. خۆیان نەخەڵەتێنن، بە کلمەی (خبیث)ە، بێ أصل وفرع، بێ ثمرو سایە، حیلەیان لێ نەکرێ ﴿مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ يَوْمٌ﴾ قیامەت ﴿لاَ بَيْعٌ فِيهِ﴾ لە دُنیا (بَیع) وبازاری خۆتان ببینن (إنَّ اللهَ إشْتری أمْوالَهُم وأنفسَهُم بِأنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ) رۆژی جەزا، (بیع) نیە، (فِدیة) حاشا. ﴿وَلاَ خِلاَلٌ﴾ دۆست دۆستی نیە، (شریك) تکا کار نیە هەمووی (هَبا)یە. ئەو خلیلانەی خەڵکیان إغرا کردیە، تۆبالّ بە ملی من، ئەدی حضرەتی شێخ نالّێ (ئەوی بە بەر دەرکی تەکیەدا بڕوا، مَغْفورە، (تەیمور) مرد أیمانی برد، چونکی تۆزی (خانقا)ی بەسەردا چوو، رووپێ تۆزی لێ نیشت، ئیتر قەید وبەند ئەمێنێ؟) حاصلّی إیمانی خالص بە قیمەتە، مُوجبی نجاتە سَعی بۆ بکەن، إعتماد لەسەر ئەم وئەو پەکتان ئەخات، بۆ دُنیا وأُخری، دەستە پاچە ئەبن. (حاجی قادری کۆیی) ئەڵێ:

كە دەیگوت شێخی من (من دەستەگێرم)
لەلام وابوو لەبەر جهل وجەواني
كە پیر بووم تێگەیشتم دەستی گرتم
لە كارو كسب وتحصیلی معاني

یا محمد (ﷺ) توو ڕێ مەگۆڕە، ڕێی ڕاست نیشان دە، حەق وحەقیقەت إعلان كە، عالەم دەعوەت كە، بۆ خوا، إلاهی واحدی بێ هەمتا، ئاگاداری سرو ئاشكرا، مالكی ڕۆژی جەزا، وەهەرچی محمّدی بێ حقە بەو مَسلەكەدا بڕوا، خوایە خۆت ئەزانی، وەقتی فڕوفێڵ نەما. ئەمڕۆ كلمەی نافذ شێخی طریق، وملای وهابیان و، مجتهدی جعفریانن، عند الله مسؤولن، ئەگەر مُداخَلَە بكەن منافق ئەبن، أمّەت إصلاح ئەكەن، وە لە (دارُ البَوار)ی (دُنیا) ئەیان هێننەدەر ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ ﴿وَأَنزَلَ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً﴾ ئەو ساڵ (١٣٥٦هـ) لە ولاتی ئێمە زۆر باران ئەباری، حتّی لە أوّلی كانونی ثانی ڕۆمی تا ئەمڕۆكە أواسطی شباطە علی الدَّوام باران بە ڕێژنەو نەرمە نەرمە دێتە خوار، أیّامێ بارانی نەبووبێ زۆر كەمە، خوا ڕەحم كا، (أللّهمَ حَوالَيْنا ولا عَلَيْنا) وە لەپایزیش پەڵەی زوودا، متَوالیاً باران هات، خسارە زۆر بوو، ماش وبرنج وتووتن وكونجی گەڵێ فەوتان. جاران ئەگەر باران زۆر بباریبا، ناوی كەچەلأنیان ئەنووسی، (٤٠) ناو ئەیاندا بەر باران، كە حَكْ ئەبۆوە، بارانەكە خۆشی ئەكرد، یەعنی وادەبوو. ئیستا كەچەڵ لام وایە، زۆر كەم بووین، زەحمەت (٤٠) كەچەڵی كەناویان یەك نەبێ، بدۆزرێتەوە! ﴿فَأَخْرَجَ بِهِ﴾ بەباران ﴿مِنْ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ﴾ دیارە هەموو ثَمَرە، نابێتە رزق ومعیشەت وزاد، ثَمَرە وایە هەم مایەی لَذّەتە، هەم مایەی حَیاتە. ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ الْفُلْكَ﴾ سفینەی شُرّاعی ﴿لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ﴾ هەر بەحرێ قصد كرێ ﴿بِأَمْرِهِ﴾ ئەمری تكوینی، أقلاً بای ئەوێ، شُرّاعەكەی پڕكا، وەقوەتی داتی، لێرە دیسان كەوتینە بحری نظریات! ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ الأَنهَارَ﴾ لكن مَعَ الأَسَفْ مسڵمانان إستفادەیان نەكرد، بحریان چوو، لە بڕیەش زۆر كەنەفت بوون، (سفینە) گۆڕا

بووه (پاپۆڕ)، (تَجْری) بۆ ئێمه نه‌بوو، ئه‌ئه‌با (سفینه) تێك ده‌ن زێده إصلاحی بکه‌ین، خلافی (تجری) خوایه.

له پاش ئه‌و تسخیره، ئه‌بایه تێ فکرین، إکمالی نواقص که‌ین، لکن (جُمود) لێ نه‌گه‌ڕا ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ الشَّمْسَ﴾ به‌و عظمه‌ته‌، که ئه‌ڵێن، "هه‌زار هه‌زار ودووسه‌دو په‌نجا هه‌زار هه‌ندی عه‌ردیه" ﴿وَالْقَمَرَ﴾ –نیزیکی په‌یکی ئه‌رزی ئێوه‌یه، به‌دوو مه‌عنا ﴿دَائِبَيْنِ﴾ دائم له مُسخرێنه هیچ وه‌قتی ناتوانن طُغیان که‌ن، له تسخیرو تدبیری تکوینی ده‌رچن. بۆ چی ئه‌یان په‌رستن؟ مع أنّهُ قیاسی رۆژو مانگ له (أصنام) ناکری ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ﴾ به (جَمع) ئه‌و بۆ (سکون) و (ئارام)، ئه‌م بۆ (حرکه) و (کسب) ﴿وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ﴾ له هه‌رشته شتێ، (علم) و (إستعداد) و (إقتباس) و (مادّه) و (قووت) هه‌رچی موادّی إبتدائیه، پێی (کَرَمْ) کردینه، ئێوه (مُتمّم)ن ئه‌تانه‌وێ پاش ئه‌و هه‌موو (تسخیرات)ه، بالفعل ئه‌وه‌ی ئاره‌زوو که‌ن، بۆتان خه‌لق کا؟!

﴿وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لاَ تُحْصُوهَا﴾ ئه‌وه‌نده زۆره سبحان الله ئه‌وه‌ی معتاد بێ إنسان إلتفاتی ناکاتی، به نِعمه‌تی نازانێ، زۆر دێو ده‌ڕوا ئێمه نازانین چ نعمه‌تێکه! له بعضه (بریتانی)یانم ئه‌پرسی:

"(کۆیه) خۆشتره یا (لۆنده‌ر)ه؟" ئه‌یانکوت: "کۆیه" چۆن وائه‌بێ؟" "به‌ڵێ ئێره رۆژی هه‌یه، ولاتی (نوور)ه، له (لۆنده‌ره) له‌به‌ر بُخارو دووکه‌ڵ که‌م رۆژ ئه‌بینین" حتّی له‌وسالانه، له مشرق ومغرب إعلانیان کرد، ئه‌مڕۆ (٨) سه‌عات رۆژ له (لۆنده‌ره) به‌ده‌رکه‌فتیه، له نووری إستفاده‌یان کردیه، تأریخ رۆژی وای که‌م دیوه، أمّا ئه‌و ساڵ (حقیقه) ئێمه‌ش حه‌زمان لێیه رۆژ ببینین ﴿إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ زۆر ظالمه متجاوز له (حدّ)ه، ناشکره، بێ نمه‌که، إنکاری نعمه‌ت ئه‌کا، في الحقیقه‌ت إنسان ظالمه، زۆر، گه‌ڵێ، خه‌یلێ. لام وایه (إذا خُلّيَ وَطَبْعَهُ) ظالمه، بێ عَداله‌ته، له‌م سه‌رو له‌و سه‌ر، به إفراط وتفریطه. ظُلم له خۆی له أبْنای نَوعی، له حیوان، له جماد –اَلْعِیاذُ بِالله– له خوا ئه‌کا، له مَقام تجاوز ئه‌کا، له حُدودی مَحدودی خۆی تێده‌په‌ڕێ، یا تَکَبّر ئه‌کا، تنزّل

ناکا، إیمان بە ذاتیَ وەکی خۆی بێنێ کە (رسول)ە، یا (تَدنّی) ئەکا، بۆ سەگ، بۆ گا، ئەکەوێتە سەر خاکی (مَذەلّەت)، (أباطیل) بێ بُرهان وشُبهە ودلیل قبولێ ئەکا، بۆ حەق حُجّەتی قاطِعی ئەوێ، یەعنی (مُلجِیء)، ظُلم لە حُسن وجَمالی ئەکا، ڕوویی پڕ محاسینی بەڕیخی گاجووت مشوّەهو بێگەنی ئەکا. بۆ إستخدام عالەمێ ئەکا بە کەر، ئەوەی تێ فکرێ، حیرەت ئەی گرێ.

ئەگەر بَیانی مظالِمی بَشر بکەم، ئەبێ دەفتەرێ بنووسم. بێ ئەمە کە هەزار إنعامی لەگەڵ کەی، أدنی شتکی نەگاتە دڵی، هەمووی بە هَبا ئەڕوا. یەکێ ئەکەوێتە قوڕ، مُوسڵمانێ بە خێری خۆی نجاتی ئەدا، ئەیکاتە مرحەمەتی (شێخ) مَعَ أنّه حضرەتی (شێخ) چ ئاگای لێ نیە، وەپێشی ناکرێ قورتاری کا.

لە زەمانی (حرب)، (حاجی سمایلی)ی (تەکەڵتوو) یان، هەڵپێچابوو، بۆ هێستریَ، تصادف چوومە سەرا، مَرحوم (صُلحی بەگ) أحواڵی مالیەی لە من پرسی، وتم: "فقیرە کەڵکی هیچی پێوە نیە" لەسەر قسەی من عفوی کرد، دەرحاڵ بە غار چوو بۆ دیوەخانی (حمە اغا) دەستی ماچ کرد (اغا لە سایەی تۆ عفو کرام).

دەربارەی (باری) قسەی لێ ناکرێ، حقاً زۆر ناشکرن، مەگەر مؤمنی راسخ الایمان، بێ طمع وأمل، بەس حقی بۆ حق بووێ، إیمان نەکاتە جالبی نقصی دنیا، ظلمی مەلایان وەکی کەس نیە، کائنات ئەکەنە، تابعی إعتقادی خۆیان، أرض وآسمان تێك ئەدەن، سَماوات وأرض کە خوا ئەفەرمووێ (بە شەش ڕۆژی خەلقم کردیە) خۆی ئەزانێ هەر ڕۆژی مُدّەی چەندە؟! ملایە بە نووکی قەڵەم، ئەو عالمە عظیمە، ئەباتە عەدەم! آناً، عالەمی مِثلی ئەو عالەمە ئەهێنێتە وجود بۆ خاطِری وَهمە غلطەکەی خۆی، أمّا باریشی هەر گرانە، لە تفسیری سورەی (أحزاب) بِحولِ الله، نەختی قسەی لێ ئەکەین ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ﴾ أصلی شجرەی طیّبەی مبارەکە، فرعەکە، خاتم الرّسلە في السماء ﴿رَبِّ اجْعَلْ هَذَا الْبَلَدَ﴾ (مکّة) ﴿آمِنًا﴾ لە أمان دابێ، محروس ومحفوظ بی بە عنایەتت یا ربّی ﴿وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ﴾ دوورمان کەی ﴿أَنْ نَعْبُدَ الأَصْنَامَ﴾ لە عبادەت کردنی

بوتانی بە روح و بێ رووح ﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ﴾ ئەو بوتانە ﴿أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ﴾ لاشك أصلی إضلال لەوانەیە، كە رێی بوت پەرستیان دانایە، وە تسویلی خەڵكی ئەكەن بۆ عبادەتیان ﴿فَمَنْ تَبِعَنِي﴾ بە إیمانی مُوَحِّدانە ﴿فَإِنَّهُ مِنِّي﴾ جزئێكە لە من، أولادی منە ﴿وَمَنْ عَصَانِي﴾ لە من نیە ﴿فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ أمریان عائدی توە، مُعاجَلەی عقابیان مەكە، بەڵكو لە أولادیان كەسێكی باش ئەبێ ﴿رَبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِنْ ذُرِّيَّتِي﴾ بعض: إسماعیل وأولادی ﴿بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ﴾ ئەوەندەی ئاو نیە زراعەتی لێ بكرێ. ﴿عِنْدَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ﴾ لە جێگایە كە بێ شائبەی تنزّە وتَفكُّو لَذّەتە ﴿رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ خالِصاً لَكَ، بێ بوت وتماثیل، بَیْتی خاوێن ودانـدرای. ئێستا چیان نیە، تا زەكاتی بدەن بەڵكو محتاجی مُعاوەنەتن ﴿فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ﴾ بە شَوق بۆیان بچن، إعماری بلدیان لەگەڵ بكەن، یا بۆ حەج ﴿وَارْزُقْهُمْ﴾ هەموویان ﴿مِنَ الثَّمَرَاتِ﴾ ئی ولاتی بە زراعەت وباغات ﴿لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ﴾ أمّا كفرانیان كرد، بوون بە مُشرِك ئەو (قَدَر)ە عظیمەیان رعایەت نەكرد. (بَیْت الحرام) لە هەموو جوانب بۆ زیارەتی دێن، قانزاجێ زۆر ئەكەن، بوت وأصنامتان بۆ چیە؟ لە بلادی دوور دوور، مرۆیی نایابی بۆ ئەچێ، چ حاجەت قطعەیێ لە (فلسطین) هەڵ كەنێ، طوافی بیتی پێ بكا، ناوی لێ نێ (طائف) لە نێزیكی (مكّە)ی دانێ!

خوایە ناشُكری نەبێ چ خرافاتێ كەوتە فكری مفسّران؟ نقّال ومقّالان! پێش حربی عظمی (مكّە)یی ئەیان فەرموو (بێ مَنّەت بن مُسلّمانینە، ئەگەر ئێوەش نەێن بۆ حَج، ملائكەت دێن) لە كتُبی قصّاصان دەڵێ: (ملائكەت لەو دیوی چیای بەردیان بار ئەكرد لە حوشتران، ئەبووە گندۆرەو شفتی، ئەیان هینا (مكّە)! " كە (حرب) داهات رێ گیرا، ئەوجا تێگەیشتن قسەكان بۆفن! ئەی نُظّار بە دیدەی بصیرەت تەماشای قورئان كەن، چ عجائبە، مُحاوەرەی مُستكبِرین وضعفاو نوقتی (نُطقی) شەیتان، كە خوا خۆی ئەزانێ كەی ئەبێ، لە چ موقعیكی إیراد ئەكا؟ دوعای (أبراهیم) كە چەند لەمەو پێش بووە، بە چ

مناسبەیە دوایێ ذکری ئەکا، ئەمە کاری (وَحی)یە، بە خیاڵی کاتبان ڕێك ناکەوێ!

ئەو حکایەتی ئەی کەن، بۆ هینانی (إسماعیل) و (والدە)ی وەبەجێ هێشتنیان، لەو مَقامە مُهْلکە، قورئان ڕەمزیش بۆ ناکا. بەڵێ لە (تورات)دا هەیە، نقّلان دوور نیە، کردبێتیانە (حدیث) مادام لە قورئان دانیە، گوێی مەدەرێ! دوعا بکە لە عبادەتی أصنامی ناطقە دوور بین، ثَمراتی قورئانمان بە رزق کا ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُ﴾ هەرچی هەبێ لە نیّات وأعمال وأقوال وحاجاتی دُنیاو قیامەت. سیّدی (ئالوسی) بعضە روایەتی نَقل کردیە، غەیرە مفهوم، غەیرە مناسبە ﴿وَمَا يَخْفَى عَلَى اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ﴾ ظاهرە، بەڵکوو صَریحە، ئەوەش لە أقوالی (خلیل)ە.

(جُبّائی) لام وایە إصابەی نەکردیە، (خلیل) بۆ دفعی توهُّم عامّی بعد الخاص ذکر فەرمووە (ما نُخفی وما نُعلِن) داخلی (مِنْ شَيء) نیە ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى الْكِبَرِ﴾ لەسەر پیری، إختلافیان هەیە، لە قدری عومری لە ئەو وەقتی ﴿إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ﴾ هەردوو بران، برای بابی، ذاتاً هەر باب حسابە، وەك کوردی ئەڵێ (داك وەك کەندووە) ذکریان پێکەوە، بۆ دەفعی مُنافَرە زۆر چاکە. وە حقیقةً مُنافَرە لە بەینی ئەو دووبرایە نەبوە، هەردوو لای بابیان خوشەویست بووین، خَرافاتی (تورات) بۆ تهییجی أفکارە، لەسەر (بَنی إسماعیل)، محرومیەتی خۆو أولادی لە إرثی معنوی ئەی کەنە دەلیلی نفعی رسالەتی خاتَم الرُسل، لکن نُقّالی ئێمە زۆر بێ ئاگان! ﴿إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾ ﴿رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلاَةِ﴾ خۆم لێ نەگۆڕێ بلێم (ئەمە عبادەتی عوامە، من خواصم، خلیلم، ئەبێ لە عبادەت مُمتاز بم!) ﴿وَمِنْ ذُرِّيَّتِي﴾ أمین نەبووە، ذرّیەتی وی، هەموو نوێژ بکەن، حتّی مُمکنە مُؤمنی بێ نوێژیان لێ پەیا بێ ﴿رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ﴾ دوعایە، بۆ قبولی دوعای عام، لە ئی ئەمڕۆو ئاتی ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ﴾ داك وبابم، ئەفەرموون (داکی موسڵمان بووە) ﴿وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ هەموو: لە أعقابی وغیرە أعْقابی ﴿يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ﴾ لەو ڕۆژی قیامەت

رادەبی، بۆ دیتنی حساب و لێ توژینەوە ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللّـهَ﴾ أیّها الرسُـول، لـە إهْمال وإمْهال ومُعاملەی (باری) لە حق ظالمان ﴿غَافلاً عمَّا يَعْمَلُ الظَّالمُونَ﴾ ئی قەومی توو. خوا وەعدی دا رُسُل بە إهلاکی ظالمان، ئەوان لە دُونیا بـە أنـواعی أسباب، مُسْتَأْصَلْ بوون أمّا ظالمی قـومی تـوو، بـە زۆری بـازوو مَغلـوب ئـەبن، دارو دیاریـان ئەکەوێتـە ژێـر قـەدەمت، عـذاب وعقابیـان تـأخیر ئـەبێ ﴿إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ﴾ نسیان وغەفلەت نیە، بەس تـأخیرە ﴿لِيَـوْمٍ﴾ أمـا چ رۆژ رۆژی هائـل ﴿تَشْخَصُ فِيهِ الأَبْصَارُ﴾ چـاو لـە مۆلـەق رادەوەسـتی زەق قـەپێلکی بـۆ یـەك نایەتەوە، لەبەر دەهشەت، وەك حالّی سـەرەمەرگ ﴿مُهْطِعِينَ﴾ خێـرا ئـەرۆن، تَکَبُّر نامێنی ﴿مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ﴾ سەر شۆڕ ئەبن، یاخود سـەریان بلّنـد ئەکـەن، بزانن چ ذلّەتێکیان بەسەردێ؟ ﴿لاَ يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ﴾ أنّە خَطّـی شُـعاعیان بـۆ ناگەڕێتەوە، صُوَری أشیایان بۆ نَقل کاتە چاوو بیان بیـنن یـەعنی هـیچ نـابینن ﴿وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاءٌ﴾ دڵیان لە عقلّ وهۆش وفَهـم خالّیـە. أنّـە هـیچ تێناگـەن. ئـەو أحوالانە بـۆ ظالمـان دەبـێ، رۆژێ دێ ئەمانـەی تیـا واقـع ئـەبێ، أمّـا رۆژێکـی (مُوَسَّع)ە ﴿وَأَنذِرْ النَّـاسَ﴾ ئـەمرۆ لـەوێ رۆژیـان ﴿يَـوْمَ يَـأْتِيهِمْ الْعَذَابُ﴾ بیـان ترسێنە هەر بە دونیا مشغول نـەبن خۆیـان لـەو رۆژە بپـارێزن، ﴿فَيَقُولُ الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ لە هەر أمّەت، یا ئەوانە ﴿رَبَّنَا أَخِّرْنَا﴾ ئەو دوعایە لەگەلّ عـذابی دونیـا (أنسَب)ە ﴿إِلَـى أَجَلٍ قَرِيـبٍ﴾ زەمـانی کـەم وکـورت، عـذابمان مـەدە ﴿نُجِبْ دَعْوَتَكَ﴾ وَحْدَكَ ﴿وَنَتَّبِعْ الرُّسُلَ﴾ لە قسەیان دەرناچین ﴿أَوَلَـمْ تَكُونُـوا أَقْسَمْتُمْ مِنْ قَبْلُ﴾ پێش ئەزاین ﴿مَا لَكُمْ مِنْ زَوَالٍ﴾ لە عبـادەتی أوثـان، وە لـەمعاملاتی قومیّەمان ناگەڕێینەوە، ثابت قَدَمْ ئەبین. بـەلّێ وایـە، گـەلێ مغـروران ئـەبینن لووتیـان لـە ئاسمانـە بـە هـەزار نـصیحەت ناگەڕێنـەوە، دەزەڕن، ئەنـەڕن، ئەوەڕن، نَعْرَد لێ ئەدەن، وجودی کەس نازانن، شای بە سەپانی خۆیان نـاگرن، ناگەها، زلەیەکیان لە تەختی شـەویلاکی ئـەدەن، تـرس غەلەبـەیان لێ ئـەکات، لووتیان شۆڕ ئەبێ، لاف وگەزاف بەر طرف ئەبێ، ئەکەونە پاڕانەوە ﴿وَسَكَنتُمْ فِي مَسَاكِنِ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ﴾ لە أقوامی سـالفە، لـە جێگـای وان دانیـشتن،

بوونە خەلیفەیان ﴿وَتَبَيَّنَ لَكُمْ﴾ بۆتان ظاهر بوو، بە آثار وأخبار ﴿كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ﴾ چیمان پێ کردن، لەبەر چی، لەسەر چی؟ ﴿وَضَرَبْنَا لَكُمُ الأَمْثَالَ﴾ (عَلى لسان الرَسول) تصویرمان بۆ کردن، ئی ڕابردی، ئی (ما يأتی) ﴿وَقَدْ مَكَرُوا مَكْرَهُمْ﴾ مەکرێ عظیم، بە أنواعی تدبیر وحیلەکاری، بۆ إبطالی حق وإدامەی باطلیان. خانیان لەبەر ئەتاشی ﴿وَعِنْدَ اللهِ مَكْرُهُمْ﴾ قیمت وقوّەتی هەر ئەو دەی زانی، چ تدابیرێ عَجیب ئەکەن؟ (رسول) و (أمّەت)یان ئاگایان لێ نەبووە ﴿وَإِنْ كَانَ مَكْرُهُمْ﴾ لەبەر شِدّەتی قوّەتی دِقّتی ﴿لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ﴾ لەسەر ئەو هەموو عظمەت وصلابەتیەوە ئەگەر جەنابی حەق ئاگاداری رُسُلی نەکردایە، بۆ خۆو أتباعیان بەر هەوا ئەبوون.

بۆ إزالەی چیا حکایەتی ئەکەن، روایەتیان هەیە، فی الحقیقەت إنسان شەرم لە قورئان ئەکا، ئەو جۆرە خرافاتە باوێتە تفسیر. ڕەحمەتی خوا، أوّلاً لە مُفَسرەکانی (مُعْتَزِلی) بێ، دووەم لە (مُحَقّق)ەکانی ئێمە، وەك (فخری رازی) و(أشیاعی)، ئەگەر ئەوان نەبان، تفسیری قورآن بە حکایەت وچیرۆکە ئەمایەوە! چا نەبوو لە زەمانی نقالەکان بالۆن نەبوو وە إلاّ(نمرود) و (بوختونّصر)یان ئەگایاندنە آسمانی أعْلا! گوێی مەدەرێ، وەلَوْ خرافات نقل کەن لە إمامی علی، حاشا لە إمامی دوورە ئەو نقلیاتە.

مەعنای ئایەت چ پەکی کەوتیە، لەسەر ئەو (هَذیانات)ە؟ ئەی (سیّد رشید) کوڕەهەڵتەکێنە، پەڕوبالّی (نَسر)ی دڕۆیان تێك بشکێنە ﴿فَلاَ تَحْسَبَنَّ اللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِ رُسُلَهُ﴾ تأكيداً ئەفەرموێ ﴿إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ﴾ غالبە تۆڵەی دۆستان لە دوژمنان ئەستێنی ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ﴾ ئەوێ رۆژێ إنتقامیان لێ وەرئەگرێ ﴿وَالسَّمَاوَاتُ﴾ ئەوانیش تبدّل ئەکەن، رُوّادْ نازانن ئەرض وئاسمان چۆن بگۆڕێن؟ بەچی بگۆڕێن؟ چاکە لێرە هاوار کەمە (سیّد رشید) فاتحای بۆ بخوونم لە زەوالی جبال سیّدی ئالووسی باش بووە، (نظام) و (شێخی عربی) پەکیان ناکەوێ، ذاتاً عالەم (آناً فآناً) لای وان (مُتَجَدِّد)ە، ئەو وەقتە تبدیلی مِثل ئەکەن، بەشتێ نوێ، (ظُهور)ی (بَعدَهُ) بائەویش (تَجَدُّدْ)

بکا. ئیتر أرض وئاسمان، بوویته مسرحی أفکار وخیالاتی وان. حقیقةً مەعنایه صحیح له (ابن عباس) نقل کراوه (دیاره ئەو أرضه به حالی حاضره، جێی هەموو زیندی بوونەوەکانی تیا نابێتەوه، ئەبێ جەنابی حەق وای لێ بکا، ئەو عالەمه بگرێ، پێچ وپەناو حصاری کمینگاهی نەمێنێ) ﴿وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ﴾ بی شەریك ﴿الْقَهَّارِ﴾ غالب، کێ نجاتیان ئەدا؟ کوو قورتار ئەبن؟ ﴿وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ﴾ رۆژی (تبدُّل) ﴿مُقَرَّنِينَ فِي الأَصْفَادِ﴾ وێکرا له زنجیر ئەکرێن، دەست وپێیان له (قَیْد) ئەدەن ﴿سَرَابِيلُهُمْ مِنْ قَطِرَانٍ﴾ قەتران معلومه، حوشترێ گرووبێ، پێی ئەهەنوون، تێی هەڵدەسوون، (أَنَّهُ) بۆ دفعی (حكّ)ه، قەترانیان تێ ئەدەن ﴿وَتَغْشَى وُجُوهَهُمُ النَّارُ﴾ ئاگر بەسەر روویان دادێ، دای دەگرێ، چونکی له وەقتی غَضَب له مسکینان، روویان سوور هەڵ ئایسا ﴿لِيَجْزِيَ اللَّهُ﴾ سبحانه ﴿كُلَّ نَفْسٍ﴾ ئی مجرم ﴿مَا كَسَبَتْ﴾ به مناسبەیه تام لەگەڵ أحوالی دونیای ﴿إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾ لەبەر کمالی علمی توقّف ناکا، لەسەر لێکدانەوەی. حتّی إنسان تا له حساب ماهر تر بێ، به تمرینات بێ، حساب زووتر ئەکا، راناوەستی وه بێ غلط ئەبێ، ﴿هَذَا﴾ (ما ذُکر) قورئان ﴿بَلاَغٌ لِلنَّاسِ﴾ تبلیغه بۆ عالەمی بشری، یاخود کفایەته ﴿وَلِيُنذَرُوا بِهِ﴾ باپێی بترسن، یا بیزانن، علمیان پێی بێ ﴿وَلِيَعْلَمُوا﴾ (علمَ الیقین) ﴿أَنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ (لا شريكَ لَهُ) ﴿وَلِيَذَّكَّرَ أُوْلُوا الأَلْبَابِ﴾ ذاتاً مقصد به بَلاغەت وهدایەت، ئەوانن. إنسانی بێ فؤاد چیه؟ ذاتاً له قیامەت بەبێ دڵی ولُبّی وفؤادی ظالم دەرئەکەوێ.

جنابی حق عقلێ خالصمان پێ إحسان کا، به قسەی ئەم وئەو گەوج نەبین، دائماً مُتَذَکِّر ومُتَفَکِّر بین، له ئایاتی قورئانی وأکوانی له ئاثاری علم وقدرەتی خوا، إستقلالاً إستفاده بکەین، ئەوی لێت طلب ئەکەین، بۆ خێری دونیاو قیامەت پێمان عطا کەی، دووعامان قبوول کەی، وەك ئەوانه نەبین که مُنتظری فَیضن له کەسانی توشنه لەب، دەروون به حرارەت دەست درێژ ئەکەن بۆ ئاو ئاویان ناگاته دەم. جماعەتێ پەیاکەی (زەیغ)ی إعتقادیّاتی

مزخرەفە وأساطیری إسرائیلی لە دڵی موسڵمانان وتفسیری قورئان لادەن، پاکیان کەنەوە، خۆت ئەزانی چ غلّ وغەشێکیان تیایە؟

(وَمِنْكَ التَّوْفيق).

سورەی (إبراهیم) تەواوبوو. نەوبەتی تفسیری سورەیی (حِجْر)ە، لە سورەتی (رعد) ئایاتی (كَوْنيٍ) زێدە تفصیل درا، لە سورەی (إبراهیم) ئایاتی (نقلی) زۆرتر بیان کرا. ذاتاً نقلیاتی قورئانن هەمووی ئایەتە، عِبرەتە لەم سورەتە، إشارە بۆ هەردوو نوعە آیەتە، (مَكّی)یە، ئایاتی (٩٩)یە، هەردوولا (إجماعی)یە.

## سورەتی (حجر)

﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾

﴿آلر﴾ ئەفـەرموێ ﴿تِلْـكَ آيـات الْكِتَـابِ﴾ اَكْـوانى ﴿وَقُـرْآنٍ مُـبِينٍ﴾ اَقْـوالى. کەسێ تەماشاکا، ئەزانێ هەردوو کتاب مـوافقن و سەراسـەر ئايـاتی (بـاهرات)ن ﴿رُبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ دوای بیستنی قورآن (مـافی الـصُّورتین) یـان ملاحظـە ئەکرد کەمجار: ذاتاً ملاحظەیان کەمە، گەلێ لە ترسی تأثیری قورئـان لـە دلّـی، گوێ ی خۆی ئەگرت، خۆی پەنا ئەدا ﴿لَـوْ كَـانُوا مُـسْلِمِينَ﴾ مُنقـاد بـن، إیمـان بێـنن. (رُبَّ) لێـرە بـۆ (تقلیـل)ە، وە ئـەم (وداد)ە، لـە دُنیایـە، پـاش نوعـە تأثیریکی بە إجتماعی قورئان، چ نەبێ جارجـار ئایـەتێکیان ئەچـێتە گوێـچکی، شـتێ فهـم ئەکـەن، ئارەزوویێکیـان بـوو، بـۆ پـەیا ئـەبێ، اَمّـا إیمـان نایـەنن، لەبەرچی؟ لەبەر إنغماسی (فی الشَّهَوات) لا نـابینی ئەفـەرموێ ﴿ذَرْهُـمْ﴾ لێ یـان گەڕێ ﴿يَأْكُلُوا وَيَتَمَتَّعُوا﴾ با بخۆن، تَمتُّع بە دنیا بکەن، خواردن و خواردنـەوەو رەقـص و دانـس و تێکـەلأوی ژن و پیـاوان، بـێ دەرپـێ ی عـەرەبان، نەفـسی خۆیان بەرەلا کردیە، (زنا) لـە (قەحپـەخانان) قومـارو مُـسْکِرات ئـەلێن: "دیـن مانعی حُرِّیەتە، دنیا ئەمڕۆو بەس، قیامەت و حساب و کتاب نیە"، لەبـەر ئـەوە مسلّمان نابن. مع الاسف ئەمڕۆ مُـسلمانەکانیش، سَبَب بـە لَذائـذی حَیـوانی لـە دین دەردەچن ﴿وَيُلْهِهِمْ الأَمَلُ﴾ ئـەلێن :"زُلالی رُسـلین، أحفـادی خلیـل اللّـەین، تکا کارمان زۆرن"، ئەوی نَوعە هۆشێکی ببێ، بەو نوعە، فـەریبی خـۆی ئـەدا؟ ﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ لە ڕۆژی لێ قەومان، لە ڕۆژی جەزا، وەقتـێ ئاگادار ئەبن بـێ هوودەیـە (قُـضیَ الامـرُ) دەکەونـە (دارُ البَـوار) وەك (شـجرەی خبیـث)ە، بـێ

(ثبات) و (قرار) بێ مَجالی فرار، (فدیە) و (تکا): یۆك (یۆختر=نیە)! نازانم ئەوەی ئەفرمووێ:"ئەم (وِداد)ە، لە قیامەتا، لەناو جهەنەما، بە (تکثیر) یا بە (تقلیل)" چۆن (ربط) ئەدا؟! بەڵێ إنکاری (روایات) ناکەم، ئەم (وداد)ە، لە رۆژێ، وەقتێ (جوستە،جوستە=دەستە،دەستە) مُؤمنی گوناهکار لە ئاگر دێنەدەر، بە زۆری پڕ بەزار لە ناوەندی دڵێ، ئەو تَمنّایە ئەکەن، بەڵام (رُبَّما يَوَدُّوا)ی ئێرە لێرەیە, اَلْـآنْ زۆرن لە (ئاوروپا) لە (ئەفریقا) مستشرقەكان قسمێ. أمّا لەبەر (عَیال) یا (قومیەت)، (لَوْمی ناس) وەكی (أبوطالبی) ئیمان نایەنن. (تَسَتُّری) ژنان و (تَعُدُّدی) زوجاتیش، خاتوونی مَنع ئەکا، ئەوانیش طبعاً ئەبنە مانِع. أمّا بعضێ داعیان زور بە قوّەت ئەبوو، مەیل ئەی کێشان، قطعی هەموو عَلائیقیان ئەکردو مسلّمان ئەبوون. (أمل)یش نوعێکی باشە بۆ إحتراسی اُمّەت وە بۆ دەوامی شرف زیدە ژیاندنی مُفیدە، نوعێکی خراپە، إنسان لە (عمل)ئەکا، (کساد) و (فساد)ی (عام) ئەبێ، قومی وا، زوو یا درەنگ بە هیلاك ئەچن! ﴿وَمَا أَهْلَكْنَا مِنْ قَرْيَةٍ﴾ لە (قُری)ی (مَدنیّەت)ی (فاجِرە) ﴿إِلاَّ وَلَهَا﴾ موقعی ئەو (واو)ە، زۆر بەجێ یە ﴿كِتَابٌ مَعْلُومٌ﴾ مُدەیە لە زەمان، کورت یا درێژ، بە (ظروف) و (أحوالات)ی خۆیان ئەگۆڕی، لای خوا معلومە بە قَطعی. قسمێ لە أهلی (خُبرَ)ە و (سیاسەت) و (کیاسەت) لە (علائِم) (تَفرُّسْ) ئەکا، وەك دقتوری (حازِق) تەماشای نەخۆش کا، ئا ئەمڕۆ سبەی زۆری نەمایە، وا ئەبێ (نوع)ە (تقلبات)ێك رووئەدا، بەدڵدا نەهاتووە، وە لَوْ بەنەساغیش بێ، نەختێ تر ئەژیە. وە مُمکنە مَقصد (کتابی) (قَولی) بێ (واللّٰه أَعْلَمْ) ﴿مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ﴾ أمەتی لە أُمَمْ (بلا إستثناء) ﴿أَجَلَهَا﴾ ئەوەی بۆی داندراوە ﴿وَمَا يَسْتَأْخِرُونَ﴾ (بِوَجْهٍ مِنَ الْوجوه) مُمکنی مُحال، (تَخلُف) ناکا، (سعی) و کۆشش پاش (حُلول)ی بێ کەڵکە، (قَبْلَهُ) ئاگادار نین، إعتبار بە قولی (رُسُل) ناکەن. اُمَمی سابِقە عُمریان کورت بووە، (دُوَل)ێ زۆر (تَشَکّل)ی کردیە، زور نەچووە، مردینە. ئێستا گەلێ ئاگادارن بە (إحتران)و (إحتراس)ن، وەك (طُبّي واقي) (سیاسِیّون)یان خەریکی (وِقایات)ن (قَوم) کەم خلافن لەگەڵ

یەك، (حکومەت) بۆ (ملّەتە)ە، (ملّەت) بۆ (حکومەت)ە ﴿وَقَالُوا﴾ لە جوابی دەعوەت و (إنذار) ی (رسول) ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِي نُزِّلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ﴾ ئەوەی بە گەمە ئەڵێن، قەشمەری پێ ئەکەن، (أجل)ی چی (إنقراض) چی؟ دُنیا وێران ئەبێ و قیامەت دادێ؟ ئەی هوو... ! ﴿إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ﴾ قسەت قسەی شێتانە، بە ڕاستی توو شێتی! ﴿لَوْ مَا تَأْتِينَا بِالْمَلاَئِكَةِ﴾ بۆچی نایەنی؟ دەبێنە، شایەدیت بۆ بدا، یا بە هِلاکمان با. ﴿إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ لە دەعوای رسالەت و هاتنی عذاب، یەك لەبەدبەختی (بشر) ئەوەیە، دائما چاویان لەم لاو لەو لایە، قیمەتی یەك نازانن، ناگرن، جنابی (حَق) خۆی جوابیان ئەداتەوە ﴿مَا نُنَزِّلُ الْمَلاَئِكَةَ إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾ بە ئەمرێ، کارێ، شتێ موافق ومطابق و مُقَرَّر، أَلْآن وەقتی عذابیان نەهاتوە، کەوەقتی هات، ملائکەت ئەنێرین ﴿وَمَا كَانُوا إِذًا﴾ وەقتی ناردن ﴿مُنْظَرِينَ﴾ مُهلەت نادرێن، هەزار جار بپاڕێنەوە (أَخِّرْنا إلى أَجَلٍ قريب، نُجِبْ دَعْوَتَكَ و نَتَّبِعُ الرُّسُلَ) فائدەی نیە، کار لەکار ئەترازێ. أَمّا إرسالیان بۆ شاهدیت، یا رسالەت، ئەوە هیچ (مُلابَسە) (مُوافَق)ەی لەگەڵ (حَقّا)نیە. حقا مُفَسِّران لەو (حَقّ)ە زۆر دوواون، دوور نیە إنسان (حَق) بزرکا. تەماشای (روح المعانی)کە، سەرسام ئەبێ. ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ﴾ حتّی وساطەتی مەلەکیشی پێ ناوێ ﴿وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ (کفر) و (طعنی) وانە، ضرری پێ ناگەیەنێ. وە هکذا ئەو (حِفظ)ە (مُستَمِرّ)ە، تا ئەمڕۆ گەرچی لە وڵاتی ئێمە إعتنای پێ نەمایە! لاکن لە (مصر) و (نجد) و (حجاز) باش مایە .(یاسین الهاشمی) رەحمەتی لێ بێ فِکری وابوو مەکتەبی دانێ بۆ (حفظ)ی قورئان. أمّا مع الاسف رێك نەکەوت، بە فلاکەتێ عظیم رۆیی، فِکرەکەی لەگەڵ خۆی چووە قبر! یا رەبّی لە (قیل)ەی (نحوی) یانی بپارێزی. ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ فِي شِيَعِ الأَوَّلِينَ﴾ (فِرَق) و (طوائفی) پێشینان، هەر (شیعە)یە، لە خۆی. ﴿وَمَا يَأْتِيهِمْ مِنْ رَسُولٍ﴾ هەر رەسوڵێ بێ ﴿إِلاَّ كَانُوا بِهِ﴾ بە (رسول)ەکە، بە دینی، بەکتابی و بە ذکری ﴿يَسْتَهْزِئُونَ كَذَلِكَ﴾ لە أوَّل تا آخر ﴿نَسْلُكُهُ﴾ رسول، دینی، کتابی، ذکری ﴿فِي قُلُوبِ الْمُجْرِمِينَ﴾ ئەی هاوێینە ناودڵیان، لە دوای (تزویر) و

إستهزاء (أهوەن)نابن، لە حەق تووشی وائەبن ﴿لاَ يُؤْمِنُونَ بِهِ﴾ بە رسول، وەلَوْ هەزار ئاياتی (مُقترەحە)يان بۆ بنوێنين ﴿وَقَدْ خَلَتْ سُنَّةُ الأَوَّلِينَ﴾ وكذا سنة الله في حقهم ئەويش رابورد، يا سُنّەتی خوا لە حەق وان، کەچی يان پێ کرا، چی پێ کردن؟ ﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ﴾ لەسەر ئەوانەی طلبی إتيانی ملك ئەکەن ﴿بَابًا﴾ دەرگايە گەورەو واسع ﴿مِنَ السَّمَاءِ﴾ لە ئاسمان ﴿فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ﴾ لە (باب)ە بەناو ئاسمان (عُروج) بکەن بە (طُولَ النَهار) تا سێبەر ئەمێنی، تەماشای (مَلَك) بکەن، چ جايە (مَلَك) يان بۆ بنێرين ﴿لَقَالُوا﴾ لەبەر دووری لە (قبولَ)ی (حق) وئيمان بە رسول ﴿إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا﴾ چاومان مەست کرايە، چەشم بەنديان لێ کردينە ﴿بَلْ﴾ کە تۆزێ بەخۆ بێنەوە ئەزانن، ئەوە بەس لە (أخذ)ی (بالعُيون) نيە، (إضراب) ئەکەن ئەڵێن ﴿نَحْنُ قَوْمٌ مَسْحُورُونَ﴾ قوای (مُدْرِك)ە، (عقلَ) و (دماغ)مان تێك چووە، سِحرمان لێ کراوە، ئەوەی (مشاهد)ەی ئەکەين، لە (مشاهد)ەی سحر لێ کراوان وکاری (سِحر)ە، بێ (أصل)، وبێ (حقيقەت)ە ﴿وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا﴾ نايبينن، يا ئەڵێن (سُكِّرت ابصارُنا مَسْحُورون)، لە هيچ نافکرن، (بُرج) چيە؟ (بروجی أثنا عشر) لەسەر (صُوَر)ی (مُختلف)ە نا، ئەمە حقيقەتەن خيالّی يە. ئەو (كواكب)ی (صور)يان لێ (خيالَ) كرديە -وەلو زور لێك دوورن- حاشا، ئەو (بُروج)ە (وەهمی)يانە چ (آثار)يان نيە. بەلێ (تَوَهُّم)ی (تقاطُع) و (تباعد)ی (مُعَدِّلُ) و (منطقە)، وە بە چوار نقطە تقسيمی منطقە، بۆ چوار فصلی سالّی، (وَهمی)يە (صحيح)ە، (مُطابق)ە (باقی) (تأثيری)ی نيە. (ثور)ی ئاسمان و (ثور)ی ژێر عەردی وەك يەکن؟

(خَيام) ئەڵێ:

بعضی گاويست بە اسمان، نامەش پەروين
وەنگاهو ديگەر نُهفتە دەر زير زەمين
چشمی خردَت گُشايی چول أهلی يقين
زيرو زبر دووگا و وحشتی خربين

(سیدی ئالوسی) هەندی قسەیٚ لە شێخی عربی نقل کردیە، (حقیقةً) بە (شطحات) ئەچێ ﴿وَزَيَّنَّاهَا﴾ ئاسمان ﴿لِلنَّاظِرِينَ﴾ (لاشك) (نظر)ی (بَصری)، (جلب)ی (نظر)ی (فکری) ئەکا، مەگەر کەسێ دڵی کۆر بێ. حقیقە ئەو زینەتە، (جلب)ی (نظر)ی (عُلما)یانی کرد، (علمی هەیئەت)یان هێنا (قَلَم)، (أرصاد)ی بۆ (بِناء) کرا، وە (حالاً) (عُلما)ی گەورە گەورە لە (شرق) و (غرب) و(أمریکا) خەریکن، (مُدهشات) بۆ (بشر) ئەهێننە بەر (نظر). (شرق)ی ئێمە لە (إبتکار) هەر (محروم) ئەبێ؟! بەڵێ (إنّما سُكِّرَت أبصارُنا) وەك زەمانی (جاهلیەت) ﴿وَحَفِظْنَاهَا﴾ (بروج)ی ئاسمان ﴿مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ﴾ (شَيْطان الأنس)، (مسحور القفل)، (سکیر البصر) تەماشای (کائنات) ناکا إلاّ وەك (حیوان)ی (لا یفهم). خوا ئاسمانی لە (نظر)ی پیسی ئەو (جُهلا)یانە (حفظ) کردیە، (أنّە) بلاغەتی کَوْنی، حِفظی کردیە لە هەموو (شیطان) ئەوجا ﴿رَجِيمٍ﴾ (مَطرود) دوور لە (علم) و (عقل) و (إدراك)ی (آیات)ی (وەحدەت)ی (إلاهی) ﴿إِلَّا مَنِ اسْتَرَقَ السَّمْعَ﴾ گوێ راگرێ بە دزی، کە گوێی لە ئایەتی قورئان بی، کە جنابی رسالەت یا (مؤمن)ێ ئەی خوێنێتەوە ﴿فَأَتْبَعَهُ﴾ دووای ئەو (إستراق)ە ئەکەوێ ﴿شِهَابٌ مُبِينٌ﴾ (قَبَس)ە ئاگرێ ئاشکرا بە (أثر)، ئاگری (غضب) و (حقد) و (إستکراه) لە دەروونی بەردەبێ (أثر)ی لەسەر رووو (اعضا)ی بەدەرئەکەوێ، نیزیکە (هجوم) کاتە سەر (قارء)ی، أمّا ناتوانێ.

لەو مقامە (نظر) بە ئایاتی (كَوْنيّة) (مُقابل)ی (مُقتَرَحات)ی ئەو مردانە، مەعنای ئایەت وایە. أمّا ئەوەی (سَلَف) فەرموویانە، لە(روایات) رەنگ نیە، ئەمڕۆ لە (تفاسیر) (ذکر) بکرێ، هەروەکو (علمی هەیئەت) رێ نادا، (تأریخ) مُساعد نیە، (عقلٍ) (مُوافق)ە ناکا. (نظم)ی ئایاتی قورئان (إقتراح)ی (مُعانید) آن و (جواب)، (مانع)ە لە (إقحام)ی ئەو (نقلیات)ە لە (فخری رازی)، بەڵکو لە مەلایەکانی (معتزل)یش پێش (إمام)، تا (سیّدی ئالووس)ی خۆیان زۆر جەفا دایە، بۆ رێك خستنی، أمّا رێك ناکەوێ.

(ئـالوس)ی هـەر (شـهاب)ی (ثاقـب)ە، أمّـا (شـهامەت)ی (أبـنُ عبـاس) لـە (نفوذ)ی کردیە.

حەزت لە (جدال) و (نزال)ی بێ هوودەیە؟ تەماشای تفسیری (کبیر) و (روح المعانی)کە.

أمّا تەماشاکردنی (طنطاوی) بـێ (فائـدە) نیـە، گەرچـی خالّیـە لـە قیمـەتی (تفسیر) ﴿وَالأَرْضَ مَدَدْنَاهَا﴾ ئەو عاردەی کە ئەوان خۆیان لەسەرین، چـما تـێ دەفکـرن چـیە؟ چـی تیایـە؟ ﴿وَأَلْقَيْنَـا فِيهَـا﴾ (کَأَنَّـهُ) لـەناوەوە بـۆ سـەرەوە هاویـشترایە ﴿رَوَاسِـيَ﴾ چـیای (ثابـت) و بـەر (قـرار) ﴿وَأَنْبَتْنَـا فِيهَـا﴾ لـە (أرض)ی: (سـهل) و (جبلـي) ﴿مِـنْ كُـلِّ شَـيْءٍ مَـوْزُونٍ﴾ كَأَنَّـهُ بـە تـەرازوو هەلّکێشرایە، یاخود (مَوْزون)ە وەك (شعر) زور جوان و (مُناسب)ە. لکن (عقـل) و (فکری) ئەوێ، لە (مُوازنە)ی بگا لێکـی داتـەوە! تەماشـای (طنطـاوی) کـە، یاخود وەرە بـەهارێ لـە (کۆیـە)، (قـصائد)ی (صُـنعی) (بَـدیع)ی پـڕ (مَعنـا)ی (کاملِ البَیان) (قِطعات)ی باغ وداغ و کێو کـەژ تەماشـاکە، حـەز ئەکـەی بـەهار بێ؟ شعرەکانی (حاجی قادری کۆیی) بخوێنەوە! ﴿وَجَعَلْنَا لَكُمْ﴾ (أَيُّها النَّاسْ) ﴿فِيهَا﴾ لە ئەرزی، سهلی، حبلی ﴿مَعَايِشَ﴾ ئەوی (أسباب)ی گوزەرانتان بـێ، هەرچی (خیالّ)ی ئەکـەن لـە (ملابس) و أسـبابی (مـساکن) و (معـادن) ﴿وَمَـنْ لَـسْتُمْ لَـهُ بِـرَازِقِينَ﴾ (عبیـد) و (حیوانـات)ی (سـائمە)، (رزق)ی خـوای خۆیـان ئەخۆن، (نفع)یان بۆ ئێوە! ﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ﴾ هەرچی بەخیالّ دابێ لـە (نبـات) و(سائر)ی (موالید) ﴿إِلاَّ عِنْـدَنَا خَزَائِنُـهُ﴾ (أصـول)ی (مـا يُتَرَكَّبُ منـە) وی وی ﴿وَمَا نُنَزِّلُهُ﴾ (أكثر)ی (عنصر)ی (موالید) لە (سمـا)یـە، لـە (جَـوّ)ە ﴿إِلاَّ بِقَـدَرٍ مَعْلُومٍ﴾ بە ئەندازە ئەزانین ئەو شـتە کـوو ئـەبێ؟ لـە چـی ئـەبێ؟ لـە چـەندی ئـەبێ؟ (طـول) و (عـرض) و (مِـزاج)ی (عـالَم)ی (موالیـد) لای (عَـلاّم الغُیُـوب) ئاشکرایە، بە گوێرە خلقی (أنواع) و (أفراد) ئەکا، ئـەو (وَزن) و (تقـدیر)ە هـەر بـە خـوا ئـەکرێ، کـاری (طبیعـەت) نیـە. وە (خلـق) و (أیجـاد) بـەو (دقـەت) و (مُوازنَ)ە لای (أرباب)ی (علم) لایەقی (شأنی) (خلاّق)ی (کائنـات)ە نـە (کیفمـا

أتفق)ەيە ﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ﴾ لە (أوقات)ى (مُختلف)ە لـە (جهـات)ى (مُتعـدّد)ە ﴿لَوَاقِحَ﴾ ئاوس بە هەورى، يا هەورى ئاوس ئـەكا، دەرووني پـڕ ئـەبێ لـە نـاو ﴿فَأَنْزَلْنَا مِنْ السَّمَاءِ مَاءً﴾ در عَقب ﴿فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ﴾ ئـەى خۆنـەوە خۆتـان و زراعەتتان ومَواشيتان ﴿وَمَا أَنْتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ﴾ ئێـوە نـاتوانن ئـەو ئـاوە لـە نـاو عەردى (حِفظ) بكەن، بيكەن بە خەزنە، ديارە كـارى خوايـە ﴿وَإِنَّـا لَنَحْنُ نُحْـيِ وَنُمِيتُ﴾ بە راستى ودروستى بە تأكيد، ئێمە أشـياء ئـەژينيين، إبتـداءً وَإدامـةً، بەو (أُمور)ى كە (ذكر) كرا، وەئەى مرێنين، (حيات) و (موت) بەدەست ئێمەيـە ئـيتر كـێ ئەپەرستن؟ ﴿وَنَحْنُ الْوَارِثُونَ﴾ مـيرات گرتـان ئێمـەين (الفَنـاءُ لَكُـم والبَقاءُ لله) ﴿وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَقْدِمِينَ﴾ ئەوانەى رابردوو لە ئێوە ئەى (بَنى آدم) ﴿وَلَقَـدْ عَلِمْنَـا الْمُـسْتَأْخِرِينَ﴾ (ماضـى) و (مُـضارِعـەت)ى (علمـى إلاهـى) بـە (إعتبار)ى (تفصيل) و (إجمال)ە، بۆيە ئەوانەى لە دوايى دێن وەكـى ئەوانـەى پێشى ئەيانزانێ، (عِلم)ى پـێ يان هەيـە, مُمكنـە بـۆ (أمَـمِ)ە رابـردوو بـێ، ئـەو أمّەتانەى پێشكەوتينە، بە (ثروت) و سامان، (علم) و (معارف) و (حضارەت) و (إكتشافات)، (مُستقدمين)ن ئەوانەى لەو مەيدانە پاش كـەوتوون، لـە (جهـاد) و (إدامە)ى (ملّەت) و (دين) (مستـأخرين)ن.

روايەتى لە (ابن عبـاس) (نقـل) ئەكـەن، مـن لـە خـواو پێغەمبـەرو أصـحابى رسول الله ى شەرم ئەكـەم، (نقلـى) كـەم حتّـى بـۆ رەدكردنـەوە، (مُحَقّق)ە لـە پێشەوە، حيلەيە ئەكەن ئەلّێن (ئەو ئايەتە (مَدنى)يە، زێرا نوێژى بـە جماعـەت وئاشكرا لە (مكە) نەبووە، حاصلّى رابردوو وئاتى لە خـوا بـزر نـابێ ﴿وَإِنَّ رَبَّـكَ هُـوَ يَحْـشُرُهُمْ﴾ (أوّلـين) و (آخـرين) ﴿إِنَّـهُ حَكِـيمٌ﴾ (مُـتْقِنُ الفعـل)ە، ئـەوە (حكمت)ى (عَملى)يە ﴿عَلِيمٌ﴾ ئەزانى ئـەبێ وەئـەبێ. ئـەوەى (دغدغـە)ەى لـە دلّـدا بـێ، لەبـەر بـێ (عِلمـى) و (سـعەت)ى (وَهْـم) و (خَيـال)ە ﴿وَلَقَـدْ خَلَقْنَـا الإِنْـسَانَ﴾ بـە (إعتبـار)ى (مَبـدأ) ﴿مِـنْ صَلْـصَالٍ﴾ لـە (مـادّە)كـى زرينگـە، ترينگەدار ﴿مِنْ حَمَإٍ﴾ قـوڕێ (مُتَغَيِّـر) ﴿مَسْنُونٍ﴾ نـازانم: (أهـل)ى (لغـەت): (بـصرى) و (كـوفى)، (أئمـة)ى (تفـسير)، (نقـل)ى (إخـتلاف)يـان زۆرە، لـە

(صَلصال) و (حَماء) و (مَسنون)، (بالأخص) لە (مسنون) ئایا ئەبێ ئەوانی پێشی یەعنی ملائکەتەکان کووی تێگەیشتبن؟ ﴿وَالْجَانَّ﴾ (نوع) یا (أبو الجن) یا (شیطان)! ﴿خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ﴾ (قبل التناسل) وەکی ئێوە، یا (قَبْلَ خَلْقْ الأنسان) ﴿مِنْ نَارِ السَّمُومِ﴾ بای گەرم، زەهر ئالوود، (قاتل) یەعنی (مادّە)ی (ناری) و (سمّی) لەواندا (غالب)ە. وە (إلاّ) ئێمەش (قسم)ێ لە (عناصر)مان (موادّ)ی (ناریە)یە، بەلکو (کائنات) لە ئاگرە، ئاو لە دوو ئاگرە: (مُحرِق) (مُحتَرِق)، (بناءاً علیە) (خلق)ی (جن) لە ئاگری (مُستَبعَدْ) نیە! ئێمە (إیمان)مان بە (جن) هەیە لەبەر (بعض)ە، ئایاتی قورئانی، وەئەوەندەی (تصحیح)ی ئایەتی پی بکرێ (کافی)یە بۆ ئێمە، (زێد)ە (تَوَغل) (جنّەت)ە. لێرە قسە زۆرە، من ئەوەندە (عَرض) ئەکەم (معلوم)ە (أصحاب)ی ئێمە، یەعنی (أشاعِرە)ن (إنکار)ی (تأثیر)ی (قُدرەت)ی (عَبد) ئەکەن. حتّی لەسەر ئەو (أفعال)ی کە خوا (أمر)ی پێ کردینە، بەس (مەیل)ە، کەمیان (أدنی) بەو (مەیل)ە مەیلی کردنیان بێ، ئەشکێنن. (أمّا) (أبن حجر) و (أمثالی) لەوی گەورەتر لە (أصحاب) و (أولیا)یان ئەڵێن: (جن) (قادر)ن، کە خۆیان (تشکّل) ئەکەن بە (أشکال)ی (مختلف)ە، هەر شکلێ ئارەزوو کەن، دێنە سەری" توو خوا ئەمە قسەیە؟ (جن) ببێ نەبێ چیە؟ چ پەکی (إدارە)ی (عالَم)ی لەسەر ئەکەوێ؟ خۆزیا لەجیاتی ئەو (هَذَیانات)ە (جن) یەعنی (میقروب) یان (کشف) کردبا، دوور نیە، (حدیث)ی (نَبوی) (إشارە)ی بۆ وان کردبی، (غایەت)ی بە (تعریفات) تێکیان دا. ئەمڕۆ دەرئەکەوێ (مدار)ی (حیات) و (ممات) مان، لەسەر ئەو (مخلوق)ەیە. ئەوی (مُهلِك)ی (سامّ)ە، (ذی سَمّ)ە (تخریبات)ی (هَیکل)ی لەوانە. (أسباب)ی شێتی (معلوم) بوە، لەوانە (قَوم)ێ ئەوەندە (عقل) و هۆشیان نەبێ، بزانن (جِنّەت) و (صَرع) لە چیە؟ ئەبێ چیان لێ ئومێد بکرێ؟ بە غەیری چیرۆکەی سەر کاغەز. (مع الاسف) چیترمان لەدەست نایە! ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا﴾ (بادیَ الْبَشَرَە)، ﴿مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ﴾ خۆزی بمزانیبا (ملائکەت) کوو لەو کلماتە گەیشتینە؟! ﴿فَإِذَا

سَوَّيْتُهُ﴾ ڕێکم خست ﴿وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي﴾ خوا ئەزانێ روحی حقیقی چیە؟ ئەو (نفخ)ە چۆنە؟ (روح) (معلوم إلاّ نُيتـه) (مجهول اللّميته) (سِرّ)یکە بەکەس (حَلْ) نابی، کە گوترا: "(جَوهر)ی (مُجرّد)ە" ئایا (ماهیەت)ی (کشف) ئەبێ؟ یا زێتر (تَعَقّد) ئەکا؟ (مع أنّه) (مجرّد)ی (مقدس) و (منزّه) لە (جهەت) و (حَيّز) هەر خوایە، نایەتە (عقل) (مُمكِن الوُجُود)ی (موجود) (فِي الخارج) بێ، لەو (فضا)یە، (مَوقع)ێکی نەبێ! (لكن) (وُجوب)ی (وُجود) بو (جناب)ی (حەقّ)ی ڕێك ئەخا، ئەگەر (واجب الوُجودِ) (غَني)یە، نابێ لە (مكان) و (زمان) و (جهەت) بێ. ئەگەر لە (فراغ)ێ دایە نابی (وجود)ی (غنی) بێ، نەوەك (نَفس)ی (ناطِقه)ی (مُجرّد)ی (إنسانی) بەڵكوو (عُقول)ی (مُجَرّد)ە (وجود)یان لای (حقیر) (محال)ە، غەیری خوای هەرچی هەیە (مادّی)یە، چ (لطیف) چ (كثيف)!

(سیّدی ئالووس)ی (أذیەت)ی خۆی دایە (أقوال)ی (عُلما)یانی (نقل) فەرمووە، بە (جرح) و (تعدیل) و (نقد) و (إبرام). ئەمڕۆش (حُكماء) بە (تجربیات) خەریکن، بزانن (حَیات) و (مَنشأ)ی (حیات)، (حقیقەت)یان چیە؟ بۆیان (كشف) نابێ، نابێ! (والسّلام)

زۆرم تەماشای (كُتُبْ) کردیە، بە (درس)م وتیتەوە، لە (إشارات)تا (تهذیب) چم بە دەست نەکەوتیە ئەوەندە (معلوم)ە، شتێ هەیە، وەلە ناو (بَدن)ی (حیوان)ا، (مداری) (حس) و (حركه) و هۆش وگۆشە، (باقی) بە (قطعی) (معلوم) نیە! ﴿فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ﴾ تەماشای (ترقیّات)ی کەن، بە (أصل)ی خۆتان و (أصل)ی وی (غلط) مەبن. خۆتان لێ نەگۆڕێ (بَعْدَ الخَلْق والتَسوية والأمرِ) ﴿فَسَجَدَ الْمَلَائِكَةُ﴾ بێ (تَوَقُّف) (تا الله لَقَدْ آثَرَكَ اللهُ عَلَيْنا) ﴿كُلُّهُمْ﴾ ئەوەی (داخلی)ی (مُحاوره)ی (سابق) بوون ﴿أَجْمَعُونَ﴾ بێ (تَخَلّف) و (تَأخّر) ﴿إِلاَّ إِبْلِيسَ﴾ خۆی (مَلَك) بووە لە (شعب)ی (جن)، (ذاتاً) (مَلَك)یش (جِن)ن بەجێ ئەگۆڕێن ﴿أَبَى أَنْ يَكُونَ مَعَ السَّاجِدِينَ﴾ (مع أنّه) (مَلَك) بوون (قُدسیّەت) یان لای (معلوم) بوو ﴿قَالَ﴾ (جناب)ی (حق) ﴿يَا إِبْلِيسُ﴾ ئەو

(نوع)ە (خطاب)ە، ئەگەر نەختی (متصوّف)ەکان لێ ی گەڕێن ج (تشریف) و (تعظیم)ی تیا نیە ﴿مَا لَكَ﴾ چیە بۆ توو، (ما السَّبَبْ)؟ ﴿أَلاَّ تَكُونَ مَعَ السَّاجِدِينَ﴾ لەوان زیاتری؟ ﴿قَالَ لَمْ أَكُنْ﴾ (شأن)ی من نیە ﴿لأَسْجُدَ لِبَشَرٍ﴾ إنسانێ ﴿خَلَقْتَهُ مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ﴾ لەوان زیاتر نیم، (أمّا) من خۆم ئەناسم، (بشر)یش ئەناسم، ئەو (تَنَزّل)ە بۆ من نابێ! ﴿قَالَ﴾ (جنابی حق) ﴿فَاخْرُجْ مِنْهَا﴾ (مادام) (موافقة)ی (ملائکەت)ەکانت نەکرد لە (سجد)ە لە میانی وان بڕۆ ﴿فَإِنَّكَ رَجِيمٌ﴾ دووری (مطرود)ی لە (زُمرە)ی وان، (تَباین)تان نایەلێ، وێکڕا بن، دەڕابە، بڕۆ! ﴿وَإِنَّ عَلَيْكَ اللَّعْنَةَ﴾ (لعنەت)ی خوا ﴿إِلَى يَوْمِ الدِّينِ﴾ (عُنصر)ی خۆت لە (أمر)ی من زیاتر ئەزانی؟ ﴿قَالَ رَبِّ فَأَنْظِرْنِي﴾ ئەبێ لە (دوام)ی (لعنەت) شتێکی (فهم) کردبێ، (مادام) وابوو (مهلەت)م بدە ﴿إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ تا حَشر ئەکرێن، تا (إنقراض)یان ئەبێ ﴿قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنْظَرِينَ﴾ دیارە بۆ غەیری ویش هەیە ﴿إِلَى يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ﴾ ئەڵێن (نفخە)ی (أولی) ممکنە بڵێن (تا رۆژی (إنقراض)ی (بشر)) ذاتاً دوای یە، ج ئیشی نامێنی، (طبعاً) ئەمرێ. (حکایەت)ی لێرە (نقل) ئەکەن لە (کَعْب الأحبار) هەرشایانە لە (کَعْب الأحبار) (نقل) کرێ خۆزێ (کَعْب الأحبار) و (أمثال)ی (کَعْب الأحبار) نەهاتبانە (وجود) ﴿قَالَ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي﴾ بۆ ویت (إغوا) کردم کە (بشر)ە؟ ﴿لأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الأَرْضِ﴾ لەو (مقام)ەی ئەهێنمە خوار، ئەکەوێتە (أرض)، (أولاد)ی ئەبێ، (فساد)یان بۆ (زینەت) ئەدەم ﴿وَلأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ هەموو ﴿إِلاَّ عِبَادَكَ مِنْهُمْ﴾ لە (أولادی)ی (آدەم) ﴿الْمُخْلَصِينَ﴾ هەڵبژاردراون، بە (طین)ێ پاك (عقل)ێ تەواو، (عقل)ێ (واعی)، بە (قوّەت) لە (مُحاکم)ە، (مُسلط) لەسەر (میول) و (عقل)ی (باطن)، (عقل)ی (حیوانی) ﴿قَالَ﴾ (جنابی حق). ﴿هَذَا﴾ ئەوەی کە بَیان ئەکرێ ﴿صِرَاطٌ عَلَيَّ﴾ ڕێگەیەکە (واجِبُ الرعایە)یە، ئەبێ وابکەم ئەو ڕێ یە ﴿مُسْتَقِيمٌ﴾ ڕاست بێ پێچ وپەناە ﴿إِنَّ عِبَادِي﴾ هەمووی: (عارِف) و (عامی) ﴿لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ﴾ وەك لە (سورە)ی (سابق) رابرد، وەخۆی لە(قیامەت) (إعتراف)ی پێ

ئەکا، ئەوەی ئەیلێ، لاف و گەزافە. تـوو ئەو (قُـدرەت) و (قـوّەت)ەت نیـە، (إنسان) (إغوا) کەی بە (فساد)یان بەی ﴿إِلاَّ مَنْ اتَّبَعَكَ مِنْ الْغَاوِينَ﴾ بە (مجرّد)ی (دعوەت) دوات ئەکەون خۆیان فرۆماین (ماون)، هەوێنێکی تووی پێ ئەوێ ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ ئـی (غاوی)یان، (إتباع)ی (شیطان) و (شهوات) و (میل)ی (فاسد)، گشتیان لەوێ گرد دەبنەوە ﴿لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ﴾: ١-(شرك). ٢-(غنا لـە رسالەت). ٣-(تفرقـة)ی (بَـين الرسـل). ٤-(غـرور) بـە (اصـل). ٥-(دنائـەت). ٦-(شـهوات).٧-(أمـل). ﴿لِكُلِّ بَابٍ﴾ لـە (أبـواب)ی (سبعه)ی (جهنّم) ﴿مِنْهُمْ جُزْءٌ مَقْسُومٌ﴾ بەش و (حـصّە). (غَـرض) بـە (أصـل) نەخەڵەتێی، بە (تفرقه)ی (قومی) خۆت لە (إتباع)ی (رسل) (محروم) نەکەی. نە (مُتَكَبِّر)بە کە (سجده) بوخوا نەبەی، نە (دَنـی) ڕیخی گاجووت لـە نێـو چاوانی دەی، بە دوای (کاسیات) (عاریات)، (سیّدات)ی (راقـصات)، (فـاعلات) نەکەوی.

بە (أمل) دەست لە (عَمل) هەڵنەگری، وە (تأمّل) کەی ئەوەی بۆ (ترقّـی) (بشری) باشە (قبول) کەی.

(إلاهيّون) ئەڵێن: "بە صورەتی حاضـره (علـى أحسَنِ تَقويم) (أبـو البَـشَر) (إيجاد) کرا" (لامـارك) و (داروين) ئـەڵێن: "بـە (تَطَـوّر) لـە مـەيمونی (ترقّـی) کردیە، (طَوراً بَعدَ طَورٍ)، (نَسلاً بَعْدَ نَسْل) هاتیتـە سـەر ئـەو (صـورەت)ە" کـی هــە، باشـترە؟ بـۆ (وقـار) و (شـهامەت) و (عـزەت)ی (نفـس)! ئەگــەر وەك (هکسلی) خۆت بتوانی (أدلّه) بێنی هەر نەأیسە، (أمّـا) بـە (تقلیـد)ی (مَحـض) بۆ خۆت ئەگۆڕێ؟ (مَلَك) (أفضل)ە یا (بَشَر)؟ طبيعی (بشر) (افـضل) تـرە بـو ئێمە. (مادّە)ی (مَعنوی) (فائدە)ێ (زێدە)یە، (خاصةً) (مُقابـل)ی ئەوانـەی کـە ئەڵێن: ملائکەت (بنات الله)ن، (مُدبِّر الأمور)ن" ئەو (عقیـد)ە (سـوق)مـان ئـەکا بۆ (سعی)، وەکذا (مسئلە)ی (صدیقة) وە (زهراء): (عـالم) وە (سـیّد)، ئـەوەی (جهەت)ی (کسب)ی تیابی، ئەولایە تێ (فکر)ە، خوا ئەفـەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ (أمّا) (لازم)ە (معنـی)ی (تقـوی) بزانـی، (تقـوی) ئەتۆرێتـە

(ما يُتّقى منه) ﴿ادْخُلُوهَا﴾ پێش (دخول) یا بعد الدخول) (إحتراماً) لە (طرف)ی پەروەردگاری (عالَم) (أمر) ئەکرێ ﴿بِسَلَامٍ﴾ و (إحترام) ﴿آمِنِينَ﴾ لە هەموو (مکروهات) ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ﴾ لە (دنیا) ﴿مِنْ غِلٍّ﴾ (حَسَد)، (کِبر)، (دنائەت) (سائر)ی (صفات)ی (رذیلیە)ی (قلبیّە). (أوّلُ الأمر) (إنسان) ئەبێ بە (تصفیە)ی دڵ خەریك بێ، ئەگەر دڵ بە (أمراض)ی (مَعنوی) نەخۆش بوو، (أعمال)ی (ظاهری) چاك نابێ، ئەگەر ببێ (صُوَری)یە، کە لە (دنیا) (غِل) یان نەما، لە (قیامەت) (بطریق الأوْلی)، وەئەوەی بۆ ئێمە باش بێ، (نزع)ی (دنیا)یە، لە (جنّەت) دادەبن ﴿إِخْوَانًا﴾ برا برای خۆشەویست وبێ شەڕو شورو (خِدع)ە. (معلوم)ە، تا (أخوّەتی) (دنیا)یان بە (قوّەت) بووبێ، (أخوّەت)ی وێندەریشیان خۆشترە! ﴿عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ﴾ لەسەر تەختان دادەنیشن، ئەمبەرو ئەوبەر، بەرابەری یەك ﴿لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا﴾ لە (جنّات) ﴿نَصَبٌ﴾ (تَعَب) و ماندیەتی ﴿وَمَا هُمْ مِنْهَا بِمُخْرَجِينَ﴾ دەرناکرێن (قوی) و (ضعیف) نیە، (قوی) (ضعیف) دەرکا، وەك (رسول) و (مکّە) وەرن (مکّە)یيەکان ئەوجا تێ کۆشن، هەڵمەخەڵەتێن (دائماً) (تَفَکّر) لە (آیەت)ی (إنَّ اللهَ لا يُغَيِّرُ ما بِقَوْمٍ حتّى يُغَيِّرُوا ما بأنفسِهم) کەن، (آیەت)ی (عظیم)ە لە (أوّل)ی (تشکیلات)ی (بشر)ی، تا (إنقراض)ی (تأریخ)ی (عالَم)ی (مستقدمین) و (مستأخرین) (تفسیر)ی ئەو (ایەت)ە یە ﴿نَبِّئْ عِبَادِي﴾ (علی الإطلاق) ئەبێ وابێ ﴿أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ کەسی تر نا، (حق)ی (غفران) بە (مُوشح) بە (طُغرایی)، (غرّا)ی (کبریاء)یە. نەکەن (إعتماد) دەنە سەرکەس ﴿وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ الْعَذَابُ الْأَلِيمُ﴾ خۆی لێ بپارێزن، لەسەر (مکارە) (صَبر) کەن، هەردوای (لذائذ) مەکەون، نەخۆ (عَذاب)ی ئەچێژن. (لَذّەت) تان لێ ئەکاتە تاڵاوی سەرەمەرگ، لە (بین)ی (خوف) و (رجا) بن ﴿وَنَبِّئْهُمْ عَنْ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ﴾ (ملائکەت) بوو ون، خوایان لەگەڵ نەبووە، بۆ (بشارەت) و (عذاب) ناردرابوون لە (طرف) (جنابی کبریائی) ﴿إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ﴾ لەو جێی لێ ی دانیشتبوون ﴿فَقَالُوا﴾ (عِندَ الدخول) ﴿سَلَامًا﴾ سلامی خوات لێ بێ، ئەی (خلیل الرحمن) ﴿قَالَ﴾ پاش (جواب)ی

(سلام) ﴿إِنَّا مِنْكُمْ وَجِلُونَ﴾ ئێمە لێتان ئەترسێین ﴿قَالُوا لاَ تَوْجَلْ﴾ مەترسێ ﴿إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلاَمٍ عَلِيمٍ﴾ (ولد)ێ زێدە زاناو دانشمەند ﴿قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَى أَنْ مَسَّنِيَ الْكِبَرُ﴾ لەسەر پیری ﴿فَبِمَ تُبَشِّرُونَ﴾ وەك كوردی دەڵێ: "مەگەر بڵێ: بە قەبری بابم" خۆش بوو، پێكەوە زەمانێ بژین ﴿قَالُوا بَشَّرْنَاكَ بِالْحَقِّ﴾ بێشكە زۆر وێكڕا ئەژین ﴿فَلاَ تَكُنْ﴾ لەبەر پیری ﴿مِنَ الْقَانِطِينَ﴾ بڵێ ی: ئەمرم، خۆشی لێ نابینم" ﴿قَالَ وَمَنْ يَقْنَطُ﴾ كێ نائومێد ئەبێ؟ ﴿مِنْ رَحْمَةِ رَبِّهِ﴾ كەس نائومێد نابی ﴿إِلاَّ الضَّالُّونَ﴾ وە (معلوم)ە، (خليل الرحمن) سەروەری (هُدات)ە، (لكن) (حسب الظاهر) ئەو قسەم كرد، لە (يأس) نەبوو ﴿قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ﴾ ئیشتان چیە، (بعد البشارة)، چ ئەمرێ ترتان هەیە، بە (أهميّەت) بی؟ ﴿أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ﴾ لە (طرف) جنابی حق ﴿قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمٍ مُجْرِمِينَ﴾ بۆ (هلاك) یان ﴿إِلاَّ آلَ لُوطٍ﴾ چ (مُتَّصل) چ (منقطع) لەوان (مُنقَطِع)ن ﴿إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ گشتیان ﴿إِلاَّ امْرَأَتَهُ﴾ خێزانی، (أَنَّهُ) خوا ئەفەرموێ ﴿قَدَّرْنَا إِنَّهَا لَمِنَ الْغَابِرِينَ﴾ (نجات)ی (مُقيّد) بوو، ئەگەر ئاوڕی نەدابایەوە، بەبەر نەدەكەوت، یا دەڵێ: لەوانە نەبا، (هلاك) نەدەبوو. وامان نووسی، (لكن) (تأمُّل)ێ لە (ئايات)ی دوایی بكە، وەهەم، لە ئاياتی (سورە)ی (هود) لە پێشەوە. ئەوجا وەرە، تەماشای (إستثنا) كە، (أقوال)ی (عُلما)یانی، عەرەبیت گوێ لێ بێ ﴿فَلَمَّا جَاءَ آلَ لُوطٍ الْمُرْسَلُونَ﴾ بۆ (نجات) یان ﴿قَالَ﴾ (بَعْدَ ما جَرى وسَبَقَ بَيانُهُ، وَضاقَ بِهِمْ ذَرعاً) ﴿إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُنْكَرُونَ﴾ خۆتان گۆڕیوە، ملك نین، بۆ نجات و عذابی ئێمەو قوم نەهاتی ین، تاخۆ چ (فكر)تان هەیە، لە (حَق)م؟ ﴿قَالُوا بَلْ جِئْنَاكَ بِمَا كَانُوا فِيهِ يَمْتَرُونَ﴾ ئەوی (شك)یان تێدا هەبوو ﴿وَأَتَيْنَاكَ بِالْحَقِّ﴾ بێ (مِن)یە ﴿وَإِنَّا لَصَادِقُونَ﴾ لەو (خَبَر)ە، یا (شِيمَة)مان (صدق)ە ﴿فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ﴾ (إضافه)ی (أهل) بۆ (غير)ی (عَلم)، لە (معنا)دا، عەینی (ذي العَلم)، یەعنی (ضمير)ی (خطاب) بووە (مضافُ أليه) (أَهل) ئەكرێ ﴿بِقِطْعٍ مِنَ اللَّيْلِ﴾ پارچەیێ لە شەو، یا لە ئاخری ﴿وَاتَّبِعْ أَدْبَارَهُمْ﴾ لە دوایان بە، (ذاتا) ئەو (حائل)ە لە (بَيْن)ی وان و (بين)ی (عذاب)

﴿وَلاَ يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ أَحَدٌ﴾ ئاوڕ نەداتەوە، بۆ (طرف)ی (قوم) ﴿وَامْضُوا حَيْثُ تُؤْمَرُونَ﴾ خۆیان ئەزانن، (مصر)ە (شام)ە (أردەن)ە؟ پەکمان نەکەوتووە ﴿وَقَضَيْنَا إِلَيْهِ ذَلِكَ الأَمْرَ﴾ بە (قطع)ی لە دڵیا جاگیرە، شکی نەما چیە ئەو (أمر)ە؟ ﴿أَنَّ دَابِرَ هَؤُلاَءِ﴾ دوایی ئەو (قوم)ە ﴿مَقْطُوعٌ﴾ ئەبڕێتەوە، کەسیان نامێنێ، کوردی دوعا ئەکا، ئەڵێ: "دەك رەبّی دوات بڕێ" دەربارەی نەتەویستی ﴿مُصْبِحِينَ﴾ وەقتێ (داخل)ی سبەینی بوو ﴿وَجَاءَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ﴾ (خبر)ی میوانیان نەزانی بوو، هاتن بۆ لایان (مَلاّ)ی (لوط)ی ﴿يَسْتَبْشِرُونَ﴾ (مسرور) و (کیف) خۆش بوون. ﴿قَالَ إِنَّ هَؤُلاَءِ ضَيْفِي فَلاَ تَفْضَحُونِ﴾ آبڕووم مەبەن، شەرمەزارم مەکەن ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ لە خوا بترسن ﴿وَلاَ تُخْزُونِ﴾ رەزیل (مُحقَّر) و (مُهان) و (مهتوك)م مەکەن ﴿قَالُوا أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنْ الْعَالَمِينَ﴾ کەس بە میوانی ڕامەگرە، یاخود کەس لە پەنای خۆت مەگرە ﴿قَالَ هَؤُلاَءِ بَنَاتِي﴾ ئەی قوم، ئەی خۆی ﴿إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ﴾ بۆ (دفع)ی (دغدغە)ی (شهوت) ﴿لَعَمْرُكَ﴾ (خطاب)ە بۆ (حضرەت)ی (خاتَم) یا (لوط) ﴿إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ﴾ بەمەستی ﴿يَعْمَهُونَ﴾ کوێر ئەبن، (عقل)ی (واعی) یان نامێنێ، (میل) کەهاتە جۆش وخرۆش، (عقل) و (نصح) خۆی ناگری، (فائد)ە نادا، (غیر)ی (ضَربە) هیچ شت کارێ ناکا. ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ﴾ دەنگی هائل، (صاعقە) (إنفلاق)ی (برکان) ﴿مُشْرِقِينَ﴾ وەقتی (شُروق)ی (شمس) ﴿فَجَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا﴾ ژێر بەرەژێر ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً﴾ بەرد ﴿مِنْ سِجِّيلٍ﴾ سەنگ وگڵ، لە (إنفلاق) بڵند بوو، بۆ هەوا، دوایێ بەسەریان داباری ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِلْمُتَوَسِّمِينَ﴾ (ناظر) و (مُتَفَرِّس) و (مُعتَبِر) لێك نزیکن ﴿وَإِنَّهَا﴾ (قُری)ی وێران بووی، ژێر بەرەژێر کرای ﴿لَبِسَبِيلٍ مُقِيمٍ﴾ ڕێیە (ثابت)ە، (آثار)ی دیارە. دیارە ئەگەر (ضمیر) بۆ (ئایات) یا (حجارەت) یا (صَیْحَە) بێ، ڕێ ئەگۆڕێ ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ نە (طبیعیّون) ئەوان بە (آیەت)ی لێ ئەدەنەوە بە (غضب الطبیعە)ت. (حقاً) (بَشَر) زۆر گۆڕایە، بەلای إعتباردا ناڕوا ﴿وَإِنْ كَانَ أَصْحَابُ الأَيْكَةِ﴾ (بقعة)یە بەدار، تێکڕایی پڕ، (قَوم)ی (شُعیب) ﴿لَظَالِمِينَ﴾ (مُتجاوِز) لە

(حدّ)ن ﴿فَانْتَقَمْنَا مِنْهُمْ﴾ لێرە بە چی (عذاب) دراین، (بَیـان)ی ناکا ﴿وَإِنَّهُمَـا﴾ (قوم)ی (لوط) و (أصحابُ الأیکة) ﴿لَبِإِمَامٍ مُبِینٍ﴾ لە (مَقـام)ێ دان، لـە وێنـەی (إمام) و پێشەوان، بۆ (أهل)ی (فسوق) و (فجور) ﴿وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَابُ الْحِجْرِ الْمُرْسَلِينَ﴾ (ثمـود) قـومی (صـالح)، وادیـارە (إنكـار)ی (رسـالەت) ئەكـەن ﴿وَآتَيْنَاهُمْ آيَاتِنَا﴾ (لازم) نیە هەر حوشـتر بـێ، بـۆ (جَمـع) چـەند (آیـەت)ی لێ (إستخراج) بكەن، با (آیات)ی (عقلیّة) بێ، با (خـوارق) بـن، وە (نَقـل) نـەكراین ﴿فَكَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ رویان تـێ نـەدەكرد ﴿وَكَانُوا يَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ﴾ ئەیان تراشـی ﴿بُيُوتًا آمِنِينَ﴾ لـە (هَـدم)، لـە دڵۆپـە، لـە (عـذاب) ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ﴾ شریقەیە گەورە ﴿مُصْبِحِينَ﴾ باتاپێش نیوەڕۆ بێ، لەبەر (خـاطر)ی (دواب)﴿فَمَا أَغْنَى عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ لـە (نحت) و (تَقـوّی مَحَـل) ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾ پڕە لـە (عِبَـر) و (آیـات)، ئـەوی (إعتبار) نەكا بە (هلاك) ئەچێ ﴿وَإِنَّ السَّاعَةَ لآتِيَةٌ﴾ بۆ (جَـزا)یـە (تـام) دائمـی. ئی دنیا (مُوقّت)ە ئـەڕوا ئەگـەر (بشر) نەژیەتـەوە، (حقـاً) (خلـق)ی (عـالَم) – (عُلوی) و (سُفلی)– بـێ هوودەیـە (باطـل)ە ﴿فَاصْفَحْ﴾ (إعـراض)یـان لێ بنـی ﴿الصَّفْحَ الْجَمِيلَ﴾ (إعـراض)ێ جـوان و (حـسن) و (لطیـف). (دعـوەت)ی (إلی الحَق) بكە بە (حِلم) بە قسەی نەرم، بێ (خـشونەت) و بـێ (أدبـی) ئـەوان هـەر (نـوع)ە قـسەیە ئەكـەن، بابكـەن، تـوو لـە (مُجامَلَـة) لامـەدە ئـەو (صَـفح)ە (جمیل)ە (أدبێ) ئەوەنـدە (مَحْكـم)ە، بەجێیـە، بـە (دینـەمێت) (زائـل) نـابێ، (نَسخ) ناكرێتەوە، چ جایە (سیف)؟ كە شیر ئێـستا وەك ناوبریـشكە ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ الْخَلاَّقُ الْعَلِيمُ﴾ هیچی لێ بزر نابێ، لە (دُنیا) لە (عُقبا) ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا﴾ (مُقابـل)ی حـەوت (بـاب)ی (جهـنم) ﴿مِنَ الْمَثَانِي﴾ لـە (أمـور)ی (مُكـرّر)ەو (مُجدَّد)ەی (بَیْن الأمم): (ئایاتی توحید الله)، (حاجەت بە رسالەت) (جمعی بین الرسل لە إیمان) (آیاتی تواضع وصَفح)ی، ئایەتی عزەتـی نفـس)، (أقتـصاد لـە لذائذی دنیا)، (نبذی أُمْنیّات). (تفسیر)ی بە (فاتحە) زۆر جوانە، كە ئەو (طُرُق) و (أبـواب) ەی بـە (إجمـال) تیایـە ﴿وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ﴾ (حَبْـلُ اللَّـهِ الْمـتین)،

(الحاوی) (علی الْآیاتِ وَالْعبَر)، (هادی الکُل) (الی أوْضَحِ السُّبُل) (نـور)ی (مُـبین) ﴿لاَ تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ﴾ دووچاری (إنتظار) و (طمع) درێژ مەکە ﴿إِلَى مَا مَتَّعْنَـا بِـهِ﴾ لە (شهوات) و (لذائذ)ی (دنیـا) ﴿أَزْوَاجًـا مـِنْهُمْ﴾ (أصـناف) لـەوان، (یهـودی)، (نصاری)، (مجوس)، (روم) و (إیران)، (رجال) و (نساء)یان. (أساس)ی هەموو (سَیِّئات)، (إنغماس)ی (فِي الـشَّهَوات)ە. (مجـد)ی (إلاه)، (إنکـار)ی (رسـالـەت)، (إنکار)ی (قیامەت) بۆ (إتمـام)ی (لَـذەت)ە. تـا (مَیـل)ی (لذائـذ) (زیـاد) ئـەکا، (بَـشَر) لـەخوا، لـە (رسـول)، لـە (شـرف)ی (إنـسانی) دوور ئەکەوێتـەوە. (دَنائەت)ی (نفس) و (أصـل) گەیاندینیـە، (درجـە)یـی (أُمـور)ی ئەوەنـدە بـێ شەرم و (حَیا)یانە ئەکەن، مەیمون (مَخجُول) ئەبێ کە ئەڵێن: "لـە (قِـرد)یـن"! ﴿وَلاَ تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ﴾ (حقیقةً) ئەوەی (مُصلح) و ساغ بێ، کە تەماشای (حـال)ی (بشر) ئەکا، (حُزن)ێ (عمیق)ی بەسەردادێ ﴿وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ باڵە خۆڵ بی، (أولاد)ی گاوان بن، بە (نَسب) (مَغـرور) مەبـە، (فـرق) مەکـە، بنـوارە (قابلیّـەت) و (إسـتعداد). باڵیـان بـۆ شـۆڕکە، بـە (کمـال)ی (تواضـع) و (مَرحمەت)بە لەگەڵیان، (تکَبُّر) و (کِبرْ) نەکەی لەسەر گچکەو ژێردەستی خـۆت ﴿وَقُلْ إِنِّـي أَنَـا النَّـذِيرُ الْمُـبِينُ﴾ (کاشـف) بـێ (مُداهَنـە)یێ، (حَـق)، (صـریح) و (صراحةً) (بَیان)کە. ﴿كَمَا أَنْزَلْنَا عَلَى الْمُقْتَسِمِينَ. الَّذِينَ جَعَلُوا الْقُرْآنَ عِضِينَ﴾ (مُفَسِّر)ینی (کرام) لە (أصحاب) و (تابعی)ن و (سلف) و (خلف)ی (صـالح)یـن، (ناقل)ین و (مُحَقِّق)ین، قـسەیان لـەو (ئایـەت)ە کردیـە. (أولا) (إمـام)، (ثانیـاً) (مُفتي الأنام)، (ثالثاً) (مُفتي دار السلام) (حشر)یـان کردیـە، (خاصـةً) (سـیِّدی ئالوسی) خوا خێری بنووسی. (مَدار)ی (خِلاف) (سێ) شتە: (کَمـا)، (مُقتَـسِم)، (عِـضین) نـاتوانم وەك (سـیِّدی ئالووسـی) ئـەو هـەموو (أقـوال) و (نقـض) و (إبرام)ە بنووسم. (لکـن) بـو (إقنـاع)ی دڵـی خـۆم ئـەوە ئەنووسـم، گـوێ ی لێ کەن، (جناب)ی (حق) ئەفەرموێ:"ئێمە قورئانمان ناردیـە، بـۆ تـوو، هـەر وەك (کتـاب)مـان بـۆ (مُقتَـسمین) ناردیـە، ئەوانـە (بَنـی إسـرائیلی)ن، (تقـسیم)ی (مـیرات)ە (حـضرەت)ی (إبـراهیم) لـە (بَـین)ی خۆیـان ئەکـەن، چـونکە داکـی

(جاریه) بوو، (إسماعیل) لە (إرثی) (مَعْنوی) (خاصةً) (محروم)ە، وە (كذا) (أعقاب)ی، ئەوە كە ئەڵێن: ئەوانەن كە قورئانیان پارچە پارچە كردیە، (سحری)یە، (خُرافە)یە، (شعری)یە، دزراوە، وەرگیراوە، بێ (أصل)ە (مجهول)ە ! ئەڵێن:"(أولاد)ی (إسماعیل) (أُمیّ)یە لە دێ ی (أُمیّان)ە، لەبەری ئێمە نیە، ئەگەر لە (مكە)ش نەبووین (طبیعی) زیارەتیان كردیە." ئەوەش یەكێكە لە (أبواب)ی (جهنم)، بەڵكوو دوو (إتباع)ی (شیطان) لە (فَخر) بەو (إستحقاری)یە، (تَفرق)ەی (بَین الرُّسل)، (بَینَ الاخوین)(بین الامتین). ﴿فَوَرَبِّكَ﴾ ئەو سوێندە چەند جوانە ﴿لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئەو وەقتە ئەزانن، (إنتصاب)ی (صُوری) (دَمی) كە (معنوی) و (دینی) نەبێ، بێ هوودەیە وەباڵە ﴿فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ﴾ (إظهار)ی كە، (إمضا)ی كە، (حق) و (باطل) لێك كەوە. پەردەی دەماغیان، تەپڵەكەی (صَمّاخ)یان، پێ شەق كە، (تفرقە)یان پێ بخە ناو ﴿وَأَعْرِضْ عَنْ الْمُشْرِكِينَ﴾ (مُبالات)یان پێ مەكە، هەر (هَذیان)ی ئەی كەن، با بیكەن، ئەمەش (منسوخ) نیە (مشاء الله)، (بعض)ێ لە (أوائل) چەند (حەن)یان لە شێربازیە، هەڵ ئەكوتنە سەر (ئایەت)، بەشێر (نَسخ)ی ئەكەن. (أمّا) لە (نظر) ئێمە، شێر (مُقابلە)ی (آیەت)ناكا، (ثابت)ە (لا یَنسَخُها)یە ﴿إِنَّا كَفَيْنَاكَ الْمُسْتَهْزِئِينَ﴾ ئەوانەی قەشمەری یان پێ ئەكردی، (ولیدی بن مُغَیرْ)ە، (أسود بن یغوث)، (أسود بن المطلب)، (حرث بن عقیل)، (عاصی بنی وائل) وە چەند (إقوال)ی تریش هەن، پێ ی ناوێ. خوا شەڕی وانەی لە كۆڵ پێغەمبەر كردەوە، هەریەك بە دەردێ چوون، (ظاهر)ی ﴿الَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ﴾ (عامّ)ە، لە (مُشرك)ان، كەوابێ (وعد)ە بە (نصر)ی (تام) ﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ وەك لە (دنیا) دیتتان لە (آخر)یش ئەیبینن، ئەیزانن ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ﴾ لە (إستهزا) و (وقایع)ی (شِرك)یان، (شرح)ی (صدر)مان كردی، (دنیا)مان لەسەر وان تەنگ هێنا ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ﴾ (حمد) و سوپاس و (قدسیەت) بۆ ئەو خودایەیە، كە تووی (حفظ)كرد، ئەوانی كەنەفت كرد ﴿وَكُنْ مِنْ السَّاجِدِينَ﴾ (سَجد)ەیی

(شكر) بۆ خوا بەرە، لەگەڵ وان﴿وَاعْبُدْ رَبَّكَ﴾ بە (إحترام)ی فەرمايشاتی ﴿حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ﴾ (أمر)ێ (مُيَقّن)، (دفع)ی (عَدو)، (نشر)ی (دين)، (إتمام)ی (نعمة) بە (نصرەت)، وە (غَلَبَ)ەی (قطعی)، (أمّا) (تفسير)ی بە مردن، لام خوش نيە. زێرا (إنتظار)ی (موت) (مناسب)ی (حاڵ)ی، (رسول) نيە، بۆ كەسێ ئەو (أمْر)ە ئەكرێ، (مُنزَوی)بێ، (عبادەت)ی خوای بكا، تا (أمرێ)، وە لە (عالم) گەڕێ. ئەگەرچی هەموو (مُفَسِّر)ەكان (عقلّی) و (نقلی)، بە (مَوت)ی (تفسير) ئەكەنەوە، لام (مناسب)نيە.

## سورەتی (نحل)

زێرا کەسێ بە (إنصاف) تەماشای (أوّل)ی (آیەت)ی (سورە)ی (نحل)، کە سەدوبیست و هەشتە (مکّی)یە (مَدنی)یە، (خلافیە)بکا، لەپاش

﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾

وە بە (تأمّل) بنۆڕێتە (أمْر)ی لە ﴿أَتَى أَمْرُ اللَّهِ فَلاَ تَسْتَعْجِلُوهُ﴾ ئەزانێ ئەو (أمر)ە رەنگینە، (مُیَقّن)ە (أمر)ی (آتی)یە، کە (وعد)ی (إلە)ە بە (نصر) و (غلب)ە، رێك کەوتنی (أمور) بو (حضرەت)ی (رسالەت پەناه)، وا مەزانە، گەردەن کەشانی (أصحاب) ی (رسول) کە سەرومالّی خۆیان بۆ بەرزی، (دفع)ی (عدم)، کردیە، ئەو (أمر)ەیان بە (قیامەت) (تَلَقّی) کردیە،بەڵکوو ئەیانزانی: (أمر)ی سەر بەرزی و سەرفرازی یە. (تباشیر) و (علائم)ی (نصرت) و (تشکیل)ی (مُلك) و (دین) بەدەرکەوت، پشتیان شکا بە (دفع)ی (صَنادید)یان. ئەوجا (إتخاذ)ی (تدابیر)کەن بە (تأنّی). وا ئەبێ (قوم)یێ، (إنتظار)ی (إستقلالیەت) ئەکەن، هەندی (علائم)یان بو (ظاهر) ئەبێ، (صبر) ناگرن، (تأنی) ناکەن، لە (احوالات) و (ظروف)ی تر نا(فکر)ن، (قصر)ی (نظر)یان هەیە، تالّووکە ئەکەن، خۆناگرن، زوو (إنفلاق) ئەکەن، (مُوفّق)نابن، بە ئێوە وامەکەن ﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ دەرنەکەوێ بۆیان، (شرکاء) بێ کەڵکن، چیان پێ ناکرێ، ئێوە و خودا ﴿يُنَزِّلُ الْمَلاَئِكَةَ بِالرُّوحِ﴾ چ (روح)؟ (روح)یێ ﴿مِنْ أَمْرِهِ﴾ لە (شأن)ی خوا، (روح)یێ کە (حیات)ی جاویدانی ئەدا. لەگەڵ مردن و (قیامەت) رابوون رێك ئەکەوی؟ ئەوجا تەماشای (بعض)یێ لە

(جَهَلَـه)ی (صُـوفیّه) کـه چ بـه (یقـین) ئەکـەن، ئـەوان (یقـین)یـان هەیـە، (حاجەت)یان بە (عبادەت)نیە، (حتّـی) بـۆ (إنتهـا)ی (غایـەت)ە. (حقـاً) ئـەوە (قَوْل)یّ زۆر بە (حَماقەت)ە، گۆی یا ئـەو وەقتـە (جنـاب)ی (رسـالة) پـەناە. (یقـین)ی نـەبووە، وە تـا چـوویتە (رحمـەت)ی خـوای، (مُواظبـە)ی لەسـەر (عبادەت)ی خوای کردیە، ئەبێ تا مردبێ (یقین)ی بۆ (حاصل) نەبووبێ ﴿عَلَى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾ کەسـێ (ذي شـأن)، (فطـرەت) خـاوێن، بـە (إسـتعداد) و (قابلیەت)یّ تەواو، لە عومری خۆی بـە (خیـال)ی دا نـەهاتبی ببێتـە (رسـول)، (واقعاً) (رسالەت) و (نبوّەت) (کسبی) نیە کەسـێ بـە تـەمای بـێ، بـۆی نابـێ. (أمّـا) ئـەو (مَنْقَـب)ە نادرێتـە، هەرچـی وپەرچـی یـان، ئەدرێتـە (زُبـد) و (خلاصە)یی، (إنسان). (روح الحق)ی (مَتین) بێ ترس و (مَیـل) و (مُحابـا) ﴿أَنْ أَنذِرُوا﴾ (قوم)ی خوێش وبێگانە ﴿أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا﴾ چ خوای تر نیە (حفظ)تان کا، لە (عذاب)ی خوا بتان پارێزی ﴿فَاتَّقُونِ﴾ خۆتان لە (عذاب)ی من بپـارێزن، (شـریك)آن پـەیا مەکـەن، ئـەو (ذلّ) و (خـضوع)ی بـۆ أصـنام و (هیاکـل) ئـەینوێنن، بـۆ منـی بکـەن ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِالْحَقِّ﴾ ئـەوا (رسـول) (آیات)یان بۆ (بیـان) ئـەکا ﴿تَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ ئـەوان چیان پـێ نـاکرێ، (أجرام)ی (جامـد)ن ﴿خَلَقَ الإِنسَانَ﴾ خۆی (آیـەت)یکـە (فـوق الأیات)، خـوا إنسانی (خلق) کردیە ﴿مِنْ نُطْفَةٍ﴾ (ظاهر)ی (معلوم)ە، (حقیقەت)ی بە (کیمیا) ئەزانـدری ﴿فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ﴾ چۆن (تطـور) ئـەکا، ئەبێتـە (ذات)یّ (نَطـوق) (مُجادل)، (إثبات)ی (مدّعی) بە (دلیل) ئەکا!

خوایە چەند لێك دوورن، لەبەر (بُعد)ی (حُکما)ی (إلهیّـون) (إنسان) ئەکەنـە شتێ تـر، (مُجَرَّد) (جـوهر)یّ (مَحـض) لـە (شـائبە)ی (مـادّە) دوور، ئـەوی لـە (نُطفـە) (خلـق) کرایـە، (نبـات)ە (حیـوان)ە. (حقـاً) إنـسان (مُحَیِّـر العقـول)ە، (ظاهراً) بە (بعض)ی (لُطف)ی (مِزاج) و (دقّەت) (ترکیب)ی (ممتان)ە، (أمّا) لە (حقیقەت)دا (مُناسبە)ی لەگەلّ (حیوان) زیاتر هەیە، (إلاّ) بۆ (أُمـور)ی (خَفیّـە) (إنسان) ﴿مُبِينٌ﴾ (إستخراج)ی (قواعد) ئەکا، خەریکە بـە (عِلـم)، (إحاطـه) بـە

(کائنات) بدا، تەماشای حُکمای ئێستاکە، ئەوانی (مُختَرِع) چ ئەکەن؟ ئەوانەی ئەمڕۆ دەڵێن، "پێغەمبەرین" وەك (بهائی) و (قادیانی)، ئەگەر (إنصاف)یان هەبێ، (نَظَر) بەوان، خۆیان بە (إنسان) نازانن، چ جایە، (عالم) چ جایە (رسول)؟ لەسەر (إنتشار)ی (علم) و (عرفان) (سَواد البَشر) (ألآن)یش (جاشك)ن، كەر پەرستن (لا حَولَ وَلا قُوّةَ إلاّ بالله) ﴿وَالأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ﴾ خۆزی لە خۆیان وەلە (الأنعام) (فكر)بیان (تفوّق)ی (حیوان) لە (جماد) وە (إنسان) لە (حیوان) یان بزانیبا! ﴿فِيهَا دِفْءٌ﴾ (أسباب)ی (لباس) کە پێی گەرم دادێن، گەرم دەبنەوە، لە خوری، موو، (وَبَر)، ئەوەی ئەمڕۆ لەوانە دروست ئەکرێ ((حیرَت) ئەفزایە، لە گەرمادا هینان، تێپەڕیوە ﴿وَمَنَافِعُ﴾ شیریان ئەخۆنەوە، سواریان ئەبن، جووتیان پێ ئەکەن، (ناعور)یان پێ ئەگێڕن ﴿وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ گۆشتیان، دوونگیان، ماست، پەنیر، سەرتوو، لۆر، ژاژی، شیرێژ، (فی الحقیقە) لە وەختی خۆی ولآتی ئێمە (علم)ی تیا بووە، هەوێنیان دروست کردیە، بەو هەوێنە ئەو (تَحوّلات)ە بەشیر ئەکەن، ئەی (علم) بۆ کوێ چووی؟! ﴿وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ﴾ (زینەت) و (شوکت) و (حَشمَت) ﴿حِينَ تُرِيحُونَ﴾ وەقتی ئێواران ئەیانهێننەوە لە چراگاه، بۆ (مَراح)ی: (کۆن) و (هەوێن) و (تەویلە) ﴿وَحِينَ تَسْرَحُونَ﴾ کە سبەینان ئەیانبەن بۆ لەوەڕ، (واقعا) جوانە. کابان هەڵئەستێ، ئەوی شیری هەبێ ئەیدۆشی، وردە وردە بەخێر ئەگەڕێتەوە، گاوان بانگ ئەکا، شوان ئەقوولێنێ، بۆڕەیی چێڵ، نقەیی گامێش، بارەبارِی مەڕوبزن ﴿وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ﴾ باری گران هەڵئەگرێ، حوشتر بۆ (عەرەب) گاجووت بۆ (عشائر)ی وان و کوردو (سائر)ی ﴿إِلَى بَلَدٍ﴾ (یەمەن)، (شام)، (مصر) بۆ (مکة) (رحلة الشتاء والصیف)، (بغداد) و (بصرا) و (موصل) و (هەولێر) و (کۆیە) بۆ (عێراق)، (شام)یش بۆ کاوڕەگەل، (مَواقع)ی (صَیفیه) بۆ کۆچەرات. ﴿لَمْ تَكُونُوا﴾ خۆتان بە پیادەیی، بە کۆڵ وبار ﴿بَالِغِيهِ﴾ نەی دەگەیشتنێ ﴿إِلاَّ بِشِقِّ الأَنْفُسِ﴾ (مَشَقَّة) و (تَعَب)ێ زۆر، (روح)تان ماندی ببی ئەوانەی (إنكار)ی (طَيّ الأرض) ناکەن بۆ (أولیا)یان بە

(کرامەت)، بەم (آیەت)ە (إستدلال) ئەکەن، ئەڵێن: بۆ نابێ بە سووك وئاسانی، لە کوێیە بە شەقاوێ بگاتە (شام)؟" (واقعاً) (إستدلال)یان بێ مەعنایە. (أصل)ی (طَيّ الأرض)یش وانابێ، (ممكن) نیە (أرض) ئەوەندە وێك بێتەوە بە شەقاوێ لەم شار بۆ ئەو شار بازدا، (قابل) نیە. ئەو شارو مملەکەت لە بەینایە چیان لێ دێ؟ إنسان ئەبێ بفلیقێتەوە، وە (فراغ)ی (بَين الأجزاء) ئەوەندە نیە، بەو دەرجە بچێتە پاڵ یەك. (أمّا) (عالَم)ی (کرامەت) وەك (عالَم)ی خەون وایە، حکایەت ئەکەن، بێ (محاکم) و تێ (فکر)ین، حتّی گەلێ لە مەلای گەورە گەورە، (عقل)ی (واعی)ی کەم ئەکەن بە (عقل)ی بێ (وەعی) وەك (عَوام) بێ (تَفَکّر) حکایەت ئەکەن! ﴿إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ بۆیە بەو (نوع)ە (تسهیل)ی (أمُور)تان ئەکا.

ئەمڕۆ (لاشك) (أرأف) و (أرحم)ە، بە (قطار) بە (سیّارە) بە سووکی بە خۆش و ئاسانی، لەو سەری دونیا ئەچنە ئەم سەری دنیا، و (کذا) بە (طیّار)ە، ئەمساڵ حاجی کوێیە لە (بغدا) بە (٦) رۆژ گەیشتنە (مدینە)ی (نبوی). جاران بە (٤٠) رۆژی بەو (عذاب)ی کە لەسواری حوشتر ئەیان دیت لە (شام) ئەچوونە (مدینە). ﴿وَالْخَيْلَ﴾ ولاغی بەرزە ﴿وَالْبِغَالَ﴾ هێستر ﴿وَالْحَمِيرَ﴾ (معروف)ە ﴿لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً﴾ زین و (زینەت)ی ولاغی یەك سم، (إنکار) ناکرێ، خوا خۆی ئەفەرموێ، دیارە (فائدە)ی (رُکوب) زێترە، لە (مُجرَّد)ی راگرتنیان بۆ (زینەت) ئەوانە ئەخورێن ناخورێن؟ لە (موقع)ی خۆی ئەزاندرێ، (آلیەت) تەماشای (زێدە) (مُناسبە) ئەکات، (نُظّار) لێرە خۆڕایی خۆماندی ئەکەن ﴿وَيَخْلُقُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (ظاهر) وایە لە (حیوانات)ی سەر (ارض)ی بێ، گەلێ (نوع) هەیە تازە، دۆزراوەتەوە. دیم بزنی کوێیە، لە نێریە کێوی (فرخ)ی هێنابوو، جوان!

ئەگەر بێنە سەر باسی میقرۆبان (إلی ما شاءَ الله) زۆرە. (أمّا) (حمل)ی لەسەر (ملائکە)ی (أعجُوبَە) وە(أرض)ی هەزار ساڵ رێ، وەچیای (یاقوت) وە (أرض)ی (سمسار) بووە، بێ معنایە. (قابل)ە هەزار ملیون (نوع)ە کائنات هەبێ (بَشَر) (إلی الأبد) (علم)ی پێ نەبێ، وەدیارە قسە لە بەهەشت نیە،

وە(شمول)ی بۆ (قطار) و (سیّارە) و (طیارە) دوور نیە، ئەگەرچی ئە زەمانی دوور بوو، بەڵکو نێزیك بوو (طیار)ە لایان (مُحال) بێ ﴿وَعَلَى اللَّهِ قَصْدُ السَّبِيلِ﴾ ڕێی ڕاست لەسەر ئەوە، (عائد)ی ئەوە، ڕێی (عام)، بێ خوارەکەو پێچکە، لە (طَرَف) خواوە نەبێ نابێ (بَشَر) خالّی نیە لە (مَیل) (خصوص) خوێندەوار (رأساً) (متأثر)ە،

(شرائع)ی (إلاهی)، (رؤسا)ی (دین) بە (قومیەت) ئەی گۆڕان، لەبەر (طمع)ێ یا ترس، (تحریقات)ی ئەکەن ﴿وَمِنْهَا جَائِرٌ﴾ (مائل)ە لە (حقّ) و (عدالەت) (عقل) (حاشا) (مَغْنی) نیە لە (رسالەت)، ئەوەی ئەو (إدّعا)یە بکا یا زۆر (غافل)ە یا (مَغرور)ە، یا (فکر)ی (فاسد)ە، (عقل)ێ کە بتوانی (قانون) (وَضع) کا، (عقل)ی (واعی)یە، (ذی تدبیر) و (مُحاکمە)یە، (عارف) بە (أمزج)ەی (بَشر) بە (أحوال)ی (بلاد) و (مناخ)ی (فَوْقَ الكُل) (بَشر) بە(نظر)ی یەك بێ، (تقدیم)ی خزم و (عَشیرەت) نەکا، لەسەر (فِطرەت)ێ پاك گەورە بووبێ، (عقل)ی (غیر)ی نەچووبێتە ناو، (أوصاف)ی (حمیدە) بێ، دووری عەردی (حضارەت) بی، (قُرَنا)ی باش بن، ئەو (عَقل)ە کووا؟ (خاصةً) ئەوەندە بە (قوّەت) بێ،(مَیْل) بە دوای خۆیدا، خۆی دوای (مَیل) نەکەوێ. لە (ملیار)ێ ئنجا (عقل)ی وا (عاقل)ێ وا بەدەست کەوێ. ئەو (إنسان)ەش ئەبێ بە (وَحی) (إلاهی) (رَبُّ العالَمین) (وَضع)ی (أحکام) کا، خوا (ذاتاً) خوای هەموانە (تقدّم) بە (وحدەت)ی (مِزاج) و خاوی نیە، (واقعاً) ﴿وَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ (أمّا) (تبدیل)ی (فِطرەت)ی پێ ئەوێ، یا ئەبێ. (مادام) (بَشر) (مُختلِف) بن لە (خُلق) (مُختلف) ئەبن لە (رُشد) و (هدایەت) و (علم) و (زکا) و (مَیل). وە (إلاّ) (بَشر) لە (حال)ی ئێستای (قابِل) نیە لەسەر (هیدایەت) گرد ببێتەوە بەڵێ تەماشای (إمکان)ی (ذاتی) کەین، کە (مقابل)ی (وجوب)ی (ذاتی) و (إمتناع)ی (ذاتی)یە، ئەڵێن: "(ممکن)ە" (لکن) (دائرە)ی (تکلیف) لە (محیط)ی (إمکان)ی (إستعدادی)یە، ئەو (قسەی) (معتزلی) و (أشاعرەی) پێ ناوێ، (وقوف) (علم)ی (نفسی) پێ ئەوێ، (مع أنّه) بوونی (ممکن) وێنەیە،

(سجل)ی (طَرز)ی (خیالّی) کەی (ممکن) ئەبیّ؟ (وَبِالجُملَه) ئەو (ایەت)ە، (إشارە)یە بۆ (لُزوم)ی (رسالەت) ریّی راست بیّ (رسول) (فتح) ناکریّ.

ئەمرۆ بنۆرە (جادّە)ە بیّ (مهندس) ئەبیّ؟ تەماشای کۆلّینی چیایان کە، ئەوجا قدری (مهندس) ئەزانی ﴿هُوَ الَّذِي أَنـزَلَ مِـنْ الـسَّمَاءِ مَاءً﴾ (دقـەت) کە چەند (صاف) و بیّ (غش)ە، ئەوی لای خواوە بیّ وایە ﴿لَكُمْ مِنْهُ﴾ لـە (مـائی) ﴿شَرَابٌ﴾ ئەی خۆنەوە ﴿وَمِنْهُ شَجَرٌ﴾ (ظاهر)ە لە دار ﴿فِيهِ تُسِيمُونَ﴾ (شجر) (حیوان) گەلاّی ئەخوا، (حتّی) لـە ولاّتـی ئیّمـەش (گـەلاّدیّ)ی لیّ دادەنـیِن، بـۆ زستان کە بەفر پووش وپاوان دادەپۆشی ﴿يُنْبِتُ لَكُمْ بِهِ﴾ (أشاعر)ە گویّتان لیّ بیّ ﴿الزَّرْعَ﴾ گەنم، جـۆ، (سـائری) (حبوبـات) و (أقـوات) ﴿وَالزَّيْتُـونَ وَالنَّخِيـلَ وَالأَعْنَابَ﴾ لام ویە خۆماندی کردن، بە (تقدیم) و (إفراد) و (جمع)ی ئەوانـە زۆر (فائدە)ە نیە، (مـع أنّـە) (بلاغـەت)ی (قـولی) (تـابع)ی (بلاغـەت)ی (کَـوْن)یـە. ﴿وَمِـنْ كُـلِّ الثَّمَـرَاتِ﴾ سیّو، هەلّوچـکە و هـەرمیّ، هـەنار، هـەنجیر، ئـالی بـالی، زەردەلـوو، خـۆخ، کرۆسـك، گیّـوژ، ئەوانـە ئەگـەر چـی (أکثـر)ی (بُـستان)یـن، (إمـداد)ی ئـاو لـە بارانـە. ﴿إِنَّ فِـي ذَلِـكَ﴾ لـەو (تـدبیر)ە ﴿لآيَـةً﴾ (لا تُحـصی) ﴿لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (حتّی) (تفکّر) (إنسان)ی گەیاندە (دەرجە)یـە (جمـال الـدین أفغـانی) ئەفـەرمویّ: دار (حیـوانی سـاکن)ە، لاقـی بـە (أرض)ا، رۆچـووە، (حیوان)ی داری (مُتَحَرِّك)ە (أحـوال)ی (نباتـات)یـان (ضـبط) کردیـە، (عَـین)ی (قُوی)یە کە لە (إنسان) و (حیوان)دا هەیە، (هاضـم)ە (غـازی)یـە، (نـامی)یـە، (دافع)ە (مُولِّـد)ە (مُـصَوِّر)ە، (والیـوم) (أجانـب) تـیّ ئەکۆشـن بـۆ (إصـلاح)ی (نباتات) و (حیوانات) و (أشجار) ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ﴾ نیزیّك لە (إعتدال) ئەگەر (مَقصد) بە (خطاب) (مکّە) بن ﴿وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ﴾ لە (آفـاق)ی ئیّـوەش وەك (سـائر)ی (بـلاد)ی کـە (مَنْبَـع)ی (مُتَفَکِّـرین)ن، رۆژو مـانگ هەلّـدیّن وئـاوا ئەبن، (مُدّە)یەشەو (مدّە)یە رۆژ، یەك لە دوای یەك (تعاقُب) ئەکـەن، بـۆ ئیّـوە تەماشا ناکەن؟ بیّ (تفکّر)ن لەو (کائنـات)ە ! (شمـس) و (قمـر) بـیّ (شـعور)ن وەك (أرض)ی ئیّمەن، قـسەی (یۆنـانی) یـان بـۆف دەرچـوو، (لیـل) و (نهـار)،

(جمعه) و مانگ دیارن، (مجسّم) نین، (مدّه)یەكن لە (زمان)، بە (إعتبار) ناویان بۆ دانراوین، (بعض)ی قسان (نقل) دەكەن، (أوهام) و (خیال)ن، ئەوەی لە (رسول أكرم) بە (صورەت)ی (قطعی)، بێ (تصریف)و (تأویل) پێت گەیشت، (قبول)ی بكە، ئیتر هیچ. بە (مُحالات) رێ لە خۆت مەگۆڕە، وە (إلاّ) لە (أساس)ەوە، ئیشت لێ تێك ئەچێ ﴿وَالنُّجُومُ﴾ كە بەشەو بەدەر ئەكەون ﴿مُسَخَّرَاتٌ بِأَمْرِهِ﴾ (تدبیر)ی (تكوین)، نەكەی بە (مأثر)یان بزانی وەكی (خیّام) ئەڵێ: (سەرگەردانن) ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ﴾ لەو (تسخیر)ە ﴿لَآيَاتٍ﴾ (باهرات) (مُتكاثره) ﴿لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ (نظر)ی (سطحی) هەیە (أمور)ی (ظاهره) (على ماهو الظاهر) ئەبینن زۆر (تفكّر) گەرەك نیە ئەوانە چونكی (ظاهر)ن، گۆیا (مجرّد)ی (عقل) (كافی)یە، (لكن) (عقل)ی وردی (نافذ) لە (أعماق) وانیە (وفي الحقیقة) (لیل) و (نهار) و (شمس) و (قمر) خۆیان (ظاهر)ن وەگەڵێ شت لەبەر (ظُهور)ی (جَلب)ی (نظر) ناكا، (أمّا) ئەوە بە (تدبیر) و (تسخیر)ی خوایە، زۆر وردی دەوێ، وە (عقل)ی (كامل) ئەوەیە، لە مەیانی (أمور)ی (ظاهر)ە، (أمور)ی (خَفیه) (دقیق)ە، بارێك بدۆزێتەوە، جاتۆ (عاقل)ی تەماشای (مَقام)كە وە بزانە (دقائق)ی (علم)ی (هیئەت) بە (نظری) (ظاهر)ی نازاندرێ، وە (آیات)ی (قورآن)ی (عُمومی) و (خُصُوصی)یە، (حقاً) ئەوە (آیەت)ی گەورە (باهر)ە، بۆ (إنسان)ی (عاقل) و زۆر (عاقل)ە، وە (فَرق)ی (رسول) و (حكیم) لێرەیە، (حكیم) (صاحب)ی (دعوەت)نیە، خەریكی (دقائق)ە ﴿وَمَا ذَرَأَ﴾ (خَلَقَ) ﴿لَكُمْ﴾ وەك (سائر)ی (قوم)ی (بُحّاث) ﴿فِي الأَرْضِ﴾ لە ئەندەروونی، یەعنی (معادن)ی (مائع)ی و (جامد) ﴿مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ﴾ بە (لَون) جنابی (حق) (دعوەت)ی (ناظر)آن دەكا، (حتّی) رەنگی (میل)ە بۆ (جلب)ی (نظر)ی تەیروتوال لێ ی بخۆنەوە وە بخۆن. ئەو هەموو (معادن)ە بە خۆرایی چوو. (أجانب) دەریان خست، بۆ ئێوە لێ ی (محروم)ن؟ بوت پەرست بێ (نظر) و (تذكر)ە، لێك ناداتەوە: (أهل)ی (إیمان) بۆ (نفط)ی (بابا گوڕگوڕ)ی، بە (لسان)ی ئاگرینی (نِدا)ی ئەكردنێ (دەروونم پڕە لە نەوت، هاوار دەری خەن،

(نفـع)ی لێ ببیـنن) گوێتـان نـه‌بوو، کردتانـه زیاره‌تگـاه ! ﴿إِنَّ فِـي ذَلِـكَ﴾ لـه‌و (خَلْقَ)ه‌دا ﴿لآيَةً لِقَـوْمٍ يَـذَّكَّرُونَ﴾ له‌بـه‌ر (ظهـور)ی (ألـوان) (تَـذكّر) (كـافی)یـه، (أنَّهُ) له بیریان نه‌مایه، به بیری خۆیان بێننه‌وه، (أمّا) (مع الاسف) (إسـتفاد)ه لـه (كائنـات)، (تفكّـر) و (تفضـل) و (تـذمّر)ی پـێ ئـه‌وێ. (عقائـد)ی (باطـل)ه (مانِع)ه له هه‌مووی، بۆیه (مُخترِع)ه‌كان ئـه‌ڵێن: "(دیـن) (مـانِع)ی (ترَقـی)یـه" قه‌یدی نیه (مُختـرع)ه‌كـانی (ئاوروپـا)یـی وا بڵـێن، (أمّـا) ئـه‌وانی ئێمـه (كمـال فره)كان بۆ وا ئه‌ڵێن؟ ڕقیان له (ڕۆسا)ی (دین) نه‌بێته‌وه. كه‌ی(دین)، (مـلا)ی (دینـی)ئـه‌وانی لـه (علـوم) و (معـارف) و (حكـم) و (إختـراع) (منـع) كردینـه؟ گه‌رچـی (معـادن) (مُتَمثـل)ه له‌سـه‌ر(آيات)، (أمّـا) ئێمـه چمان لێ نـه‌زانی، تـا (آيات)ی لێ وه‌رگرین ﴿وَهُـوَ الَّـذِي سَـخَّرَ الْبَحْـرَ﴾ بـۆ (بَنـی آدم)، (سـياده‌ت) ی (بحر)، (خاص)ی (قوم)ێ نیه.﴿لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا﴾ گوشتێ ﴿طَرِيًّا﴾ تـه‌ڕوتازه (أمّا) (لحم القديد)یان هه‌نده پێ خۆشه، زۆر ئاگایـان لـه(لحـم)ی (طـری) نیـه، (خصوص) (سعی) و (عمل)ی ئه‌وێ، با (فُقهاء) لێـره له‌سـه‌ر گۆشـت، (دَعْـوا) بكه‌ن كه‌سێ سوێند بخوا، گۆشت نه‌خوا، به خواردنی گۆشـتی ماسـی (حانـث) ده‌بێ یان نا؟ و (كـذا) لـه (حليـه) ﴿وَتَـسْتَخْرِجُوا مِنْـهُ﴾ لـه (بحـر)ی ﴿حِلْيَـةً﴾ خشل، (مُخشّلات) ﴿تَلْبَسُونَهَا﴾ پیاو نـا ژن، (فـرق)ی چیه؟ ژن ئـه‌ی پۆشـێ، پیاو (لذّه‌ت)ی ئه‌نۆشێ. (غَرض) له (حِليه) (لۆلۆ) و (مه‌رجان)ه، (حـالا) ئێمـه لـه شـه‌ڕ نه‌بووینـه‌وه (أجانـب) هـه‌موو (جـواهر) و (معـادن)ی (دنیـا)ی بـڕی، (بحر)یان خسته ده‌ستی خۆیان، (مرجان) و (مرواری)ی كوو (تكوّن) ئه‌كا؟ لـه كوێ؟ (مَحّل)ی (أنْسب)ی (سوره)ی (الرحمن)ه، له (ره‌حمـه‌ت)ی خـوا (طلـب) ئه‌كه‌م، له‌وێ (تفصيل)ی بده‌ینێ. (طنطاوی) لێـره (بحـث)ی فـه‌رمووه، تـا لـه یادی نه‌چێ ﴿وَتَرَى الْفُلْكَ﴾ دیاره له (صُنع)ی (بَشر)ه (سـفينه)ی (شـراعی) و (أمثال)ی وی. (به‌له‌م)، (قُفّ)ه (كه‌ڵه‌ك)ی كوردان له‌سه‌ر ئاوی، وه‌ك حوشتری عه‌ره‌بانه له‌سه‌ر ئه‌رزی، به‌كاوه‌خۆ ئه‌ڕوا! ﴿مَوَاخِرَ فِيهِ﴾ له (بحر)ا، ئه‌ڕوا، لـه پێشه‌وه ئاوشه‌ق ئه‌كا خڕه خڕه‌ی لێ دێ ﴿وَلِتَبْتَغُوا﴾ به (واسطه)ی (سُفن) بـه

(بحر)ا بڕۆن، بۆ شاران (تجارەت) بکەن ﴿مِـنْ فَـضْلِه﴾ لـه (سـعـەت)ی (رزق)ی خوای، لێرەنا له ولاّتیّ دی، (سعەت)ی (رزق) به (قاعـده)ی (عـرض) و (طلـب) ئـەبی، ئەگـەر هـەموو لـه هـەموو (مُـسْتَغنی) بـین (ثـروەت) نـامێنیّ، بـەڵکو (موجب)ی (فقر)ه ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ به (عَمل) لیّ ی (زیاد) ئەکەن، (شُـکر)ی (لـسانی) لـەو (نـوع)ه (مقـام)ه، چ نیـه. ئـەمڕۆ کەسـیّ تەماشـای (بحـر) و (منافع)ی (بحر)کـا، زۆر (مُتأسِّف) ئـەبیّ لـه (محـروم)ی. لـه هـەموو (مکاتـب) ئەخونن (هنری الملاّح) لـه بـۆ غـازی (جبـل الطـارق) کووهاتـه ئـەم (طـرف)ه؟ چۆن (جزائر)ی (کشف) کرد، (خروستوف کۆڵمبوس) به چ (أمل)یّ (أمریکـا)ی بـۆ (کـشف)بـوو؟ (أمریکـۆ) کـووی تـەواوکرد؟ (بَعـد) لـه بـو غـازەی (شـط)ی ناوەنـدی کـوو (مواقـع)ی (تجـاری)یـان لـه دەسـت (مـسلمان)آن سـاند؟ ڕیّ ی(تجارەت)ی (بَرِ)یان که بەسەر (عراق)دا دەهـات، ئەچـووە (سـوریه) ئەچـوه (ئاورووپـا) کـوو بەسـت؟ (سـفینه) گـوڕا بـوه (پـاپۆڕ)، بـۆ (حربـی) (تجـاری) (غانبوه) (غوّاصه) دروست کـرا، (قعـر)ی (بحـر)ی پـیّ (کـشف) ئەکـەن! (مـع هذا) به (غیر)ی (حکایەت) چیتر نابینی، (حرکه)ی (إصلاح) نیـه. مـصلّحان لـه (عالم)ی (حیوانات) له (برّی) و (بحـری) زێـده لـه خـواردن (فوائـد)ی (علمیـه) وەرئـەگرن. (ملـّة)ی خۆیـان بـه (أنـواع)ی (إختراعـات) بلّنـد ئەکـەن. (قـسم)یّ (أعظم) له ئێمه ئەمڕۆ (جمعه)یه (١٣٥٧) (یـا مُحـوِّل الأحـوال، حَـوِّل حالنـا إلی أحسن الحال) که (أوّل)ی (محرم) ئەکەونه (عـزا)ی (حـسین)، شـین و شـەپۆڕو سینگ کوتان، ئـەڵیّ ی هـەزار شـۆڕه سـواریان لیّ مردیـه! (بَعـدَهُ) (زیـارات)ی (عتبات) (مأتم)ی (أئمه)، (طواف)ی چاڵی (سامەڕا)، ئەوانی تریش (إجعـل لنـا إلها کما لهم آلِهه)ئەوا خەریکن (خُزعبلات) بۆ خوا پەیدا ئەکەن، به (أمور)ی بیّ (معنا)، بی (فائده) خەریکن. (أدبـاء) هـاوار ئەکـەن (جَهـل خُیـوم)ی هەڵدایـه، لەسەر ولاّت، ئەو (جهل)ه چیه؟ بۆچی لێـره هەڵدرایـه؟ چـاری چـیه لاکـەویّ؟ قـسەیه ناکـەن، بـەقومارو بادەگوشـایی (تـداوی) (آلام) ئەکـەن. (نَغمـه)یـی (دعوەت)ی (مُبشر)آنی تـازه، (رُسـل)ه کـانیش لـەویّ راوەسـتی. خـوا ئـەزانی

يەكي وەك (هنري)، وەك (آديسون) بۆ ئێمە، مليوني (بَهائي) إيراني و (قادياني) ئێني! چارەی ئێمە بەو جۆرە (رسول)آنە ناكرێ. بە (رُسل)ی (سياسەت) بە (رُسل)ی (طبيعەت) ئەكرێ، كەسەكمان ئەوێ (روح)ێ باوێتە بەر (هيكل)ی (إجتماع)ی، زيندوويان كاتەوە، (سوق)يان كا، بۆ (إستفادە) لە (آيات)ی (إلهی) (صانعی)، پاكيان كاتەوە لە (زَيغی) (أمنيات)و (إعتقاديات) و (مُيول)ی (فاسِدة). (مُحقق) بزانن (ان الله لايغير ما بقوم حتّى يغيروا ما بانفسهم) لە هەمووی لازم تر (إعادە)ی (قوەت) و (إرادە)، شكاندني (قيد)ی (سُنّەت) لە (إدارە)ی (ملەت) و (دەولّەت) و (محافظە)ی (مملەكەت) ﴿وَأَلْقَى فِي الأَرْضِ رَوَاسِيَ﴾ چياى گەورەو گران ﴿أَنْ تَمِيدَ بِكُمْ﴾ چونكی (أوائل) (ظن)يان بردیە، (أرضی) معمورە لەناو ئاوە، ئەو (آيەت)ەيان بە تقديری (كراهيەت) يا ئيلاّیّ رێك خستيە، (مع هذا الحُسن) (إضطراب)ی دايتە (طود)ێ وەكی (امامی رازی)، بە (كشف)ی (امريكا) دەركەوت كە ئاو وەك (منطقە)يە بو (ارض) وە (حكما)ی (جديد)ی (فلك) ئەلّێن: (ارض) (ساكن)نيە، وە ئاسمان بە (معنا) (جِرم)ی (كُروی) (متوازی السطحين) (مركزو مركز العالم) (تعريف)ێ (خيالّی)يە، (حقيقة) لە (معصوم) وەرنەگيرايە، تا بلّێن (إنكار)ی خراپە، ئەو (ارض)ە نە (مادّی) نە (مَعنوی) ئەو (قيمەت)ەی نيە، كە (فلك)ی (دنيا) تا (فلك الافلاك) بە (شمس)و (قمر) و (سيارە) و (توابع)ی لە (دَور)ی بسوورێن، هەر (غير)ی (ارض)! (أرض)يش دوو (حركە)ەی هەيە، يەكی (يومی) (حَول مركزها)، يەكی (سنوی) (حول الشمس) كە (مركز)ی (منظوم)ەيە. بە (واسطە)ی (كشافەتە) و (ثقل)ی خۆی و (جبال)ی، (مع ما فيها من المعادن) لەگەلّ (جاذبە)ی (شمس) بەرابەری ئەكا، لە (جَذب) و (دَفع)، ئەو (حركە)يەی بۆ ئەبێ؟ (دَور)ەمان پێ ئەدا، لە (دَور)ی (مركز)ی وەلە (دور)ی (شمس)، لە (طرف)ێ بۆ (طرف)ێ، (أمّا) ئێمە بە (حس) (دَرك)ی ناكەين، وا ئەزانين ئێمە (ساكن)ين، ئەوانی تر لە (دور)ی ئێمە (مُتحرك)ن. كەوابێ (كراهيّة) و (لئلاّ)ی پێ ناوێ! وە كەسێ تەماشاكا

(آیـەت)ی (قـورآن) لەگـەڵ (کـشفیات)ی (جدیـدە) (مُلایمـە)ی زۆرە. ئـیتر چـیا چەندن، هەر (إقلیمە) چەندی تیایـە؟ بـابۆ (کُتـب)ی (هینـەت)ی (جدیـدە)بـێ. (حُکما)ی (جدید) (عدد)ی (جبال)ی (امریکا) و (قمـر)یـشیان (بیـان)فـەرمووە. (مادّ) (یعنی) (تَحرّك)، (إضطراب) (لازِم)ی نیە. بەڵێ (مادَ السَّرابُ) (إضـطراب) وەك لـە (قـاموس) ئـەڵێ:"(مـاد الرجـلُ) (تَبختَـر)" زۆر جوانـە، (حقیقـەً) (إضطراب)م نەما ﴿وَأَنْهَارًا﴾ چ (نَظَـر) بـە ئـاوی بـاران، چ (نظـر) بـە دەروونـی ئـەرزی، کـە لـە نـاوەوە فرێـی دەدا بـۆ سـەرێ، وەك چـیا (أُلْقـی) بـۆ (أنهـار) جوانەبێ (تأْویل). ﴿وَسُبُلًا﴾ ئەگەر رێـی رۆیـشتن بـێ دیـارە (جَعَـل)ەکـی پـێ دەوێ. ممکنــە (سُــبُل)ی (أنهــار)و (بحــار)بــێ. ئێــستا (سُــبُل)ی هــەوائیش کرایتەوە. ئەگەر مراد دەمـاری ئـەرزی بـێ سـپی و سـوور (مختلـف الالـوان) چ (أُلْقی) بێ چ (جَعَل)ە باشە. ﴿لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ ئـەو (هِدایَتـە)ە بـەرێ دەگـۆرێ ﴿وَعَلَامَاتٍ﴾ علامات دیارە (جعل)ی هەیە (صُنْع)ی هەیە، چیا رووبار –(سیّدی الوسی) بێنی خۆڵی دەفەرموێ–. حکایەت کراوە بَعضێ بەبێنی خۆڵ دەیزانـێ ئەو رێیە جاددەیە، یا کۆرە رێیە! ئەمە دور نیە بەلاّم لـە (نَـوادِر)ە، وە وەکـی (إمام) دەفەرموێ:(من جماعتەکەم دیت بە بێنی خۆڵ رێیـان دەردەکـرد). أمّـا من (شخص)ەکم دیت خۆڵی تام دەکرد، دەیزانـی بـۆ چ (نـوع)ە (حبوبـات)یـێ چاکە لێی بچێنن. تفسیری علامات بە ماسی درێژ و باریك وەك مار لـە رەنـگ و (حَـرَك)ە لـە (بَحـر)ی هینـد لـەولای کـە لـە (یَمَـن) بـۆی دەڕۆن پێیـان دەڵـێن (علامات) یا (علامە)، چـونکی (عَلاَمَتـی) وصـول بـۆ بـلادی هینـد، وە أمـارەی نجاتە. وەك (آلوسی) دەفـەرموێ: (أغْـرَبُ وَ أبْعَـدُ مـا قَرَیْـتُ بـە) وە دیـارە کـە نابێتە علامەتی هدایت، مەگەر بیکاتە عَلامتی تَحَقُّقی. ﴿وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾ علامتی سابقە بـۆ رۆژ، سـتارە بـۆ شـەو، چ لـە بحـر چ لـە بَـرْ. إهتـدای وان بـە (نجم)پێش ورودی آیە بـووە، خۆیـان زانیویانـە هـدایتیان بـۆی بـووە، چـونکی پێویست بوووە، چ حاجت بە تخصیص ناکات.

(فی الحقیقەت) لە إهتدا بە نجوم عەرەب مهارەتێکی زۆریان بووە. ئێستاش قەیومەکانی بَحْری زۆر إعْتنا بە نجوم دەکەن. ﴿أفَمَنْ يَخْلُقُ كَمَنْ لاَ يَخْلُقُ﴾ چ نسبەت؟ چۆن ئێوە ئەو أصنامە دەکەن بە شریك یا مُمَثِّلٌ؟ میللەتی بێ علم و قدرەت و دەسەلات و بێ إخْتِراعْ؟ کەی مُقَلِّدْ دەکاتە مُجْتَهِدْ؟ نالێم إنسان خالقە! أمّا صانعە مُخْتَرِعە! ئەوا دەبینن چ حاجەت بە بَیان! عالەمی إسلامیەت بەچی مغلوب بوو؟ ئەمسال دەڵێن قریبی سێصد هەزار (٣٠٠,٠٠٠) کەس چوونە حج، لەوێ چیان دیت؟ چیان بیست لە کێوی عَرَفات خطیب خُطبەی خوێند چی فەرموو؟ چیان گوێ لێ بوو؟ دەبا میکرۆفۆن مسلْمان إختراعی کردبا! زاتێ وەك (ملکی سعودی) نُطقێ بدا بە ئالەت سێصد هەزار (٣٠٠,٠٠٠) موسلْمان گوێیان لێ بێت بەو شرطە بزانن تێی بگەن چی دەڵێ! ئەویش بە گوێرەی زەمان نطق بدا. هەریاسی بەرد هەلگرتنەوەو گۆشتی حوشترو پێستی قوربانی نەکا. هەرچەند عُلَمایێ هەیە هەمووی خەریکن بە دلیل و آیە و حدیث، سَلْبی قُدرەت و إرادە بکەن لە إنسان لە مسولْمان، وەکردیان! ئەوجا چۆن مغلوب نابین؟ چۆن سەردەکەوین؟ والله ی أقرب ی عباد لە صانعی سماوات و ئەرز، مُخْتَرعەکانن! کوا مسولْمانی مُخْتَرِع و صانِع خَلیفەی صانِعە؟ خَلافەتی ئەرز بە سَبْحە و رشتە نابێ! نازانم چ بنوسم وەقتە دلْم تەق کا بۆ إسلامەتی بۆ قرآن! تەماشای آیاتی کە بۆ مسولْمانان بۆ قەومی خۆم کوردی ماڵ وێران، دواکەوتووی هەموو میللەتان، بێ عِلم و صنعەت دوای شێخان کەوتنی لە زومرەی إنسان کەوتین. بارێ چ نەبێ إنسان تەماشای خۆت و گاجووت و هیاکل و أصنام کە چەند هەزار دەرەجە لە فَوْقی وانی! چیە ئەم زیللەتە؟ چیە ئەو شرکە؟ چیە ئەم جَهالەتە؟ ﴿أفَلاَ تَذَكَّرُونَ﴾ ناخەنەوە یادی خۆتان؟ مُلاحَظە و مُقایَسَەیێ ناکەن؟ بەس بە تَقلید خۆتان گێژو وێژ کەن! اجْتِهاد اجْتِهاد! لە هەموشت إخْتراع إخْتراع! قووەت قووەت! إمتِزاج، إتفاق، تَقَرُّبي الی الصّانِعْ. ﴿وَإنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللّه﴾ پاش تەمامی وجود، بۆیە وجود لە نِعْمَة عدْ ناکرێ! نەك لەبەرێ قیمەتی یا إسْتِکراهی وجود! بەلێ إنسانی وەرِز

كە دەيلّێنیٚ (مُتَشائم) وجودی بَشَر حساب دەكا. أمّا حكيمیٚ وەك (ابن سينا) لای وايە وجود، خێرە! عَدَمْ، شَرّە! ﴿لاَ تُحْصُوهَا﴾ كەوابیٚ شُكْرى تَفسيرى مُمْكِن نيە! شُكْرى إجمالى كافيە! شُكرى إلاە هەرچەند نِعْمَتە، بەلاّم إلهام و توفيق (وهكذا حتّى يَتَسَلْسَلْ) بيكەنە نِعْمَتیٚ لا تُحْصى، خۆی نيە! تەماشای آية كە ﴿إِنَّ اللَّهَ لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ و إلاّ يا لێی قَطع دەكردن، يازوو عذابى دەدان. أمّا إلْهامْتان دەكا إستفادەتان لە نعمَەتی إلاهی كرد، فبها! وإلاّ الهلاكَ ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ﴾ عقائد ونيّات كَيْفياتی نَفْسيّة. ﴿وَمَا تُعْلِنُونَ﴾ لە چاكە لە خراپە (والله لا يُغَيّرُ ما بِقَوْم حتّى يُغَيّروا ما بِأنفسِهِم) ﴿وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ أحيا و أموات ﴿لاَ يَخْلُقُونَ شَيْئًا﴾ عاطل وباطل، حتّى بە صُنع وإخْتِراعيش چيان پیٚ ناكریٚ. ﴿وَهُمْ يُخْلَقُونَ﴾ خۆيان مَخلوقن. مَخلوق وەلَوْ خَلْقی بَعْضە شتيش بكا حەقى معبودى نيە! ﴿أَمْوَاتٌ غَيْرُ أَحْيَاءٍ﴾ ئەوانەی هەيكەليان بەناو دەكەن، مردين حَياتيان نيە. ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ لە حالّی حياتيان. ﴿أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾ كەی حشر دەكرێن؟ خۆيان مَحْشورن مَسئولن وەنازانن كەی دەبیٚ! چۆن دەيان پەرستن؟ لەبەر قُدْرەتيان؟ لەبەر عِلْميان؟ گەلیٚ جار دەلّێم إلاهی ئەو أوْلِيايەكانی كە هيچيان بۆمان دروست نەكرديە، لای أمّة وا مَقاميان بلّندە، ئەگەر شتێكيان پەيدا كردبا، إعتقاديان لە حەقيان چۆن با؟ وەبۆ قيامَةْ ئەوان لە هَلاكَةْ نێزيكترن. كوردەكان خوا بە قوربانی ئەو كەسەيان كا كە هەوێنی ماست و پەنيری بۆ پەيا كردن، وەإلاّ ئەمرۆ لە فوائدی شير مَحروم دەبوون! ﴿إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ خۆتان وخوايی تر، باقی چی؟ ﴿فَالَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ﴾ وەك باب و بهايی ئێرانی، وەك حُكمای سَلَفْ دەلّێن: هەر (حشری روحانی هەيە)! ئەوەی سەيرە تَصديقی رسالەتی حَضْرەتی (محمد)يش (حی) دەكەن! ئەوانە لە إيمان بەخوا درۆ دەكەن سەرزاريە! ﴿قُلُوبُهُمْ مُنكِرَةٌ﴾ بە دلّ إنكاری دەكەن. ﴿وَهُمْ مُسْتَكْبِرُونَ﴾ بەگەورەيی لەسەر خەلّكی تا بلّێن پێغەمبەرين خوا ئێمەی ناردیە، إظهاری إيمان دەكەن! كەسیٚ تَصديقی (داروين) بكا چۆن دەلّیٚ من رسولم؟ بەلّكو

(داروین) رەسولی ئەوە! گەر بلّیٚ رەسولم چۆن تَكْذیبی (موسی) وسائری رُسُل دەكا؟ ﴿لاَ جَرَمَ﴾ حەقە بیٚ شبهەیە. ﴿أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ ئـەوەی بەڕاسـتی أیمـانی بـە خـوا هـەبیٚ رەنگـە سـاغ بـیٚ ﴿إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْتَكْبِرِينَ﴾ كافرە ڕاستەكان گەلەك أهـون تـرن! خـصوص حكمـای طَبيعَةْ، هەزار دەرەجە فَضْلیان لەسەر ئەو درۆزنە مُدَلِّسانە هەیە! ئـەو دوای حَقـائقی علمیەی خۆی دەكـەویٚ بـەلْكو گـەلیٚ فوائـدی هەیـە، تَتَبُّعـاتي وی بـۆ بَـشَرْ، لـە داخلي تَدْليس وتَرْئيس نیە! ملیونیٚ وەك (قادیانی) وأشباهی فدای رَسـولیٚ بـیٚ لە رُسُلی طَبيعَةْ! ئەمانە خێرێكیان هەیە بۆ حَیاتي عمـومي بَـشَرْ! ئـەوان چـِین غَیْري تَفرِقە وتَسلُّط؟ ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ﴾ مُسْتَكْبِرين، قَومي قُرَيْش، وكَذا ئەوڕۆ بـە (بَهائي) و (قادیاني)یان بگوترێ و سؤال كریٚ! ﴿مَاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ﴾ لـە حـەقی دەلّـێن چـی؟ ﴿قَالُوا أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ﴾ حەقیقـەتی تێـدا نیـە! حِكایـاتی پێشینانە! وەری گرتیـە، ئێـستا دەلّێن كۆنـە قـسەیە بـۆ ئێـستا دەسـت نـادا إحتیاجی بە تَجَدُّد هەیە! یا شَرعیٚ جَدید لازمە! گـەلیٚ أحكـامی ئێـستا تطبیـق نـاكریٚ!. دینی إسـلام دینـیٚ فِطریـە بـۆ تعـدیلی طَبیعَـة داندرایـە، بـە أصـول وقواعدە، طُرُقی إستِدالْ وإسـتنباطي مُحَـرَّرو مُهَذَّبـە، قـابلی زێـدەو نقـص نیـە، بەس تَعَصُّبی عُلَمـای مُقَلِّد رەخنـەێكی دی تێـدا نیـە. شـریعتی إسـلامیە دەبـا مەلایانی شرعی كۆبووبان لە هەموو مَذاهِبان قانونێكی مَدَنیان تَدوین كردبـا بـیٚ تَفریقی مَذْهَبْ، ئەوەی أوْفَقْ وأرْفَقە بە نِظامی أنام قبولّیان كردبا. ئەوسا كەس نەیدەتوانی بلّیٚ شریعەتی إسلامی ناقصە. بەلّیٚ مَذْهەبیٚ بـە تـەنیٚ بـۆ عالـەمی شرق وغَرْب وشِمال وجَنوب ناقـصة!! ئـەو فكـرە مـن إظهـارم كـرد بـۆ بعـضیٚ پیـاوی گـەورەی توركـان وەك (عَلـي شَـوْكَة)ی مفتـشی معـارفیوِلایَتـی موصـل و(عبـدالله الكـاظمی) مُتَـصرِّفی لـوای كركـوك و(سـلیمان نظیـف) والی ولایتـی موصل، زۆر إستحسانیان كرد. زۆر نەچوو مـشیخەتی إسـلام بـە همَّـەتی (علـي حَيَدر) (فَتوی ألنَّبي) بە مُساعدەی شـێخ الاسـلام (خـیر الـدین بـگ) أثَـری ئـەو فكرە بەدەر كەوت، ئەگەر بمابان بە تەواوی دەهاتە جیٚ. لازم بوو فِرقەیٚ هـەبا

مـەلای موسـولْمانان بـن عَرْضـی ئەوانـە ﴿لِيَحْمِلُوا أَوْزَارَهُـمْ﴾ گونـاهی خۆیـان هەڵگرن ﴿كَامِلَةً﴾ بە تەواوی. ﴿يَوْمَ الْقِيَامَـةِ﴾ جزای ئـەو ڕۆژەی دەردەکـەوێ ﴿وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُمْ﴾ بَعْضِيْ. ﴿بِغَيْـرِ عِلْـمٍ﴾ کـەپێی مَعذرو بـن. أمّـا گەلێکی وا هەیە تابعی مەیلی خۆیانن بە ئاشکرایی دەزانن وانیە. ﴿أَلاَ سَاءَ مَا يَزِرُونَ﴾ شتێ خراپ اِرْتکاب دەکەن، گوناهی خەڵکیش بە مل خۆدا دەدەن، بۆ چی دیار کرابون، چیان کرد؟ ﴿قَدْ مَكَرَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ بـۆ گـومڕاە کردنـی خـەڵك، حتّـی مَراصـدیان دانـابوو بـۆ إغواکردنیـان ﴿فَـأَتَى اللَّـهُ بُنْيَـانَهُمْ﴾ مَکیدەیـان. ﴿مِـنَ الْقَوَاعِدِ﴾ لـەلای بناغـەو أرکـان وأساسـیەوە. ﴿فَخَـرَّ عَلَـيْهِمُ السَّقْفُ مِـنْ فَـوْقِهِمْ﴾ بەسـەریان دا کـەوت، تـەپی، ڕاسـتە و ڕاسـت کەسـیان لێ قورتار نەبوو، بنیانیان تێك و پێك چوو، ئـاوا تَمْثیلـي غائبیـان دەکـات. ئەگـەر حَقیقەتت دەوێ بـڕۆ تەماشـای روایـەتی نقّـالان بکـە چ بنیـانێکی دروسـتی بـۆ هەڵدەبەسـتن! واقعـاً لـە تَبَلْبُلـی لـسانی کَذّابان إنسان زوبـانی لێ دەگـۆڕێ. ﴿وَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لاَ يَشْعُرُونَ﴾ بەوەهْم وخیاڵیانـدا نـەدەهات، ئـەوە لـە دونیا ﴿ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُخْزِيهِمْ﴾ زەلیلیان دەکا ئابڕوویان دەچێ، لەگـەڵ درۆزن وحـاملی ویزرەکـان، إن شــاء الله! ﴿وَيَقُـولُ﴾ جـەنابی دەفــەرموێ ﴿أَيْــنَ شُــرَكَائِي﴾ بــە زەعمــی ئێــوە. ﴿الَّـذِينَ كُنْـتُمْ﴾ ئێـوە. ﴿تُـشَاقُّونَ فِـيهِمْ﴾ مخاصمەتان دەکرد لەگەڵ رُسُل دائـر بـە شـأنی وان خۆتـان مانـدی دەکـرد بـە شُبهات ومُغالطات خـەڵکی هەڵخەڵـەتێنن گومڕاهیـان کـەن. ﴿قَـالَ الَّـذِينَ أُوتُـوا الْعِلْمَ﴾ مُراد بەوانە کێن؟ یەکێ دەڵێ مَلائکە، یەکێ دەڵێ أنبیـاء، یـەکێ دەڵـێ مەلای مـؤمنی مُوَحّـد، کـەس نـاڵێ مـەلای وان ئـەوانی أساسـاً ڕوأسـای دینیـی مُشرکن (کَهَنە) (واضعی بوت پەرستی) بـە علـم وفکـرو قـسە فَـوْقَ العَـوامْ بـە تَلْبیس و تَدلیس لێیان دەگۆڕن! أمّا من لام وایە ئەوانە مُرادن! أَنَّهُ لـە فـسادو افسادی تبریەی خۆیان دەکەن! ﴿إِنَّ الْخِـزْيَ﴾ شـەرمەزاری ﴿الْيَـوْمَ وَالـسُّوءَ﴾ عذاب. ﴿عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ مُشرك وجاحد. ﴿الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلاَئِكَـةُ﴾ بـۆ جَـزا یـا قَبْضی روح ﴿ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ﴾ خۆیان ظُلمیان لـەخۆ کردبـوو، بـە شِـرك وکُفـرو

ومَیْل مَدنَّسْ بوو بوون، هیچ مُداخلەی ئێمە بەسەرەوە نەبوو ﴿فَأَلْقَوْا السَّلَمَ﴾ سەرامەدان إظهاری خضوع وإنقیادیان كرد. لای من ئەوە كلامی روأسای فەرموودەی باریە! حاصلی ﴿مَا كُنَّا نَعْمَلُ﴾ لە دونیا ﴿مِنْ سُوءٍ﴾أدْنای خۆمان بەدوامان دەكەوتن درۆو دەلەسەیان هەڵدەبەست، ئێمە نە عائد بە نَفسی خۆمان نە دائر بەوان هیچ خراپەمان نەكردیە ﴿بَلَى﴾ رَدَّه لە طَرَف حَضرَەتی كبریائی عَلاَّمُ الغُیوب ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ لە سَیئاتي عومومی وخصوصی ظاهِری وباطِنی خۆتان كردە حائل هەزار كفریاتیان پێ هەڵا دەگوتن، إعلاننتان نەدەكرد ئێمە بەوە راضی نین، بە إتِّحاد وحلول وتَجَلّی وتَقَرُّب وتَقَدُّس بەو لاف وگەزافە خۆتان لە نَظَر ئەو عوامە كردە شریك. ﴿فَادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ﴾ ئەو عُلمایانەی عَرْش وقورش بین، ممَثّلی إلاهی صنوفن! بە گوێرەی مُناسَبە هەر صنفە بە دەرگەیێ لە حەوت دەرگانی جَهَنَّمْ دەچنە ژوور ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ لە جَهَنَّمْ. ﴿فَلَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ﴾ بۆ معنا خۆیان لە خەڵك زیاتر دەزانی وە لە هەمووی بەلاتر تَكَبُّر بە علم وعباداتە! دیارە ئەوانە لە عەوامەكانی تابعیان جێیان ناخۆشترە، عذابیان أعْظَم وأشَدَّه!

بزانن حَلّی ئەو آیاتە مُشْكلە اضطرابیان زۆرە ئێمە وامان نووسی ئەگەر باش بێ فَمِن الله! ئەگەر خراپ بێ فَمِنْ نَفْسی! چ بكەم دڵم بە فرمایشەكانیان ساكن نەبوو ناتوانم فەرمایشەكانیان نقل كەم —مَعَ بَیان الخَلَل— بابۆ كەسێ بێ أطرافی ئەو تفسیرە بە حَواشی مُزَیَّن بكا، یاخوا وابێ!! ﴿وَقِيلَ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا﴾ ظاهِر وباطِن خصوصی وعمومی پەرهێزگارو لە خوا ترساو بوون لە رووی تَهَكُم سؤال دەكەن لە مؤمنان ﴿مَاذَا أَنْزَلَ رَبُّكُمْ﴾ چی ناردیە؟ ﴿قَالُوا خَيْرًا﴾ مُساوی سَعادَتی دارَیْن ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا﴾ قُرَیْشی، حَبَشی، عَرَبی، كوردی، أمّی، غَیْری أمّی بێ، دەبێ مدار لەسەر چاكە كردنە. ﴿فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ﴾ هەر حَسَنە، جَزای حَسَنێ مناسبی ئەو. وەلێرە دەردەكەوێ هەرچی بیكا مقبولە. ذُرِّیَتی إبراهیمە، جێی جَنّات النعیمە، نیە! إیمان وعملی باش موافقی مُقتضی الحال، ئەوە بَلاغَتی عَمَلیە! ﴿وَلَدَارُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ﴾ بۆ وان. دار الاخرە خۆی خێرە

دياره ثوابى چاتره له ثوابى دونيا. دارى آخرةْ بۆ وانه كه متقينه! ﴿وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ﴾ بێ تَكَبُّر. دراُ المُتَّقِين ﴿جَنَّاتُ﴾ باغات ﴿عَدْنٍ﴾ إقامـة. ﴿يَدْخُلُونَهَا﴾ ئەوى بچێته دارُ الإقامة. دياره ناچێته دەرێ ﴿تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ تاكو تَكَرُّر بكا خۆشتره! ﴿لَهُمْ فِيهَا﴾ له جنّاتُ الإقامة ﴿مَا يَشَاءُونَ﴾ مُتَّقى له دونيا ئارەزوى دَنائة ناكا له جنّه العَدن چۆن دەيكا؟ ﴿كَذَلِكَ﴾ ئاوا. ﴿يَجْزِي اللَّهُ الْمُتَّقِينَ﴾ جزاى المتَّقين لـه دارُ المـتَّقين وادەبـێ! ﴿الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلاَئِكَةُ﴾ دياره ئەو تَوَفيّة له دونيا نيه، پاش بَعْثه! ﴿طَيِّبِينَ﴾ له أدناسى قَلبـى وقـالبى ظاهرى وباطنى ﴿يَقُولُونَ﴾ ملائكـة. ﴿سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ﴾ لـه دارى جَنّـة بـێ مَشقّة ومحنَة. ﴿ادْخُلُوا الْجَنَّةَ﴾ أيّها المتّقون! ﴿بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ حقّاً سَعادَتى دونيا ودين بێ عَمَلى صالح چنگ ناكەوێ. تەماشـاى تفـاوت ومساوات كـەن وەبـێ هودە اشاعره ئەو(با)يه بەبا دەدەن. أساسى إيمان أعمالى صالحه، أركانى جزا جنّات ورِضْوانه! ﴿هَلْ يَنظُرُونَ﴾ لەپاش ئەوە كە بيستيان ملائكه به چى دێ، بۆ كێ دێ، وخت نيه بێنه خوار له تَعَنُّت؟ حالاً إنتظار دەكەن چاويان له هيچى دى نيه؟ ﴿إِلاَّ أَنْ تَأْتِيَهُمُ الْمَلاَئِكَةُ﴾ بۆ شهادەت ورسـاله. ﴿أَوْ يَأْتِيَ أَمْرُ رَبِّكَ﴾ وَعدى إلاهى ﴿كَذَلِكَ﴾ ئاوا. ﴿فَعَلَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ لـه اصـرار وتَعَنُّـة. عاقبـة دووچـارى غـضب بـوون. ﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ اللَّهُ﴾ حاشـا. ﴿وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ به تَدَنّسى كُفرو شرك وكَيْفياتى ذَميمة. ﴿فَأَصَابَهُمْ سَيِّئَاتُ﴾ جَـزاى. ﴿مَا عَمِلُوا﴾ زەرەرى بۆ خۆيان بوو. ﴿وَحَاقَ بِهِمْ﴾ دەورى لێدان. ﴿مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ عذابێ كـه بـه گەمـەو قەشمـەرى لـه پێشەوە طَلَبيـان دەكـرد. ﴿وَقَالَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا﴾ عامّه لـه أهلـى مَكّـة وغَيْـرى مَكّـة. ﴿لَوْ شَاءَ اللَّهُ﴾ أَنْ نَعْبُدُهُ وَحْدَهُ ﴿مَا عَبَدْنَا مِنْ دُونِهِ﴾ مُتجاوزينى لەو ﴿مِنْ شَيْءٍ﴾ أحيـاو أمـوات ﴿نَحْنُ وَلاَ آبَاؤُنَا﴾ كه أسلافى ئێمـەن مـادّى و مَعْنـوى ﴿وَلاَ حَرَّمْنَا مِنْ دُونِهِ﴾ لەبەر إلاهى تر. ﴿مِنْ شَيْءٍ﴾ له سـوائب وبحـاير كـه رابـورد. ئـەو آيَتـه مَحَطّـى أنظاره له بەينى سنّى ومُعْتَزِلى! ئەو قولـه لـه مُشْرِكان إسْتهْزايه يـا قَدْحـه لـه رِسالَةْ؟ ممكنة إلزامى بێ مراديان إفحامى رُسُله! ئەگەر مادام هەرچى واقعه بـه

مَشیَّه إرادەی خوایە شرك و شرعَتی ئێمە داخلی مَشیتە مُرادی إلاهیە، فَعَلی هذا إرسالی رُسُل بێ معنایە لا یُتَصَوَّرە خوا بە خلافی مَشیَّیة وإرادەی خۆی چۆن أمر دەکا؟ دیارە ئەم رُسُلانە بە هەوای خۆیان دەڵێن: (رسولین) فروستادەی خوا نین! جواب ﴿كَذَلِكَ فَعَلَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ لە أمَمی رابردوو تَشریك وتَحْریم ﴿فَهَلْ عَلَى الرُّسُلِ إِلاَّ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ﴾ بۆ تَطبیق. جوابی عُلمای ئێمە یعنی أهلی سُنّە وجماعة مُضْطَربنْ (إمامی رازی) ((دەیباتە سەر تعلیلی فعلی خوا بە غَرَضْ، خوا فاعلی ما یَشاء حاکمی ما یریدە، (لا یَسئَلُ عَمّا یَفعَلْ!) وەك (سَعْدی) دەڵێ:

(بِنْ مُسْتَغنی أز طاعَتَش پُشتی کَسْر نە بَر حَرفی أوّ جای أنکشت کَسْی)

سنّە الله جَرَیانی کردیە، رُسُل دەنێرێ تَبْلیغی أحکام دەکەن، هدایَە وضَلال بە دەستی خوایە –یَهْدی مَنْ یَشاء بإحسانە ویُضّل مَنْ یَشاءُ بخَذْلانە–)). ئەمە (فی الحَقیقە) جَواب نیە! شەرِە کوتەکە! خُلاصَة سُنّیەکان دەڵێن: (ئەو قسە حقە ئەگەر سوقی نەکەن بۆ اِبْطالی رِسالَة، یا بەگەمە نەیڵێن، مَواخَذ نین!).

تَحقیقی (أبو السعود) و (صاحِبی کَشف)یش خالّی نیە لە خَلَلْ وتَکَلُّف. بەڵام (مُعْتَزِلی) دەتوانێ زێدە تطبیق بکا ئەوانە دەڵێن: (أفعالی عِباد چاکەو خَراپە بە إرادەی خۆیانە! مَشیَّتی إلاهی إرادەی رَبّانی تَعَلّقی پێوە نیە! بۆ إرْشادیان رَسول دەنێرێ بە دەلیل وبُرهان بَیانی بُطلانی دین وئاینیان بۆ دەکا). طَبیعی سُنّی بەو جَوابە راضی نین! گەلێکیان قسەی نالایەق دەرحەق بە (زومَخشَری) دەکەن. اَلحاصِل مناظَرە ومُجادَلە ومُخاصَمَە کەوتە بەینی (مُتَکَلّمین) ئاگایان لە خصامی بەینی رُسُل ومشرکان نەما.

زۆرم تەماشا کرد بَعْدَ التَّدقیق والمُحاکمە قسەی هیچیانم بەدەماغەوە نەنووسا! لای حَقیر وایە إیرادی ئەو قَوْلە لە طَرَفْ أقْدَسی کِبریائیە بۆ تَسْفیەی ئەو مُشْرِکانەیە، رَبطی لەگەڵ سابقە، نَظمی لەگەڵ لاحقە، أنّهُ دەفەرموێ: پاش ئەو هەموو آیاتە، شَرح وأیضاحی حالّی مُشْرِك ومُوَحّدْ، صالِح وطالِح، مُداخَلەی طَهارَتی نَفْس وخَبائثی لە قبول وإسْتِکراهی إیمان، دیارە ئەوانە

مُقَلّدن پەیڕەوی آباءو أسْلافیان دەکەن، شرکیان لە عنادە، جَحدیان لە تَکَبُّرە، تشریعیان بێ علّة وحکْمَتە، تَعلیلی أحْکامی شَرعیە جێی قسە نیە، شرکیان بَدیهّی البُطْلانە، شَرْعیان مُخالفی عَیانە، وَظیفەی رُسُلْ بیانە، حقّاً براهینیان قاطعە، حُجّتیان ساطعە، خَلَلْ لە بَیانیان دانیە، ئەوان بێ قصورن، مُشْرکەکان جَهول ومَغْرورن (لا اكراه في الدين) بنۆڕنە نفسی خۆتان بە وجْدان بزانن هیچ تضیقتان لەسەرە، مادّیی ومَعنَوی؟ چ إجْبار دَرك دەكەن؟ حاشا! ئەوانەی مانعن بۆ أموری عامّە عامَّةً همّة ناکەن حَوالّەی إرادەی خوای دەکەن، أمّا بۆ خصوصیاتی خۆیان أصلاً ئاگایان لە إرادە نیە، بجَمیع مالدیهم، بۆی سعی دەکەن!

﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ﴾ حتّا (کورد)یش ﴿رَسُولاً﴾ ناردیمانە تَبْلیغی قَومیان کردیە ﴿أَنْ اُعْبُدُوا اللَّهَ﴾ مادام شتێ دەپەرستن، خوا بپەرستن ﴿وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾ ئەوانی (داعی الی الضّلالن، لێیان دوورکەون عبادەتیان مەکەن. ﴿فَمِنْهُمْ مَنْ هَدَى اللَّهُ﴾ ئەوانەی متّأثر بوو بوون. بە عادات و إعتقادیّات أمّا زۆر راسخ نەبوو بوون ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلاَلَةُ﴾ جێی بوو ئەوەی بزر بوو بوو دەرکەوت. ئەوانە ئەوانن کە (یسارعونَ في الكَيْل). ﴿فَسِيرُوا﴾ بڕۆن بگەڕێن ﴿فِي الأَرْضِ﴾ دوورنا، أطْرافی خۆتان. ﴿فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەوانەی تَکذیبی رَسولی خۆیان کردیە، آثاری عَذابیان دیارە. ﴿إِنْ تَحْرِصْ﴾ أیها الرَسول المَبَلّغُ المُبیّن! ﴿عَلَى هُدَاهُمْ﴾ ئی وانە، ئَواتیّ معلوم، بالغاً ما بَلَغَ، شَرح وأیضاحی أحوالّیان بۆ بکەی ﴿فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي مَنْ يُضِلُّ﴾ ئەوانەی خەڵکی گومڕاە دەکەن، أئمّەی إضْلالن. ﴿وَمَا لَهُمْ مِنْ نَاصِرِينَ﴾ کەس لە إلاهیان. ﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ﴾ بەخوا، نوعاً ما أیمانیان پێ هەبووە. ﴿جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ﴾ سوێندی بە قوووەت وصَحیح ﴿لاَ يَبْعَثُ اللَّهُ مَنْ يَمُوتُ﴾ ئەوەش نوعە حماقەتێ ترە، مادام بَعْث نیە بۆ مُشْرکن؟ الاهیان بۆ چیە؟ ئەوانە قسەیان لە إیعادەی مَعدوم نیە. دیسان مُنازَعە دەخەنە بەینی خۆیان وحُکَمایان. کسێ تَصَوّری مَعْنای إیعادە ومَعدومی صرف کا، دەزانێ

مُسْتَحلیە تصوّر ناکرێ! أیعادەی أجْزاء وهەیکەلُ ونفخی رووحی باقی مَقْصَدی ئێمەیە، وەمُمْکنەو سَهلە بۆ خوا! ﴿بَلَى وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا﴾ وَعْدەیێ ثابت ومُقَرَّر بێ إسْتحالة. ئەگەر لای ئێمە دووریش بێ، لای خوا نێزیکە، خوا وَعدی خۆی دەهێنێتە جێ! ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ هەروا بەهەوەس إنکار دەکەن سوێند دەخۆن. بعضە شُبُهاتێ دێنن تەنك ظَرفی پێ دەگۆڕێ بۆ ﴿لِيُبَيِّنَ لَهُمْ﴾ ئەو مُنْکِرانە ﴿الَّذِي يَخْتَلِفُونَ فِيهِ﴾ وَمِنْ ذلكَ البَعث، كأنَّهُ تا نەیبینن بۆیان تَبَیُّن ناکا، بُرهان وحُجَّة إفادە نادا. (سیّدی آلووسی) سَهْواً (فیە) مُقَدَّمی کردیە، تَوْجیهی تَقدیمیش فەرمووە، وەك لە حەق بعضەکان خۆی دەڵێ: (سُبْحانَ مَنْ لا يَغْفَلُ). ﴿وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ مُشرِك ومَنكِر ومُكَذِّب! ﴿أَنَّهُمْ كَانُوا كَاذِبِينَ﴾ ئەگەر هۆشیان هەبێ، ئەمڕۆ بڕوا دەکەن (علاجی واقعە قبل از وُقوع بأید کرد). ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ﴾ هەر شتێکی هەبێ، أصلی إیجاد بێ، إیعادە بێ، پێی بڵێین تَوَجُّهی خطابی تَکوینی بۆ بکەین ﴿إِذَا أَرَدْنَاهُ﴾ لەو وەقتی تَعَلُّقی إرادەی تَکْوینی، إلاّ ﴿أَنْ نَقُولَ لَهُ﴾ بۆ شَیْئ ﴿كُنْ﴾ ئەوەندەیە ﴿فَيَكُونُ﴾ بێ تَخَلُّفْ، بێ إتّصال وأخذُ وَوَضع! مادام وابێ بۆ إنکاری بَعث دەکەن؟ چ مانع هەیە مُعارَضەی مُقتضای بکا؟ ئەو أمرە وەکی إشارەمان کرد، أمرێ تَکوینیە، وَلَوْ أمری لَفظی بێ، مَوقوفە لەسەر إرادەیێ بالفعل! بناءاً عَلَيْه دەبێ حادث بێ!

کَلامی نَفْسی لای (اشاعر)ە قدیمە، چیە کَلامی نَفسی؟ ئەگەر مَعنای لَغَوی ألفاظ بێ، ئەویش دەبێ حادث بێ!. لە تفسیر کەیفم بەو مُخاصَماتە نایێ! ئەوەی درێژەی دەداتێ مَقْصَدی إبرازی عالِمیە! تَحْقیقی کَلامی قَدیمی واحِدی أزَلی، لای مەلا (جَلالی دَوّانی) و (شێخ محمد عبده) و (مەلا وسیمی سنندجی)یە! —داعی رسالەیێ لطیفم هەیە— هەرچەند تَخَلُّف نیە لە بەینی إرادەو مراد، أمّا وامەزانە هەموو شتێ آنی بێتە حصولێ تام! ئەوەی کون وفسادی پێ دەڵێن، دفعیە! وە ئەوەندە بزانن ئەو قَوْل وأمرە نادرێتە کەس، بەخوا نابەخشرێ! ئیتر بە تعمیمی قُدرتی باری خۆتان دووچاری کُفر مەکەن!

وەبێ مُحاكمەیێ تام بە قسەی ئەم ئەو فریفتە مەبن! ﴿وَالَّذِينَ هَاجَرُوا فِي اللّهِ﴾ ضُعَفای بێ دەسەلات، وەك مەردی، لەبەر دەستی ئەو مُنْكِرانە، بۆ خودا لە دارودیار ئاوارە بووین ﴿مِنْ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا﴾ لە طَرَف ئەو جبّارانە متكبّرانە بێ رەحمانە. ﴿لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً﴾ أنّە لەناو حسنە و خۆشی. قرار دەگرن. وە ئەمەش وەك بَعْثي بَعْدَ المَوْتە. مُختاری (سیّدی آلوسی) ئەوەیە ئەو أیَتە بین الهجرَتین–ە، لە مكّە نازل بووە ﴿وَلَأَجْرُ الآخِرَةِ﴾ قیامةْ ﴿أَكْبَرُ﴾ بۆ وان. ﴿لَوْ كَانُوا﴾ ئەو منكرانە، یا خۆیان ﴿يَعْلَمُونَ﴾ یەك لە فائدەی رۆژی جزا ئەوەیە ئەوانە لەو اجرە گەورەدا ببینن ﴿الَّذِينَ صَبَرُوا﴾ لەسەر إیمان مَشاقی هِجْرَەت آلمی دوری وَطَن. ﴿وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ غَیْری وی، كەسیان نەبوو نجاتیان بدا. طبیعی ئەگەر قووەتیان هەبا، ظُلمیان لێ نەدەكرا حقاً وەك لە بەیتێ (دمدمی) دەڵێ: (كەسی بێكەس وهەژاران هەر خوایە) –خوایە هاوار نجاة– ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالاً﴾ قسە لە ژنان نیە، قسە لە ملكە! ﴿نُوحِي إِلَيْهِمْ﴾ وَحیان بۆلا دەنێرین. ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ﴾ ئەوانی ئاگادری تأریخن. ﴿إِنْ كُنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ علمتان نیە. ﴿بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ﴾ بە أدلّة وكُتُب. ئەگەر خۆتان نازانن لە أهلی خۆی بپرسن، خود سەرانە بێ عِلم إنْكار مەكەن! تعلیقی بە (أرْسَلنا)ی دوورە! گەرچی (حقیقةً) وایە! لە أعمالی تَكْلیفە بەڵكو لەگەڵ إعتِقادیّات، تَقلید، ضَروریە! هەموو عالەم نابێتە عالِم وفقیە. الانصاف ئەوەی قیاس خۆی دەیگەێنێ، لە ذِكرە! پاش ئەوە كە بە دَلالَتی لَفظی ج دەلیلی چنگ نەكەوت، مجبوراً مُراجعەی قیاس دەكا! بۆیە نەبووە ئەگەر حادثە رادەوەستێ نازانێ حُكمی چیە لەكێ سؤال كا، هەمووی پشكنیە! لەو مَقامە خەریكی رَدّی إقتراحی مُنْكِرانین، ئاگامان لە إجْتِهاد وتَقلید نیە. ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ﴾ قرآن –(وَأَنْتَ الرَجُلُ كُلَ الرَّجُل)– ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ﴾ عام. ﴿مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ إعتقادیّات عَمَلیّات، آدابی حَسَنە، تزكیەی نفس، ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ ئەگەر تفكّر نەكەن، ئەمە كِبْرْ گوێی گرتینە، نابێ، تا تفكّری لێ بكەن! ﴿أَفَأَمِنَ الَّذِينَ مَكَرُوا السَّيِّئَاتِ﴾ آیةْ دەرحەق جەنابی رِسالە پەناهە،

أصحابى ئەتويان قەدەغە كرديە؟ بۆ كردين؟ أمّا لەسەر فكرى (مُجاهد)ى رووى وى بۆ (نمرود) ناترسن ﴿أَنْ يَخْسِفَ اللهُ بِهِمُ الأَرْضَ﴾ خوا بە ئەرزيان دا بباتە خوارێ. ﴿أَوْ يَأْتِيَهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لاَ يَشْعُرُونَ﴾ بێ ئاگا بێ خَبَر لەحالّى سكون ونَوم ﴿أَوْ يَأْخُذَهُمْ﴾ بيان گرێ عذاب. ﴿فِي تَقَلُّبِهِمْ﴾ ئەملاو ئەولا كردنيان بە جَرَيانِ لە سفَريان. ﴿فَمَا هُمْ بِمُعْجِزِينَ﴾ دەرناچن قوتار نابن ﴿أَوْ يَأْخُذَهُمْ عَلَى تَخَوُّفٍ﴾ بە علائم نيشانى دا تا بگەرێنەوە وەك قَومى (يونس). ﴿فَإِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ رَؤفت ورَحمَتى بارى وادەخوازێ (تَخَوّف) بە (تَنَقُّص) تفسير بكرێتەو. كەم كردنەوەى وردە وردە بۆ أهلى نَظر، موجِبي خَوفه لە إنقراض وخوازى ژێر دەستى خەلّكى! ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا﴾ ئەو مُتَكَبّر ومُعاندُ ومَكّارانە بە بَصَرى ذى بَصيرَت تَوَجُّهيان نەكرديە بە فكر ﴿إِلَى مَا خَلَقَ اللهُ﴾ اى مادّى. ﴿مِنْ شَيْءٍ﴾ شتێ كە ﴿يَتَفَيَّؤُا ظِلاَلُهُ﴾ سێبەريان إنْتقال دەكا ﴿عَنْ الْيَمِينِ وَالشَّمَائِلِ﴾ لە أطرافى سێبەر دارەكە. زاتاً ظِلّيّ و ئاوى خَطّى إستواء، شَرقى و غَربى هەمووى شماليە! ئەو أشياى ذَوات الأظلال خاصةً أشجار آبار أنهار دارْ ﴿سُجَّدًا لِلَّهِ﴾ مُنْقادى أحْكامى فِطْرى شَرْعى تَكْوينن! مُخالفە ناكەن! هەمووى سەر شۆرِن بەبەر، لەبەر گرانى بارداهاتينە ئەو قَوْمە بۆ نَظَر ناكەن؟ ﴿وَهُمْ دَاخِرُونَ﴾ مُحَقَّرن سووكن چووكن. أسبابى تَكَبُّريان چيە؟ دارێ بەبەر هەزار فضلى بەسەر واندا هەيە كە سەجدە بۆ جمادێ بێ حياة دەبەن! نەسايە نەمايە!. مُفَسِّرين لێرە بە (يمين) (شمال) دادەنۆرِن عاقبەتى عَجائب پێك دەگۆرِن – قسەيانم لا خۆش نەبوو–. ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ ئێوە چما لە (مافي السّموات والأرض) بەدەرِن؟ ﴿مِنْ دَابَّةٍ﴾ بە دينى تكوينى وشَرعى طَبيعى (ما كُلِّفَ به) بەجێ دێنن. ﴿وَالْمَلاَئِكَةُ﴾ ئەوانيش بە هەردوو دين منقادن، فطرەتيان پاكە. ﴿وَهُمْ﴾ مَلائكة، خۆتان دەزانن چەند گەورەن. ﴿لاَ يَسْتَكْبِرُونَ﴾ ئێوە تَكَبّر دەكەن بۆ خوا سَجدە نابەن، نَظَري ناكەنە أحوالى كائنات، آياتي بَيِّنات. ﴿يَخَافُونَ رَبَّهُمْ﴾ لە خواى خۆيان دەترسن. (العياذ بالله) إمتحانەكى كردن وەك (إبليس) إبايان كرد، مطرود

دەبن، ئەو خَوْفَه مُنافی عِصْمَةْ نیه، حَضَرةْ دەفەرموێ: (أنا أعرفُکم بالله وأخشاکُمْ مِنْه) ئەگەر بزانن عِصیانی مَلَكْ چۆن دەبی وەچۆن بووە، دەزانن سەرپێچی لەوان، محالە. خوای ﴿مِنْ فَوْقِهِمْ﴾ لە هەمو جِهَةْ. فَوْقیَتي جِهَتي، مُجَرَّد حِسّي نیە. بەو هەمو قووەت وقُدْرَة وعِلْمە، لە خوا دەترسن، ئێوە بەو صِغارو (هَوان)ی خۆتان، لە خوا ناترسن. ﴿وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ ئێوە خلافی أمری خوا ڕەفتار دەکەن، بەجێی ناگەیێنن. ئێوە نەك لە مَلَكْ لە أکثَري أُمَمي مُتجاوِرَي صاحِبي ظِلال، کەمترن، لایان مُحَقَّرن، ئەگەر إیمان نەهێنن، بە چاکی تَوَحُّد نەکەن، وای بەحالْتان، وەك سایە بۆ خەڵکی دەکەونە سەر خاك، گەردەن دادەی إطاعە دەبن!! ﴿وَقَالَ اللَّهُ﴾ جَلَّ جَلالُهُ ﴿لاَ تَتَّخِذُوا إِلَهَيْنِ اثْنَيْنِ﴾ دوو خوا، یەکێ مَبْدَئي خَیر، یەکێ مَبْدَئي شَرْ، فَضل لە سێ و چوار و هەزار ﴿إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ بِالذَّات بِالحَقیقَة. قاعدەی خَلق وإیجاد وخێرو شەڕ، یەکە، فاعِل یەك فاعِلە، إختِلاف صُوَري وإعتِباریە، حَقیقَةْ یەکە. کەسێ تَأَمُّل کا مَبادی شەڕوشۆر دەبینێتەوە، حاجَةْ بە إلاهێکی دی نیە. مادام خالِق یەکە ﴿فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ﴾ وەك إبلیس پەرستەکان مەڵێن، خوای شەڕي بپەرستن تالە شەڕي مَحفوظ بن، خوای خێر خێر کارە، بیپەرستی نەیپەرستی فَرقی نیە. ذَوْقي مَعْنای آیةْ دیارە– با (زَمَخشَري) و (سَکّاکي) علامەی أوَّل عَلاّمەی ثاني لەسەر تَأکید و عَطفە بَیان مُنازَعە بکەن–، تەماشای (روحُ المَعاني) بکە! ﴿وَلَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ لە جَواهِر وأعْراض لَطیف وکَثیف، مَعلوم وغَیْرە مَعلوم. قسە لە عَمَلي عِباد نیە، وە دەڵێ تبلیغیان بکەن بە خێر إیمان بێنن، ئەوجا دەیان کەین بە (أشاعِرَ) سَلبی قُواو قُدْرەتیان لێدەکەین. ﴿وَلَهُ الدِّينُ﴾ مِلك وسلطان وحُکم وقَهْر وغَلَبة وتَدْبیر. ﴿وَاصِبًا﴾ دائِماً، بێ نَقل وتَبَدُّل وتَغَیّر وتَحَوّل. تَفسیري (دین) بە ئایین (واصبا) بە خالِصْ، جوانە! فی الحَقیقە دینی خالِصْ، هەر بەخوا دادەنرێ، بێ غَلّ وغَشّ ومُحابا، بە بَشَرێ مُتَأثّر بە قَوْمیَّةُ ودین، داناندرێ! حَتّا ئەمڕۆ هەر قانونێ داندرێ لە طَرَف ئەو دووەلی کە مُتَّحِدَەنە، بێ خَلط وکدورَت نیە! ﴿أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَتَّقُونَ﴾ کەس هەیە؟ ئەوەی

خَیالی دەکەن وەکی ئێوە مَخلوقی خوایە مُحتاجە. وەجَمادات وآلهەی مَوهومە چ قانونێ واتان بۆ دادەنێن عَمَلي پێ بکەن؟ لە شتی خراپ پێی حِفظ بن خۆ بپارێزن؟ ﴿وَمَا بِكُمْ مِنْ نِعْمَةٍ﴾ إیمان نِعمَەتە، أمّا چی بکەین ئەوا نایانەوێ! کُفر نَقمَەتە، نازانم بۆ خوا کُفریات تێدا خلق دەکا إیمان خَلق ناکا؟ واقعاً جێی ئەو قسانە نیە! لکن مُتَکلّمین ناڕەحەتن!!!. هەر نیعمەتێ هەبێ ﴿فَمِنَ اللَّهِ﴾ لە طَرَف خوایە، موجِدي ئەوە! ئەدی بۆ ناپیەرستن؟ صُوَر وتَماثیل عبادەت دەکەن، بە چ أمَلي؟ ﴿ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ﴾ حتّا کەمێ. ﴿فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ﴾ مَعَ أنَّهُ خۆتان بە أربابی هِمَمُ وصَبر وثَبات دەزانن، لەو وەقتەدا بۆ هاوار دەکەنە خوا؟ وەك دەروێش و صۆفیەکانی أُمّة خواو رَسولی خۆیان، لە فکر نیە. ئەگەر خواش بە هانایان بێ، دەڵێن بە أمر وهِمّەتی شێخە. ﴿ثُمَّ إِذَا كَشَفَ الضُّرَّ عَنْكُمْ﴾ لایدا. ﴿إِذَا فَرِيقٌ﴾ بێ إمهال آناً ﴿مِنْكُمْ﴾ جَمعي لە ئێوە، ئەوانەی غَریقي فی الکُفرن ﴿بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ﴾ نِسبەتی نَجاة بۆ غَیْری خودا دەدەن. کەسێ کە ئاگای لە خۆی نیە باناگای لێ بێ ﴿لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ﴾ کُفراني نعمَةَ، ناشُکري. زاتاً کُفران، مُقَدّمەی کُفرە ﴿فَتَمَتَّعُوا﴾ تَهدیدە. ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ وَعیدێکی شَدیدە. ئەوەیە وجدانیان مُقابِلي مُنعِم ﴿وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ﴾ جاعِل ومَجْعولَ لَهُ، مُشرِکەکان إلاهەکان، حالي یەك نازانن جاهِل وبێ خَبَرن. ﴿نَصِيبًا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ﴾ مِنَ الحُبوب وَالأنْعام. هەم کُفر هەم کُفراني نعْمەتە شَرعیان ﴿تَاللَّهِ لَتُسْأَلُنَّ﴾ سؤالي زَجْر وتَوبیخ ولَوْم وتَعْذیب. ﴿عَمَّا كُنْتُمْ﴾ لە داری دونیا. ﴿تَفْتَرُونَ﴾ افترایێ ظاهِر، لە مندالآن بزر نابێ، مالکیَّة لەوانە تَصَوُّر ناکرێ ﴿وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ الْبَنَاتِ﴾ بە مَلائکةْ دەڵێن: کچی خوان، بە إلاهی جَمالیان تَمْثیل کردینە. إمام لێرە ظَنّيٌ دەبا، لکن ظَنّیێ واهي، لە تَخَیُّلاتی وان چرووك ترە، بِنا لە تَعْریفیان (بَناتٌ) و (أبناؤ الله) نین! أمّا شتێکن شَبیهی خوان!. وەبعضێ لە ئێمە دەیانکەن بە (رَبُّ النَّوْع). ﴿سُبْحَانَهُ﴾ مُنَزَّه ومُقَدَّسە. ﴿وَلَهُمْ مَا يَشْتَهُونَ﴾ أولادي ذکور، بەکو راضي نین. إسرائیلي دەیانکەن بە (أبناء الله) لَعَلَّهُ بالمُعاکَسَة، (خُزاعە) و (کَنانە)

دەیانکەنە (بَناتُ الله). ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى﴾ موژدەیان دەنیّ بە کچ بوون، وەقتیّ کە ژنیان لەسەر زان بیّ، زۆریان لا ناخۆشە ﴿ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا﴾ ڕووی ڕەش هەڵدەگەڕیّ، دەك ڕوویان ڕەش بیّ وەك قەلی!! ﴿وَهُوَ كَظِيمٌ﴾ پڕە لە قینی هەڵپەنمای ﴿يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ﴾ خۆی دەشێرێتەوە ﴿مِنْ سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ﴾ ناشکْری نەبیّ یەکیّ وەك (شێخ حِسامُ الدین)ی ئێمەیان نەبووە لەناو زگی داکیانا، هێنیەکی پێوە بچەسپێنیّ دەست خۆش یا شێخ–! جامُتَحَیِّرە نازانیّ چی لیّ بکا ﴿أَيُمْسِكُهُ﴾ لێی گەڕیّ بەخێوی کا. ﴿عَلَى هُونٍ﴾ تَحَمُّلي ئەو رَزالَتە بکا، یاکچکە بە رَزیلی زَلیلی بیّ حورمەتی بەبیّ مَیْلي. ﴿أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ﴾ زیندە بە گۆڕی بکات، بزری کا، بیهاوێتە ناو خۆڵ. ﴿أَلاَ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ ئەو جَعْل وحُکْمە، ئەگەر شَرعیّ باش نەبیّ، ئەو نَوْعە حُکمە چۆن دەبیّ سِیرایَة بکا؟ بَشَر مەحوو دەبێتەوە، میّ نەما! نێر لە کیّ دەبیّ؟ نێری ومێیی لە عالەمی حَیاة، نبات تا إنسان هەیە! ئافرەتی کوردی دەلیّ: (داکیّ! گرانی ژن نیە!). بۆ کچی خەڵکی ببێتە ژنی وی؟ ئەو کچی نەبیّ، نەك ببێتە ژني کەسیّ!!! ئەمە تَکَبُّرە، ظُلْمە، إستحقاري غَیرە، خُطْوَەی شَیطانیە! ﴿لِلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ﴾ ڕۆژیّ جَزا، یَومِ دین، ڕۆژی (کما تَدینُ تُدان) وە (کَما تَکیلُ تُکال)، ڕۆژی مَنْ دۆق من دۆقی –لام وایە لە (مَنْ دَقَّ دُقَّ)یان وەرگرتیە–. ﴿مَثَلُ السَّوْءِ﴾ چی خراپ بیّ، خۆی لیّ ناپارێزن. ئەمڕۆ سَیِّئاتی کائنات، شاهدیّ عَدْلە لەسەر صِدْقی ئەو آیَتە. حاجَةْ بە جێنوشین، بۆ مُؤمن وکافرانە، عائِدي وَسمي حَیاتە!. برۆ تیاترۆخانەو فَحْشیات مَسارِحي سَهْلي سَواحِلي بِحار بۆ إصْطیاف، مَدارِسي تَعلیمي رَقص ودانس، حَتّا بَعْضە محافیلي ملوك و إمپراطوران، ئەوجا ئەو آیتە بخوێنەوە!!!.

کە إیمان بە قیامەت نەما، هەمو شَرِّي بَشَري دەڕوا، حَیاة بِالمَرَّة مُکَدَّر دەبیّ، أمْن وآمان نامێنیّ. ﴿وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الأَعْلَى﴾ ذات وصِفەتی کبریائی لە غایەتی بلندیە بیّ نَقصَە، لەبەر ئەوە رَسولي بیّ عَیب، بە دینیّ کامِلْ، شَرعیّ مُبارَك، أخلاقی حَسَنە، تَزکیة و تَصفیة، دەنێریّ. ئەوی إیمانی پیّ بێنیّ بە حَقّ

تَبَعیەتی بکا، دەبێتە ڕوحێ مُجَسَّمي مُمَثِّلي شَرَف ومَکارم. جا ئێوە و خوداي کە (له المثل الأعلی)یە تەماشای آیَة کەن بنۆرنە مَقام، وَهم وخَیال بۆ ئەوە دەچێ کە خوا تَمَثُّل بکا بۆ (أولیاء الله) خۆی بنوێنێ نیشان دا؟ ئەگەر مَثَلي هەبا، مِثْلیشي دەبوو، تَقْدیس لە وَلَدْ چۆن دەکرا؟ بەلێ خَیالیّونەکان قووەی مُخَیِّلَیان لەبەر چاو قوچاندن وتَصَوّرات وتَصْویرات کردن، بۆ تَمْثیل، زۆر بە قووەتە، خۆیان تَمْثیلي دەکەن، وادەزانن بۆیان تَمَثُّلْ دەکا. دەخیلەکەم دوای ئەو خَیالِیّونانە مەکەون! وَلَوْ زواتی وەك (شێخی عَرَبی) و (شێخی سرهَندي) بێ–!!. بۆیە أوْلیاءُ اللّٰهی صَدیق، کافردەبن، دەبنە زندیق!.

جەنابی حَق، قیاس لە شَیْطان وإبلیس ناکرێ! ئەگەر چی لە عِبادەتیان تَلْبیس دەکەن دەڵێن: جَوْهَري مُجَرَّدن وتَمَثُّل دەکەن. –ئەمەش خلطە لە بینی کَلامی حُکَماو کَلامي مُتَکَلِّمین–. لای ئێمە غَیْري حَضْرَتي کبریائي، کائنات هەرچی بێ، مُصَوَّرە!

﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ (مُتَفَرِّد)ە بە (کمال)ی (مطلق) و (وَحدەت)ی (حقیقيّ) و (تقدس)ی (ذاتی). (واضع)ی (قواعد) و (نوامس)ی (حکمتین)، (طبیعی) و (تشریعی) ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ﴾ بیانگرێ، (عذاب)یان بدا ﴿بِظُلْمِهِمْ﴾ ئەوانە بۆ (ظلم)ی خۆیان (تجاوز) لە (حق)ی (إلهی) (واحد) ئەکەن، بە (تشریك) و (تولید) ﴿مَا تَرَكَ عَلَيْهَا﴾ لەسەر عەردی ﴿مِنْ دَابَّةٍ﴾ (ذي روح)ەی نەدەهێشت زێرا ئەو قسە ئەو (ظلم)ە ئەوەندە (عظیم)ە، نێزیکە ئەرز لەبەری شەق شەق بێ، (حیوانات) لەسەری نەژیە، چیای ڕۆچێتە خواری (أنْ دَعَوا للرحمن وَلَدا) ئاسمان لێك ببێتەوە، چیا بەسەر ئەرزا برووخێ، ئەو (ظُلم)ە (مُستلزِم)ی دەماری ئەرزە، چ جایە (عصمت)ی (أنبیا)یە؟ (أکثر)ی (مفسِّر)ین لێرە (ظلم)یان کردیە، (خاصّة) (جُبّائی)، وە (مُمکن)ە (إشار)ە بێ بۆ (ظلم)ی (تشریع) یان وەبێ (معنا)یی، (قوم)ێ بە گوناهی (شخص)ی (محو) ئەکەن وەك (إنگلیزان) لەبەر جەماتی (تورك) شاریکیان بومبەردومان ئەکرد، (صغار) و (کبار) (إنسان) و (حمار)، لە (بعض)ێ (تواریخ) ئەڵێ: گۆیا

(قوم)ی بەسەریان دا (غالب) بووە، ژن ومندالّیان بە (أسیر)ی بردینە، (طَبیعی) (معاملە)ی نابەجا دەرحەق (بعض)یکیان کرایە، لە وەقتی کڕینەوەی (أسُرا) ئەوانەی خراپ کرای لەگەلّ باب خویشیان نەهاتینەوە، ئەو (حقارت)یان لەڕووی ئەو کچانە بەسەر هاتیە، بۆیە کچان زیندە بە گۆڕ ئەکەن" ئەمە (حکم)ی (ظالم)آنە، ئەگەر بە (ظلم)ی وان خوای (تعالی) چ جایە (أقارب)یان، چ جایە (إنسان)، (حیوانات) (عذاب)دا، قسەیان چیە؟!

(علی کل حال) (جناب)ی (حق) (مسارعە) ناکا بۆ (هلاك)یان ﴿وَلَكِنْ يُؤَخِّرُهُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ لای خوا (مُعیَّن) وەبە (علائم) (ظاهر) ﴿فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ﴾ لە (أجل)یان ﴿سَاعَةً﴾ (مُدّە) یەکەم ﴿وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ﴾ (قابل)ی (تغیّر) نیە، چاك و خراپ گەورەو گچکە، بەلّکو حەیواناتیش بەر لافاوی (غضب) ئەکەوی! وە(ضعیف) لە (قوی) زووتر (هلاك) ئەبیّ ﴿وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ﴾ نە ئێنکی (ولد) هەر خراپەیە تووشی بن ئەلّێن: "لە خوایەوەیە" ﴿وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ الْكَذِبَ﴾ زوبانیان (وصف)ی درۆی ئەکا، درۆ ئارایش ئەدا، ڕێکی ئەخا. (شخص)یّ خوا عافوی کا ئەی فەرموو: "من درۆ ئەکەم وای ڕێك ئەخەم بە (دلیل)ی جوان، خۆم لێم ئەگۆڕیّ، وادەزانم ڕاستە!" درۆی ئەکەن ﴿أَنَّ لَهُمُ الْحُسْنَى﴾ ئەوی خێرو چاکە بیّ لە خۆیانە (سبحان الله) ئەوەی (إیمان)ی هەبیّ بەخوا، چ (مُشرِك) چ (مُؤمن) ئەو (حکم)ە ئەکەن. هەزار (مؤمن)م دیتوە کاری ناشیرن ئەکا، (وِجدان)ی نایەنیّ، بلّیّ: "من کردوومە" (تَنَزُّل) ناکا! ئەلّیّ: "خوا کردی، خوا پیّی کردم" ئەگەر ئیشی چاکەو هونەرمەندانە بکەن، دەلّێن: "کاری خۆمانە، ئەدی ئەمن وام" ئەگەر (طریق) داربیّ ئەیداتە (حضرەت)ی (شێخ)! ﴿لاَ جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ النَّارَ﴾ ئەو (حُکم) و (تفریق)ە وای ئەویّ پاداشی چیتر نیە ﴿وَأَنَّهُمْ مُفْرَطُونَ﴾ لە هەردوو (طرف) (قاصِر)ن (مُتجاوِز)ن، بۆ (تعدیل) و (بیان)ی (حق) (إحتیاج)یان بە (رسول) هەیە، (أمم)ی تر (صاحب)ی (کُتب) لەوانە (محتاج) ترن، وەکو (إشارە)ی بۆ ئەفەرمویّ بە سوێند ﴿تَاللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَى أُمَمٍ﴾ زۆر

بێ (حَدّ) و (عَدْ) ﴿مِنْ قَبْلِكَ﴾ پێشی تووتا ناردنی توو ﴿فَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ﴾ (رؤساء الدين) دوای کەوتن، (حق)یان گۆڕی، (عوام)یان گومڕاه کردن ﴿فَهُوَ﴾ (شیطان) ﴿وَلِيُّهُمُ﴾ ئەیان کێشێ بۆ هەر لایە حەزکا ﴿الْيَوْمَ﴾ دوورن لە (مُتابَعة)ی (رُسل) ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەگەر (وجدان)یان هەبێ، زۆر (متأثر) ئەبن، یا لە (آخرەت) ﴿وَمَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ﴾ قورئانی کریم ﴿إِلاَّ لِتُبَيِّنَ لَهُمُ﴾ (أُمّيّون) وە (مِلّيون) ﴿الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ﴾ (حق)یان بۆ آشکرا کەی، ئەگەر (نسخ)یش نەبا، ئەو (إختلاف)ە (کافی) بوو، بۆ (إرسال)ی توو، ئەی (خاتم الرسل) ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (بالفعل) یاله (شأن)ی دابێ. (حقاً) إستفادە لە قورآن ئەکەن، ئەگەر (أشاعرە) و (معتزلە) لێ گەڕێن، ڕێ بە (مقصد) ئەبەن، (عقائد)ی (خالص)ە (أعمال)ی (صالح)ەی لێ وەرئەگرن، بە (تفکر) لە (آیات)ی (بِالخاصة) لە (مُتشابهات)ی (تَرقی) ئەکەن، (إطلاع)یان بەسەر (أمور)ی (دقیق)ە، (فارقە) (غَیر)ە (فارق)ە ئەبێ، لەهەموو (علم)ی بە (تتبّعات) (زیاد) ئەکەن، لە ڕووی (إتحاد) ئەزانن (إختلاف) خراپە، تا (ممکن) بێ (إختلاف) ناکەن، ئەگەر کردیان بۆ (حق) ئەی کەن، لەگەڵ یەك نابن بە دوژمن ﴿وَاللَّهُ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾ خاوێن و (صاف)ە ڕووی أرض لە (خِسّ) و خاشاك پاك ئەکاتەوە ﴿فَأَحْيَا بِهِ الأَرْضَ﴾ ئەوەی (قابلیەت)ی هەبێ گیای لێ شین ئەبێ، قورئانیش وایە، (صاف)ە بی (کدوریەت)ی (وَثنیەت) و (إسرائیلیەت)ە، لە (طرف) خوا بۆ توو هاتیە، (دفع)ی (منازعات) ئەکا بە (بَیان)ی (حق)، (حیات) ئەداتە (أُمم) ﴿بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ ئەوی إستعدادی مابێ دانەیی (إیمان)ی لە (قلب)دا ئەڕۆی، ڕەگ دائەکوتی، (نما) ئەکا (صاحب)ی ئەبێتە دارێ بەسێبەر وبەر ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً﴾ (أيّةُ آيةٍ) ﴿لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾ بە (سمع)ێ (إعتبار) ئەوجا لە (حِس) بۆ (تفکر) و (تشبیە) بچن، (مقاصد)ی (ثانیە) (دَرك) کەن، لەسەر (معنای) (لُغوی) (صورەت)ی (ظاهری) ڕانەوەستن، (ثایەت)ی (غَریب)، (رابطە)یە (عجیب)، کەوابێ بە (حق) بزانن ئەرزی مردی کوو (إحتیاج)ی بە باران هەیە؟ ئێوەش (أمّيّ) و (كِتابي)

(إحتياج)يتان به (وحي)يه (جديد) هەيە، و (حقَ الآنصاف) (أمم)ەكان (مُحتاج) ترن، زێڕا (موت)ی وان (بعد الحياة) بووه (حيات)ی قورئانی بۆ وان وەك (بَعث)ی (بعد المَوْت)ە ﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعَامِ لَعِبْرَةً﴾ جێی إعتِباره، عبُور كردنه له تَدَنّي بۆ تەرەقّی، بۆ مَئاثِرْ بۆ نَفع دان، بۆ خۆ خاوێن كردنەوه. ﴿نُسْقِيكُمْ﴾ تەماشای شیر كەن! ئەگەر بەمندالّی كه شیرەخۆر بوون ئاگاتان لەخۆ نەبووه، خۆ ئێستا له شیری كراینەوه، شُكُر گەوره بووین، دقّتێكی له شیر بكەن ﴿مِمَّا فِي بُطُونِهِ﴾ لەوەی كه لەناو زگیاندایه، مَبْدَئی ئەو مَشْروبەیه ﴿مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ﴾ بَيْنِيَيتيكي مِزاجي، نه حِسّي، له فَوْقی خوردەن وهَظم كراوەكەیه، وەك خوێن زۆر له مَوادی غذائية تَجريد نەكرایه. نَقلی دەكەن له (إبنُ عبّاس)، أما خۆی نیه! مُمكنه نقلەكه صَحيح بێ، أوائِل مَعْلوم نیه زۆر ئاگایان له تَحَوّلاتی أطعِمه بووبێ چۆن هَظم دەبێ، خُلاصەی نَقل دەكاته جگەر، وەلەوێ دەبێ به خوون دەچێته قَلب به تێكەلاّوی، خوون بەبەدەن دا دَوَران دەكا، دەچێته گووان، دەبێته شیر. ﴿خَالِصًا﴾ صافْ بی مُسْتَحْضَراتْ. ﴿سَائِغًا لِلشَّارِبِينَ﴾ ئەمڕۆ تەماشای شیر ومُرتَّباتی كه چ وَقْعَیكی هەیە! لام وایه ئەوەی بەو آیته إستِدلال بكا لەسەر پاكی و إباحەی شُرْبی میزی مَأكولُ اللَّحْمِي، میزاجي نەزانیوه، له میانی (فَرْث) و (دَمْ)دا، ماوەتەوه به شیری، بَشَر چ تَرَقیەیەكی دا به شیر! ماست، پەنیر، لۆر، شیریژ، ژاژی، كەره یاغی، دەڵەمه، سەرتوو، قەیماغی لێ دروست كرد! حالاش عَرَبي قوڕ بەسەری بادیه نوشین به تَقديری (إمامی مالِك) میزی حوشتری دەخواتەوه، خۆی پێ دەشوا، إسْتِحمامی پێ دەكا. تا ئێستا وامان دەزانی ئەو حَيْوانی بزێ، فەرخه بەشیر بەخێوه دەكا. ئێستا حَيْوانێكیان كَشف كردیه هیلكه دەكاو فرخی بەشیر إدارەدەدا (ويَخلُقُ مالا تَعْلَمون)! فائدەی عامّی ومَداری حَياة بۆ أَلْبان شُربه وشیر له ناو گووان حاضره، بیدۆشەو بیخۆوه! أمّا شُرْبي نَخيل وأعناب وانیه! بۆیه تَعْليقي ﴿وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالأَعْنَابِ﴾ به (نُسْقيكُم) اَلْمُقَدَّرم لا جوان نیه! وەدەڵێن بَيان وكَشْفی كُنْهی إسقایه ﴿تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا﴾ كشفێ بێ كَشْفه!

إتخاذ له کێ، إسْقا له کێ؟ لام وایه عَطفه لەسەر (فِي الأنْعام) له (عِبْرَةً) مَحْذوفه! فَرق به (ف)یّ و (مِنْ) دیاره! سُؤال کَیْفَ العِبْرَة؟ (تَتَّخذونَ سَكَراً)! با شَراب بێ! به نَبیذ بێ! ئەگەر تَعَلُّق به (نُسْقیكَمْ) نەبەستێ، صَیّانه، مَقْصَد عِبْرَته، آیته! جێی حِلّ وحورمەت نیه! ئەوی حَرامه، وەکی حَلال، آیته! به إعتباری شَرْعی، له حَقیقەتی خۆی ناگۆڕێ! صه گلاّوه، بەراز حَرامه، بزن حَلاله، له آیَةْ یەکن! بَدایعی براز له بزن زیاتره، دوو سمه، دەم باریکه، ئاو به گوم دەخواتەوه، وەك صەی مەمکی دوو ڕێزەیه، به شولفەیه، ملی کورته وەکی فیلی، سەری وەکی گاجووتانه، کلکی قورەیه وەك مامز وکێوی، شولفه لێدانی، مان گرتنی عَجايبه. زەهر ايَته قَتّاله! ئەمڕۆ له خەستەخانان أكثَري تَداوي به مَوادي سمومیّەیه! دِقّةْ له مُخَدّرات که بۆ جَراحي چەند بەخێره! وەحاجَتْ به شێخ نیه!!. مەلایانی فقه، وەك مەلایانی کَلام لەسەر فکری خۆیان تَفسیر دەکەن، هەر کەس بۆ رِعایَتي مَذْهَبي خۆی آیَة بەلای خۆیدا دەکێشێ، حَقیقَةْ ئەوەش جای عِبْرَته! قسه له (مُسْکر)ە، بەلێ هەموو آیَتي خوا، مُحَیّرُ العقولن، ئانزیاده (خَمر) بەجارێ عقل تێکدەدا! (فَفي کُلِّ شَيْءٍ له أيةٌ تَدلُ على أنّهُ واحِدٌ)–. تەماشای روحُ المَعاني که بزانه کوو سەرخۆش دەبێ! پاش إخْتلاف مەلایان له تَرْکیبی آیَةْ، بنۆڕه ئەو رِزقه حَسَنەی که له قصب وترێ إتّخاذ دەکرێ، موجبی حیرەته، وەك عَرض کراوه دۆشاو به خۆڵی سپی دەکرێ ئەو خۆڵ وشیلاوکەی ترێ کوو گەیشتنه یەك؟ به چ مفتاحێ بۆی چووون؟ نازانم! سجووق و باسووقی (سولەیمانی)ش رِزقێ حَسَنه لَذیذه! أكْثَري أشياء مَوادي إبْتدائي له طَرَف خوایه، فروعي به صُنعی بَشَره. ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ﴾ له ذِکر کراوەکان، ﴿لآيَةً﴾ دِقّةْ که چ آیەتێ غریبه (سَکَرْ)! ﴿لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ (آلوسي)ش إشاره یەکێ بۆ دەکا! آنزیاده موجبی نَظَرو جالبي دِقتي مێش ئەنگوینه یه، که عَقل لێی حەیرانه چی دەکا؟ چۆنی دەکا؟ ناچار بالمَجبوریَّة عَطْفي تَعلیمي إلاهي دەکەین ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ﴾ (دِقّەت) که نالێ (ربّکم) له (نظریه)ی وان دووره. که هاته (وَحی) له (إیمان)ی وان

دەرئەچێ، هاویشتیەتە، بلێم چی؟ دەماغی، (قلب)ی؟ وەکی (طنطاوي) ئەڵێ: (علم) و (عمل)یکی (ضروري) دایتی، پێی ئەڵێن" (عقل)ی (غَریزی)" ئەو (عقل)ە (صُنع)ی (دقیقە) ئەکا، یەك (نوع)ە، بێ (تفنُّن)ە، وەك (عقل)ی (بشري) نیە ﴿أَنْ اتَّخذِي منْ الْجبَالِ﴾ لەناو شاخان ﴿بُيُوتًا﴾ خانووشارە ﴿وَمنْ الشَّجَرِ﴾ کلۆرایی دار ﴿وَممَّا يَعْرِشُونَ﴾ ئەو زەنبیلانەی (بَشَر) بۆیان دروست ئەکەن مێش ئەنگوینە، باوەر ناکەم (آلآنْ)یش لە (مکە) و (مدینە) بەخێو بکرێ. چائەو شانەی دایدەنی، هەنگوینی تێ ئەکا، چونی دروست ئەکا؟ نازاندری. ئاوروپایی شوشەی گەورەیان بۆ دروست ئەکەن، تا تەماشا کەن چۆنی دادەنێ؟ لە ناوەوە بە شەمێ سواغی ئەدا، ناوەوەی نابیندرێ (سبحان الله!) ﴿ثُمَّ كُلِي منْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ﴾ میوە نیە نەیخوا، وەگوڵی داران وگوڵی گیایان ئەخوا، لام وایە پاش ثَمرات لە گلووك بەولاوە ناخوا. بەهاران شکۆفە زۆرە، هاوینان تا دوای پەڵە –جگە لە مێو– لە گلووکی بامیە وباینجان ولوبیاو (أنواع)ی سەبزەو گوڵی سەبزە، گندۆرە، ترۆزی، شفتی إستفادە ئەکا ﴿فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّك ذُلُلاً﴾ (حقاً) ئەوە (غایەت) (عجایب)ە، لە (مَأوا)ی خۆی دەر ئەکەوێ، ئەگەڕێ، باز ئەڕواتەوە جێی خۆی، ڕێ ی لێ ناگۆڕێ! ئەوانەی (تتبُع)یان کردیە، بەهەستانی لە دەم ئاو، (مثلا) ئەزانی بۆ چ لایە ئەچێ، وەجێی دوورە یانزیکە؟ ئەگەر کەم بلَند بوو، کەم خولی دا یاهەر نەیدا، نێزیکە یازۆر نیزیکە، ئەگەر زۆر بلَند بوو، چەند (دَوْرە)یەکی مازوانی دا، شاری دوورە.

لە (باڵەکان) ئەیان بەنە کوێستان، (مَنزِل) بە (منزل) زەنبیلەکانیان دادەنێن، میشەکان ئەچنە دەر، بۆ لەوەڕ، دێنەوە شاری خۆیان، نەڕێ نەخانوویان لێ ناگۆڕێ! (جَناب)ی (حَق) ڕێی ئەوها بۆ (سَهل) کردینە. بەو (نوع)ە بۆ (غِذاء) بە هەوادا، دێو دەچن (مع هذا) (بعضاً) ئەیان بینین، ئەکەونە ناو قولەتین، (بَین)یان لەگەڵ دیوار، (محض) بە (قدر) (أنمل)ەیەکە، ڕێی پێ نابا، ئەخولێتەوە لەسەر ئەو ئاوە، گیر ئەخوا، تا بێ هێز ئەبێ، لە

(حرکە) ئەکەویّ، ئەخنکیّ! ﴿يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا﴾ چۆن دەرئەچیّ؟ دوایە قسەی لیّ ئەکەین ﴿شَرَابٌ﴾ هەنگوین. لە (بلاد)ی (حارّ)ە خواردنەوەی (مُوافق)ە، لە ولاّتی (بارد)ە کەم وایە شەربەتی بخۆنەوە، (أمّا) (دائم) بەنانی ئەخۆن ﴿مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ﴾ (إختلاف)ی بە (إختلاف)ی (مرعی) و (فصل) و (عُمُر)یان ئەبیّ، قسە لە (محض)ی (إرادە) نیە، وە (إلاّ) (مُمْکن)ە، بیّ (نَحل) و مەحل بۆمان (خلق) کا ﴿فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ﴾ بۆ گەلیّ (علّەت) باشە، (شفا)ی تیا هەیە. (جَناب)ی (رسالەت) (أمر)ی فەرموو، دایانە زگ چوو، آخری پی ی چابوو. (ئیستا) (تَداوی) (إسهال) بە (مُسهل) دەستوورە لە (بین)ی (أطبّاء) (سبحان الله) من زگم پیّ دیّشی. (حاجی ملا أحمد)ی مامم بە (زەحیری)ی (دَموی) (مُبتلا) بوو، (علی الدوام) (شربەت)ی هەنگوینی ئەخواردەوە (عرض)م کرد (مەخۆوە، خراپە، تۆ خوێن دادەنیّی)، توورە ئەبوو ئەی فەرموو (خوا ئەفەرمویّ: (فیە شفاء للناس)" ئەم گوت: قوربان مەعنای وانیە، بۆ هەموو دەردیّ، بۆ هەموو کەسی (شفا)یە" نهایەت ئەو شەوەی تیای چووە (ڕەحمەت)ی خوای، (حَرِم) ئەی ووت: "شەربەتی هەنگوین ناخۆیەوە؟" ئەی فەرموو: "نا"، کاك (حمد) ئەلیّ: خراپە!" (لکن) (وەقت)ی نەمابوو (ڕەحمەت)ی خوای لیّ بیّ بابم هەنگوین و تەڕەیاغی (ڕۆنەکەرە) خوارد، کردیە (إسهال)ی (دَموی) (کَبدی) پیّی چووە (ڕەحمەت)ی خوای. (أمّا) من هەتا ئەیخۆم (ألَمْ)م پیّی نابی. هەنگوینی شەمەترێنکە لە (پشدەر) هەیە ئەلێن: "خۆشە، (خفیف)ە" (أمّا) نەمدیوە! ئەو هەنگوینە چۆن پەیدا دەکا؟ ڕاوەستاین بەڵکو لە ولاّتی خۆمان لە صاحێب (مێشان) بعضە تَحقیقاتیّ نویّ دەست ڕەس دەبیّ! چی وا نەبوو! دووشتم مَقصود بوو یەکیّ زواج یەکیّ مَخْرَجی هەنگوین! بۆ لِقاح وزواج ئەوانی ئێمە خَبَر دار نین، (فَخر) دەفەرمویّ: (هەر هەنگوین دەخوا)، وانیە! بەلیّ مَیْلی لە شیرنایەتی، لە تریّ لە هەنجیر لە هەرمیّ هەیە، لە گۆشت دەنیشیّ دەیخوا، هەلاّلە دەکێشێتەوە بۆ فَرْخان، مَوادی حُلْوە گرد دەکاتەوە وکَذا (شەمیّ)، لاقی بە کولکە ئەگەر ئەو کولکە

نەبێ چی بۆ خڕنابێتەوە، بَعضە لە صاحێب مێشان عُرض ئەکەن هەنگوین لە ژێر باڵی دێتە دەرێ، لام وایە موافِقی عِبارەتی (قُرآن)ە. ئەو شیرنایەتیەی دەیخوا لە دەروونی هَضم دەبێ، قابِلە شتێ وەك مَحَك لە بینی باڵی بێ پاش هَضم لێ ی دەچۆڕێتەوە ناو خانە وەك گووانی حَیوان کە بیدۆشن ئەوشانەی تەواو بووبوو تۆی تێکرا ئەوانی ئێمە دەڵێن: (لەسەری کورك دەبن بە مُدّەی سێ ڕۆژی تەواو دەبێتە مێش، وەلەسەر شانەکە دەگەڕێن، شلفەی أوَّل شایێکی هەیە کە دەرکران دەوری شای خۆیان دەدەن لە دەوری جَمع دەبن، شولفەی دووەم و سێیەم شایان مُتَعدِّدن..). وە ئەوانەی ئێمە دەڵێن: (نارەحەت دەبن بە اضطِراب دەکەون تا یەکێ إنتِخاب دەکەن، ئەوانی تر دەکوژن، وەإلاّ پارچە پارچە دەبن، هەر پارچە بە دوای شایێ دەکەون ئەگەر وابوو دەیانگرینەوە، شایێ دێڵینەوە ئەوانی تر دەکوژین، ئەوجا هەموویان کۆدەبنەوە سەر یەك شاە، وەدادەمەزرێن). بەدامەن زبل دەکەن، دەڵێن لە ناو ماڵی خۆیان زبل ناڕێژن دێنە دەرەوە. وەقسمێ هەیە دەڵێن کەڕە مێشیان دەڵێنێ زلن، بَعضێ دەڵێن تَوَزِّلن هەنگوین دەخۆن، ئەوانی تر نایەڵن دەیانکوژن، عَسَل تازستان ناخۆن. بۆ زواج لە (طَنطاوی) دەلێ: (مَلکە دەچێتەدەر زَوْجێ لە خارجی رَعیەی خۆی پەیدا دەکا، بعد اللّقاح دێتەوە). أما ئەوە وانیە! مَلکە بچێتەدەر آناً هەموویان دوای دەکەون! أمّا لە کتێبی ترم دیوە لە کەرە مێشەکان کە نێزیکی إنتخاب دەکەن بۆ زواجی مَلکە، بَعْدَ اللّقاح ذکورەکان هەموو دەکوژرێن حَقاً ئێش نەچێتە دەست (واحِد) إنتِظامي نیە! لەو وەقتە ئێرەم دەنووسی لەماڵە دیانەکی مێشی دەبرنەوە ئەز قَضا شایەکە دەفەوتێ صاحِبی بۆمی نَقل کرد: (عمومی مێشەکە هاتەدەر بەگژ یەکا چوون بە ظرفي دوو سَعات یەکتریان کوشت دَیّاریان نەما، حتّا وتی مێشی ئەوەندە بە قووەت و زۆر بوو بە تریانی ساواران لاشەیانمان لە ماڵێ فڕێدا). ئەو کائناتە بێ إلاە نابێ! وەلەگەڵ تَعَدّد إنْتِظام غَیْرە قابِلە!!. زستانێ ئەگەر سارد نەبێ وەك ئەو ساڵ، دەرکەی ناگرێ! وەإلاّ دەرکەی لەسەر خۆی پێوە دەدا سڕ دەبێ لە گەرمەی بەهار

بەخَبَر دێ –وەکی أصحابُ الكَهف– دەرکەی دەکاتەوە بە ئەستوری هاموشۆی دەکا لەو مەیانە تا شینای وشیرنایی پەیدا دەبێ زەخیرەی خۆی دەخوا، مارت ونیسان ڕایەڵە دەکا، لە مایس وحُزَیران هەنگوین دادەنێ، بَعْدَه نابێ!. جارێ ئەوەندە بەسە تا خبرم لای (شێخی سەلان) بۆدێ دائر بە زاوو زێ، لەوێم چ بۆبێ تحریری دەکەم.

جا جێی إعتِبارە لە (نحل) إنتظام وإرادە و تشکیلی حکومەت و إطاعەی سەردارو إتّحادی تام. وەدەڵێن أکثَري أموري هامّة إنسان لە حَیْواناتی وەرگرتیە، ئێمە مَعَ الأسَف لەو دقّتە محرومین، خاصةً عُلومي کَوْنیّه وفِعلیّە، بۆ مەلایان نُقصانە! مەلا چ حەقی هەیە بزانێ (نَحل) شانە چۆن دروست دەکا؟ کوو عَسَل خرِدەکاتەوە؟ إدارەیان بە چ طَرزە؟ (نحل) نەخۆش دەبێ زەردووی دەگرێ سَبَبَی چیە؟ بەچی تداوی دەکرێ؟ جَواب، جَهلە!!.

خۆخ بۆ زوو دەمرێ ئەوەندە جەویە دەردەکا؟ بلّێم چی کاری خوایە، ئەوەی دەزانم –عَلَی نَهْجِ الأشاعِرَة– لە أسبابی عادی دەپرسم!! سێو هەلوچکە ئالی بالی زەردەلوو قەیسی بۆ کون کون دەبێ؟ جەوی دەردەکا بە فَساد دەچێ؟ نازانم، کاری خوایە! بەڵێ من دەزانم بَعضە حَشرات هەن دەرزیلەی باریك باریکیان بەدەمەوەیە لە میوەکەی دەدا، ئەو حَشراتە بەچی دەفەوتێن؟ هیچ! ناشُکری نەبێ سەراسەر جَهْلە! باغەوانێ چل سالْ لەناو باغ عومر ڕادەبوێرێ مَعَ الأسف لە من جاهلترە، مُمکنە ئەو نَوعە کەسە لە سالفی أیّام لە ترسی مەلایان نەوێرابێ تەماشاکا وە أسباب وعِلّلی بۆ ظاهر ببێ. ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ﴾ ئەوی ذکر کرا بینۆڕێ ﴿لَآيَةً﴾ آیەتێ گەورەو عَجیبە. ﴿لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بۆ (إستنتاج)ی (علم) و (عمل) وەرگرتن. ئەی (قوم)ی (نجیب) بنۆڕنە (تفرّق)ی خۆتان و (إجتماع)ی (نحل)، (محصول)ی وان و (حاصل)ی خۆتان، وە (تأمّل) کەن بە چەند هەزار (مَرتب)ە لە ئێوە لە (ألهە)تان زیترن. (فائدە)یان چەند زۆرە، ڕێ چۆن دەردەکەن؟ ئێوە چەند گەمڕاهن! چارە (إتحاد)ی (کلمە)یە، (إطاعة)ی (ذات)ێ (واحد)ە بارێ هیچ نەبێ قورئان

مەکەنە (أُضحوك)ە، بە (هَذیان)ی شیعان. گویٚ مەدەنە قسەی بۆفی زلزلی پفهمای صوفییان بنۆڕنە (نحل)ی (أرواح)ی (جبال)، (أنوار)ی (ذات)ی (أشجار)، (أنوار)ی (صفات)، (أنوار)ی (عروش)ی (أفعال) (نور)ی (بَها)ی (أنواء)ی (ذاتیه)، (أزهار)ی (أنوار)ی (أفعالیه)، (شراب)ی (معرفةُ الله)، بیٚ (تأویل)و مَأویل، (تَتَبُّع)ی (آثار)ی (آیات)ی خواکەن، بە (علم)ی (عملی) (زیاد) (مستفید) بن. پاش (ظلال)ی (حیوانات)و (ثمرات)، نەختی تەماشای خۆتان کەن ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ﴾ دیارە وەك باپیر (ملا عبدالرحمن)م لە (رسالە)ی (إثبات)ی (واجب) ئەفەرمویٚ: "لە هەموو کەس نیزکتر لە (خلق)ی ئێمە، داك و بابە، لیٚ یان ئەپرسم، (قطعیاً) ئاگایان لە (خلق)ی ئێمە نەبووە، نە (قدرەت)یان نە (علم)یان نە (إرادە)یان (مُداخلە)ی نیە"

من ئەڵێم: ئەگەر بە دیدەیی (علم) بنوڕینە خۆمان، (خالق)ی ئێمە یا طبیعەت یا خوایە، (طبیعەت)ی بیٚ (شعور)و (إدراك) ئەو (صنع)ە (بدیع)ەی لە چنگ نایە، (خصوص) (عقل) و (قُوای) (مُدرکە) لەگەڵ بیٚ (إدراك)ی چ (نسبەت)ی هەیە؟! ئەمینیتەوە خوا. (مَلك)و جنۆکە پاش (إیمان) بە (رسول) لامان (موجود)ن" ﴿ثُمَّ يَتَوَفَّاكُمْ﴾ مردن وژین لە دەست ئەوە، کەس ناتوانیٚ بژێنیٚ بمرێنیٚ. وە (روح) شتیٚ وانیە، بچێتە ناو توورەگەو کولەکەو (قفص)ان. ﴿وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ﴾ پیری، بی قوەت، بی قیمەت لای خیزانی ومندالآنی. هەرچەند ژین ومردن وعُمر ودرێژی عُمر وکورتی، بیٚ (إنتظام)ە (سرّ)یش نازاندریٚ، بەس (راجع)ی خوایە خۆی بە (حق) ئەزانی بۆ چ وایە؟! ﴿لِكَيْ لاَ يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئًا﴾ دلدانەوەیەکی تیایە، بۆ عُمر کورتان. بیان نۆڕنیٚ ئەگەر زۆر بژین، آخری ئەو ڕەزالەت و (جهالەت)ەیە، (نسیان)یٚ (عارِض) ئەبیٚ. ئەوە کیٚیە؟ فلانە، هەندە ناچیٚ لە یادی ئەچیٚ، ئەوە کیٚیە؟ فلانە وە(هکذا)..

هەرچی (ذی قوّة) بیٚ (غیری) خوا، (قوّەت)ی ئەبڕیٚ، (قُوا)ی (جسمانی)، (ئاثار)ی (قُوا)ی (جسمانی) (مُتناهی)یە ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ﴾ (مُنَزَّه)ە لە

(عوارض)ی (سهو) و (نسیان) ﴿قَدِيرٌ﴾ (قوّه)یی بێ (نفاد)ه، هەرچی (مقتضا)ی (ذاتی)یه، (دوام)ی به (دوام)ی (ذات)ه، (صفات)ی (واجب الوجود) بێ (نقص)ه ﴿وَاللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الرِّزْقِ﴾ وەکی (عُمر). (بعض)ی دەوڵەمەندو ڕزق زۆر، (بعض)ی (فقیر) کەم ڕزق (بعض)ی (ڕزق)یان به (لذّەت)ه (أطعم)ەی گوناه گونه، ساواری بخوا دێته حەلوەلایه، (بعض)ی گەنم وسلقی بخوا، له (قَبول)ی لای خوشتره ﴿فَمَا الَّذِينَ فُضِّلُوا﴾ له هونەری خۆیان بنۆڕن ﴿بِرَادِّي رِزْقِهِمْ﴾ (ڕزق)ی خۆیان (عطا) ناکەن ﴿عَلَى مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ﴾ بەسەریاندا نارژێنن، (إنعام)یان له (حق) ناکەن ﴿فَهُمْ﴾ له (حقیقەت)دا ﴿فِيهِ﴾ له (ڕزق) ﴿سَوَاءٌ﴾ که ئێوه (تنزل) نەکەن (عَبد)ی خۆتان (شریك)تان نەبن له (طعام)، (مَعَ أنّهُ) (مُماثل)ن (إفراد)ی (ماهیّەت)یکن، چۆن شتی (غایەت) دوور، ئەکەنه (شریك)ی (کبریاء)ی؟ (عبد)ێ (جاهل)ی بێ هێز، به ناوی (قُطب) ومُطب، ئەهاوێنه (دَرجه)ی (إلهی)؟ له (علم) و(قدرەت) و (إحاطة) و (إداره)ی (أنام)، ئەڵێن: "خوا پێ‌ی ئەدا" وەی وای! (عِلم) و (قدرەت)ی که له (مُقتضا)ی (ذات)ی (واجب الوجود)ه چۆن (مِثلی) ئەدرێته (عَمر) و (زَید)؟ له (دائره)ی (قدرەت) نیه، (إتحاد) و (حُلول)، (فَنا)ی (وجود)ه، (مَظهریەت)ه، (حاشا). دوو (معنا)ی تریان فەرمووه، زۆر (مُناسب)ی (مقام) نیه ﴿أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾؟ ئەڵێن: "ئەو (تفضیل)ه له (طرف) خوا نیه" ئەدی بەچی ئێوه بووینه (مالِك)، ئەوان بووینه (مَملوك)؟ وەك (حیوانات) (إستخدام)یان ئەکەن، ئەوانیش وەك ئێوه (إنسان) نین؟ ﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا﴾ ئەگەر لەبەر چاو نەبا، (ممکن) بوو بڵێین (هەرکەسه ژنی له کورته پەراسووی خۆی بو (خلق) کراوه، وەك (حضرەت)ی (آدم)ی "کێ تووی کرده نێر، ئەوی کرده مێ؟ ئەوەش (إنکار ئەکەن)؟ یاخود (حضرەت)ی (شێخ) پێوەی چەسپاندینه! ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَنِينَ﴾ (ذکور) ﴿وَحَفَدَةً﴾ (إناث) یا (أولاد)ی (أولاد) به (واسطه)ی (أولاد) ﴿وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ﴾ له شتی به (لذەت) وەك هەنگوین ﴿أَفَبِالْبَاطِلِ

يُؤْمنُونَ﴾؟ (الجواب) (نعم!) ﴿وَبِنِعْمَةِ اللَّه هُمْ﴾ (عَلى الْحَصر)! ﴿يَكْفُرُونَ﴾ هەردوولايان هەيە. أسبابى چيە عالەم نَفرَت لە خوا دەكا، كەس خواى بە ڕاستى وخزمەتى بە ڕاستى ناوێ؟ حَقّاً ئەمڕۆ مؤمِن وكافِر، تا مُمكنيان بێ خۆيان لە خوا دوور دەكەنەوە، چ نەبێ بە (عيسى)ێ، بە (مَلَكي طاووس) بە (شێخى) بە (وَلي)ێ إنكارى نِعْمەتى إلاهى دەكەن. هەر نەئيسە، ئەوانەى سَعي دەكەن لە ئەندرۆنى ئەرزى نەوت دەردێنن، چيايان دەكۆڵن، مَعادن بە دەست دەخەن، قسەيێكى بكەن! أمّا ئەوانە بۆ؟ بۆ ئەو حَياتى حاضِرە (شمس) چ نسبەتى هەيە لەگەڵ (عيسى) لەگەڵ (شەيتان) لەگەڵ (شێخ)؟ (سُبْحَان الله) كُفرانى نِعْمَة بوويتە دينى بَشَر!! إنسانێ لە قورِێ دێنيتە دەر، دەڵێ: قوربانت بم (شێخ عومەر) (ياعَلي) (ياحَيْدَر)!.

دەڵێن: بۆچى لە سورەى (عَنْكَبوت) دەفەرموێ (وَبِنِعمة الله يَكفرون) بێ (هُمْ)؟ بَعضە أجْوِبەيان فەرمووە بێ وَجْه!. لام وايە بە دِقّة تەماشاى آيتي (عَنكبوت)يان نەكرديە! لەوێ دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوا أَنّا جَعَلْنا حَرَماً آمِناً ويُتَخَطَّفُ الناسُ مِنْ حَولِهِم أفَبالباطل يؤمِنونَ وبِنِعمَةِ الله يَكفرون﴾ وەإلاّ دەيان فەرموو چونكى نِعْمەتى وێ خاصّةً بەوان، إنكارى مُجَرَّد بێ أداتى حَصر كافيە، حَصرە لەوان، وەتَوْبيخ وتَقريع بەس بە عائدى وانە. ﴿وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّه﴾ أصْنام ﴿مَا لاَ يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا﴾ كەم و زۆر. ﴿مِنْ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ نەدەتوانن بارانيان بۆ ببارێنن، نە نَباتات وأشجاريان بۆ شين كەن. ﴿شَيْئًا﴾ لە مالكيَّەت. بە دوعا بە تَوَسُّط بە إفاضە، حتّا بە سَيّد وخزمەتكارى. ﴿وَلاَ يَسْتَطِيعُونَ﴾ لە إمكانيەت دانيە، ناگەنە مَرتَبەى (نَحل)ى. ﴿فَلاَ تَضْرِبُوا لِلَّه الأَمْثَالَ﴾ نەكەن بە هەوەس مَثَلي بۆ دارژێنن مِثْل ومُمَثّلي بۆ بخلقێنن! هەرچى بە خَيال دابێ، تَمْثيلي خوا ناكا! هەموو بَشَر سەراسەر سەرى عبوديەت بۆ گاجوت داهێنێتە سەر خاكى مَذَلّة، گاجووت نابێتە خوا تَمْثيلي خوا ناكا! وَهكذا ئەوانەى كەوەكى گاجووتن! ﴿إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ﴾ هەموو شتێ دەزانێ ﴿وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ چ نازانن. ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً﴾ تابزانن ضَربى مَثل بۆ خواى ناكرێ. ﴿عَبْدًا مَمْلُوكًا

لاَ یَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ﴾ حَتّا لۆی پەیدا دەکا، ناتوانێ تَصَرُّفی پێ بکا! ﴿وَمَنْ﴾ شخصێ ﴿رَزَقْنَاهُ مِنَّا﴾ له طَرَف کبریائی. ﴿رِزْقًا حَسَنًا﴾ چاك، پاك، مَرغوبُ فیه، به لەزەت. ﴿فَهُوَ یُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا﴾ کەس دەستی لەبەر دەستی نادا، بەنهانی وئاشکرایی لەو رزقه إنفاق دەکا. ﴿هَلْ یَسْتَوُونَ﴾ وەك یەك دەبن ئەوانه؟ أعزّی کائنات نابێته مُمَثّلی خوای! فَکَیْفَ بالأذَل الأخَس؟ لێره خَیالی طَلاق بەدلدا نایێ! قسه له تَصَرُّفاتی کَونیّەیه! ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ (وَحدَهُ لا شَریكَ لَهُ). ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لاَ یَعْلَمُونَ﴾ مُیول وتَقالید عَقْلیان نایَلێ. ئەو مَثَله عائدێ نَفی قُدرَتێ مَعَ العلمه! ﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً﴾ بۆ نَفی علم، که علم نەبوو قُدرَت نامێنێ! ﴿رَجُلَیْنِ﴾ دووپیاو، مَثَلاً! فلان وفلان نا! ﴿أَحَدُهُمَا أَبْکَمُ﴾ لالّه، نازانێ قسان بکا! أمرێ فطریه، زۆر سَهْله چونکه کەمه که إنسان بێ عەیب خلق کرابێ! ﴿لاَ یَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ﴾ حَرکەی پێ ناکرێ لەبەر نەزانین. ﴿وَهُوَ کَلٌّ﴾ گرانه ﴿عَلَى مَوْلیهُ﴾ ئەوەی بەخێوی دەکا. بنوارە پاکی وأدَبی قُرآن دِقّه کەن منیش تَصریحی پێ ناکەم! ﴿أَیْنَمَا یُوَجِّهُّ لاَ یَأْتِ بِخَیْرٍ﴾ ئەوەی وابێ، دەبێ خزمەتی چۆن بێ؟ ﴿هَلْ یَسْتَوِي هُوَ وَمَنْ یَأْمُرُ بِالْعَدْلِ﴾ ذاتێ نَطوق خَطیب بَلیغ أمریان دەکاتێ به عَدل که جامعي هەموو فَضائله.

﴿وَهُوَ عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِیمٍ﴾ لەسەر رێی راستا دەگاته مآربي خۆی، کاری خۆی بۆ خۆی دەکا، وەرێ به عالەم نیشان دەدا، حاشا نسبەتیان نیه! إلاهی ئێوەش لەگەلّ خوای عَلاّمُ الغُیوب مُحیي الأموات وەك یەك دەبن؟ حاشا ثُمَّ حاشا بەوەلامیش یەك نابن! ﴿وَلِلَّهِ غَیْبُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ هیچ لەوی بزر نابێ! ﴿وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ﴾ بۆ (سَهولەت) لای خوا ﴿إِلاَّ کَلَمْحِ الْبَصَرِ﴾ (إشارە)یە بەچاو لێکدان، پێلّووی بەسەردا بینی ﴿أَوْ هُوَ أَقْرَبُ﴾ (أسرع)، (عُشر)ی (معشار)ی (عاشر)ە، (ذاتا) (زمان) (قابل)ی (تقسیم)ە. کابرایه ئەستێو بەردی لێکدا، قاوەکەی هەلّبوو، وتی: "بەسەری میری، حەزم لێ با زووترم هەلّدەکرد" وتیان: "چۆن ئەبێ" وتی: "دەستم بلّند نەدەکرد، ئەستێم لەبەردەکه ئەخشاند وهەلّئەبوو!" ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَى کُلِّ شَيْءٍ قَدِیرٌ﴾ کێ (تمثیل) ی خوای

(علاّم الغیوب)ی (قادر)ی (مطلق) ئەکا؟ بە (حق) (اُلوهیەت)ی بی (علم)ی (شامل) و (قُدرەت)ی (کامل) ناکرێ ﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ﴾ بێ (حاجەت) بە (ربّ الولاده) وە (مَلَك). (قانون)ەکی دانایە، (موادّ)ی (مُهیّا) کردیە بۆ (توسیع) و (تسهیل)ی هاتنەدەر لەو (مضیق)ە! (مراجعە)ی کتابی (قانون الزواج) کەن، چ ئەبی؟ تا ئەو منالّە ئەبێ! ئەگەر کەوتە تەنگانە، ئەوجا بە (إمداد)ی (إلاهی) (حکیم)ی (ماهر)، (آلەت) و (أدوات)ی باشی (عصری) بۆ هێنانە دەری منداڵ بەساغی –گەر (ممکن) نەبوو– بە مردی، ئەهێنێ. گەلێ ئەبێ خوا (رحم) کا، بێ دقتور خۆی فرێی ئەدا بە (سلامەت)ی.

لە ولاّتی ئێمە ئەوە (حالاً) نیە، بە (دُعا) و دادی قروسمین، دۆخینی کەسی (زینا)ی نەکردبی، لەو (عُسر)ە (نجات)یان ئەدەین! (قابلە)ی باشیشمان نەما ئەگەر (قُطر)ی سەر گەورەتر لە (قطر)ی (مخرج) نایەتەدەر (غَیر)ی ئێمە (عالَم)ی (مَدنی) زۆر (إعتنایان) بە (مسألە)ی (تولید) کردیە. لەوڕێگەدا (خارقە) ئەنوێنن (حالاً) وەکی گوتمان بە (مزخرفات)ی قدیم پف وتف (تَوسّل) ئەکری لەم ولاّتە ﴿لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئًا﴾ و(لَو) بلێین (نفس مُجرّد)ە، زێرا (تعلّق)ی (مؤخر)ە. لە (أوّل)ی بوون منداڵ چ نازانی، بەس (حِسّ)ی برسیاتی ئەکا، دوایێ ئەبینی، پاش چەندی ئەبیە، وە(هکذا...) وەك (حُکما)یان (تفصیلات)یان لە (مراتب)ی (إدراك) (ترقی) پێ دایە. (بناء) بە (تقریر)ی (ملا)ی (قوشەجی) لە (شرح)ی (تجرید) (نفس)ی (مُجَرَّد) درەنگ (تعلق)ی ئەبێ بە (بَدن) وە (تعلّق)ی بو (نَیل)ی (معارِف)ە کەلەسەر (آلات)ی (جسمانی) (مُتوقّف)ە. (حتّی) (إنسان)ێ (کامل) زۆر جار لە (نفس) و (حُضور)ی (نفس)ی (غافل) ئەبێ، ئەمە شتێ (وجدانی)یە (نفسی)نیە. بە فەرموودەی شێخی (إبن سینا) ناگۆڕێ ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ﴾ (قُوا)یەکان لە (أصلا) هەن، لە (خارج) (زیاد) ئەکەن، (بالفعل) بۆ (صاحب)ی (إدراك)ی (أشیاء) وردە وردە پەیا ئەبێ. نەبیستراوە لە (کتاب)ی خوای

(جمع)ی (سمع)، (جمع)ی (بصر) و (فؤاد) لە جێی خۆیەتی. نازانم (جمع) (القلّه) و (جمع الكثرة) كێ دایناوە؟ بویتە (مُوجِب)ی (تشویش). تەماشا لە (أفصح)ی (كلام) لە (مَقام)ی (كثرەت) ئەوی دەلێن: (جمع القِلّه)یە (إستعمال) دەكرێ جێی (نكات)ی (بلاغەت)ی نیە.

(إدراكات)ی (أوّلی)ی (سمع) و (بَصر) بۆ (إنسان) (موجب)ی (إمتیاز) نیە. (إدراك)ی (تَبصّر) و (تأمُّل)ە لە (مسموعات) و (مُبصرات) خۆیەتی. وەك (معانی) (ثانوی) (بلاغەت) هەبێ، بیبینی، (حكمەت)ی وەرنەگرێ، (علامەت)ی بێ (فؤادی)یە ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ لە (إقتنا)ی (علم) و (معارف)یان (صرف) كەن (حقیقەت)ی (شكری) (نعمەت) ئەوەیە، نەك هەر بە زوبان زۆر (شُكر) ﴿أَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ﴾ گاهێ (عطف)ی نیگایە ناكەن، بنۆڕنە (طیر)آن (أنواع): گچكە، گەورە. ﴿مُسَخَّرَاتٍ﴾ لە (أوّل)ی (فطرەت) كە بە (طیر) (خُلق)آون، یاوە(لَو) (بعد التطور) (ألآن) (مُسخّر)ن ﴿فِي جَوِّ السَّمَاءِ﴾ لە (بین)ی (أرض) و ئاسمان چۆن ئەفرن؟ (أسباب)ی (فِطریة)ی (طیران) یان چیە؟ دیارە بە (علم)ی خۆیان نیە (كُلٌّ مُیَسّرٌ لِما خُلِقَ لَهُ) (طیر)ە حەواویلە نانیشی —(بِلا فتور) ئەفرێ، ئەخولێتەوە لە دوای (رزق)، ئەگەر بكەویتە عاردی، نافرێتەوە، لاقی زۆر كورتە، خۆی پێ هەڵنادرێ. ئەو (طیر)ەی زۆر لە عاردی بڕوا فڕینی كەمە، ئەوەی تا نەفرێ لە هێلانەدا دەمێنی زۆر ئەفرێ، بە (دائم)ی (علما)ی (طبیعەت) كە (لایق)ە پێیان بڵێین: (تلمیذ)ی (صانع)ی (حقیقی) لە (كیفیەت)ی (صُنع) ئەفكرن (بَعد النظر) (بالفعل) (إستفادە) ئەكەن لە (قواعد)ی (طیران)ی (طیران) فكرین، (موفق) بوون. بە (طیّار)ە لە (جَوّی) (سَماء) بە (سُرعەت)ێ (فائقە) (كیفیّەت)ی (فارقە) ئەفڕن ﴿مَا يُمْسِكُهُنَّ﴾ ڕایان ناگرێ ﴿إِلاَّ اللّهُ﴾ هەر خوا ئاگادریان ئەكا لە كەوتن، خوا چۆنی (خلق) كردینە، چ (آلەت) و (أدوات)ی داینێ؟ (إدراك)ی (تفصیل)ی (عائد)ی (بَشَر)ە. ئەوانەی (بحّاث)لە (أحوال)ی (كائنات) (إلاه) و مِلاە، (دخل)یان ینە، (بِوَجهٍ مِنَ الوُجُوهِ) خۆیان پێی خەریك ئەكەن، چیان پێ ئەكرێ. (إنسان لەسەر ئەو

هەموو (عِلم)ە (بِالذّات) ناتوانی بفڕی، مەگەر بەباڵی (أوهام) لە (جوّ)ی (خیال) فڕی فڕی قەل فڕی!

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ﴾ لەو (تدبیر)ە ﴿لَآيَاتٍ﴾ چەند؟ (لا يُعدّ) ﴿لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (نور)ی إیمان لە (فؤاد)دا، چاوو گوێی (إنسان) ئەکاتەوە. ئەبیە، ئەتوڕێ، (تفکّر) ئەکا، (إیمان)ی بەهەموو شت ئێنێ (عَلی ماهُوَ عَلیه) (مؤمِن)ی بەڕاستی ئەوەتە، هەم (إلاهی) هەم (طبیعی) بێ، نە بە إیمان بە خوا (إنکار)ی (طبیعەت)بکا، نەبە (أحوالات)ی (ظاهر)ی (طبیعیات) (إنکاری)ی (تدبیر)ی (إله) بکا ئەگەر (طرفین) (مُنافره)یان نەهاویشتبا (بین)ی (إله) و (طبیعەت)، (أحوال) (عالَم) گەلێ باشتر ئەبوو. (شرع)ی (تکوین)ی (شرع)ی (تکلیف)ی نابێ (مُنافی) بن، چونکی لە (طرف) یەك (ذات) (وضع) کراین، بە (محض)ی (خلق) بە (محض)ی (إراده). (سنّی) یان (أشاعران) کاریان تیك دایە. (کائنات) کتیبی خوایە، ئەوی چاوی هەبێ ئەی خوینیتەوە، چی تیایە؟ (بِقَدَر الطاقة) ئەیزانی، (إستفاده)ی لێ ئەکا، ئەمە خۆیەتی. (جوازات) و (إمکانیات)ی (ذاتیه) و (کرامات) (سلب)ی (قُوای) لە مسڵمانان کرد، کەوتنە داوی (أوهام) و (خیال)، گوم بوون. (صرف)ی (نظر)یان لە (آیات)ی (مشهور)ە کرد، چوون بۆ (لوحَ المحفوظ) لە چوون (غائب) بوون. هەرچەند (بعضی) لە گرمەی تۆپ وشەقەی دانەی بۆمبا، ڕێژنەی (رشاشه) بە خَبَر هاتن، (لکن) چ سوود؟ (سواد)ی (أعظم) (حالاً) بە ئاگا نەهاتیە، ئەوەی بە ئاگاش هات (مع الاسف) ڕووی کردە (سفاهەت) و (ضلالەت) ﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ﴾ لە خانی خۆتان کە دروستی ئەکەن، لەوەی دروستی ئەکەن ﴿سَكَنًا﴾ (بعض)ە جێ خۆش، ئی ئارام و (إستراحەت) و زۆر (ممتاز) ترە، لە جێی (مواشی)تان. ئەمڕۆ بنۆڕنە سکنای (بَشَر) چۆنی ئەکا؟ لە چی؟ خۆزێی (أبو جهل) و (ولید) و ئەمانە، لەو زەمانە چاویان بە (مکه) کەوتبا ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ جُلُودِ الْأَنْعَامِ﴾ پیستی مەڕو بزن و حوشتر و (سائر)ە ﴿بُيُوتًا﴾ نیشتەنی (سیّار)ە ﴿تَسْتَخِفُّونَهَا﴾ بەسووکی ئەبینن ﴿يَوْمَ ظَعْنِكُمْ﴾ کە لە ڕۆژی کوچ

کردنتان ئەیهاوێنە سەرپشتی ولاغان ﴿وَيَوْمَ إِقَامَتِكُمْ﴾ بە سووك وئاسانی هەڵی ئەدەن، لە ژێری دادەنیشن، (إنسان) (حیوان)ێ (بادیُ البشره)یە، یەعنی پێستی بەدەرەوەیە، وەك مەڕو بزن، خوری و مووی نیە، ناسکە بەری سەرماو گەرمای ناگرێ (خاصةً) لە (بلاد)ی (حارە) کە بای (سموم)ی زۆرە. (إنسان) بە (أکثری) (حوائج)ی (طبیعی) ناچاری کرد، خانوو بکا، (ساکن) بێ وەك مارو قومقوم وکیسەڵ لەناو ئەرزا بژیە.

بۆ حیوان لەوەڕاندن (إحتیاج)ی بوو بە (نقل)، (خێمە)ی دروست کرد، (لباس)ی پەیاکرد، (حتّی) (ألجائات)ی گرانی، چەند (نباتات)ی دەرخست کە بۆ (بَشَر) باشە، (إدامە)ی (حیات)ی پێ ئەکا، وەچەندی (مُضِرّ)ە پێی ئەمرێ.

ئەو (جَعْل)انەی لەم (آیات)ە ئەفەرموی، هەمووی (تابع)ی (جعل)ی (أصلی)یە، وە(إلا) لەوڕۆژە کە خوا (إنسان)ی (خلق) کردیە، تا ئەمڕۆ کێ دیتویەتی؟ خانوو (خێم)ە، بەڕە، کراس و دەرپێ خوا بۆ کەسی بکا!

وەك (موادّ)ی (إبتدائی) بێ (صُنع)ی (بَشَر) هاتبێتە (ظهور)؟ ئەڵێن: (إحتیاج)ی (خلق)ی (أشیاء) ئەکا" خۆزی (بَشَر) لەسەر (قدری) (إحتیاج)ی مابا، خۆی دووچاری (مشقّەت)ی (حاضر) نەکردبا. ﴿وَمِنْ أَصْوَافِهَا﴾ خوری مەڕ ﴿وَأَوْبَارِهَا﴾ تووکی حوشتر ﴿وَأَشْعَارِهَا﴾ موی بزنە مەرەزیش (داخل)ی مووە، یاخود زۆر (محتاج إلیه) نەبوەوە. لام وایە (ألآن)یش بزنە مەرەز لە بلادی عەرەبانا نیە ﴿أَثَاثًا﴾ بەڕەو جَوالْ ومافورو تێرو توور، عەبای (آبرەو) و بەتیەو فاصون چوغە، گەبەردین، (سائر)ی (أقمشە)ی(نفیس)ە ﴿وَمَتَاعًا إِلَى حِينٍ﴾ (إستفادە)ی لێ ئەکەن بە فرۆشتن، لەبەر کردن تا (قیامەت)، (نظر) بە (نوع) ﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِمَّا خَلَقَ ظِلَالًا﴾ گەلێ (أشیا)ی سایەدار (صرف) بە (خلق)ی خوایە، کەپرو سابات وچەتر، گەرچی (مداخلە)ی (بشر)ی تیدایە، (أساس)ی لەمەڕ خودایە ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ﴾ لە (سالف)ی (أيّام) ﴿مِنَ الْجِبَالِ أَكْنَانًا﴾ خۆی تیا بزر کەن، (جمع)ی (کَنّ)ە بە (معنا) (سَتر)ە، لە (أوّل)ەوە

(أكثر) له (غاران) خۆیان ئەشاردەوه، له ترسی دڕوندان. ئیستاش گەلی جار، (إلتجاء) بۆ (مغاران) و ئەشکەوتان ئەبردرێ ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَابِيلَ﴾ کراس، دەرپێ ئەوەی لەبەر بکرێ ﴿تَقِيكُمُ الْحَرَّ﴾ له (بلاد)ی (حارّه)ی (سامّ)ه (لباس) (واقی)یه (عظیم)ه، تائەستوور تربێ، چاکتره ﴿وَسَرَابِيلَ تَقِيكُمْ بَأْسَكُمْ﴾ زرێ بۆ (حرب) ئەپۆشن له نوکەڕم وسەرەتیر، ئەتان پارێزێ (سبحان الله) ئەڵێن: (أكثر)ی (صنایع) له أنبیایان وەرگیراوه. رزێ تا (إنقلاب)ی (حاضری)ی زۆر باش بوو، (أمّا) ئیستا لەگەڵ کراسی کتان (فرق)ی نیه، لەگەڵ دانەی (هاون) تۆپی (شرانبیل) بۆمبای دینمیت، غازاتی سامّه، ألغامی (نار)یه چی پێ ئەکرێ؟ ﴿كَذَلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ﴾ بۆ (آت)ی ئەگەر (عبور)یان نەبا لەسەر (قدیم)، ئەو (إختراعات)ه (عائد)ی (مسوڵمانان) بوو، قوڕأنی (کریم) (أُمّ الكتاب)ه (مفتاح العلوم)ه (معدن)ه، چ (شرع)ی (تکلیف)ی چ (تکوین)ی (مبادئ)ی دادەنی تا (مسوڵمانان) به (فکر) و (عمل) (ترقی) کەن به (إجتهاد)ی (علمَین) (أحکام)ی (کافیه) به دەرخەن ﴿لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ﴾ مُنقاد بن تَنَزُّل بکەن بۆ تَحصیلی مَعارِف وکَسْبی کَمالات، زابۆ به ڕفینی أدَب بن، بۆ أُستاذی مُرشدی هادی مل شۆرکەن. ﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا﴾ إعْراضیان إنقیادیان نەکرد، چ نَقصی تۆی تیانیه! ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾ ئەوا دیاره لەو خصوصه چ سَعْی بَلیغ دەکەی وەکی دەڵێ:

مَنان چی شَرطی بَلاغَت باتۆ گوێم توخوا أز سُنَخَم پندگیر وخواه مَلال

﴿يَعْرِفُونَ نِعْمَةَ اللَّهِ﴾ دەزانن ئەو نعمەته له (طَرَف) خوایه، إلاهی وان مُداخَلەی نیه. ﴿ثُمَّ﴾ لەسەر ئەوەش ﴿يُنكِرُونَهَا﴾ مع أنّهُ دوور بوو، نەدەبا إنکاری کەن. إنکاری نِعمَتی إلاهی ئەمڕۆ زۆر ئاسانه، بەناوی دین و إعتقاد، به کُلّی إسنادی بۆ غَیْری دەدەن، (شێخ) ناردی، له سایەی سەری (ئاغای)، چ ئاگاشیان لێ نیه! ڕەنگه آغا إعْتراف بکا، بەلاّم شێخ، نا! ﴿وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ﴾ لەبەر تَکَبّر ونخوت، به نعْمەتی نازانێ! ﴿وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ﴾ شَعبێ، قَومێ، عُنْصُرێ. ﴿شَهِيدًا﴾ رَسولی خۆیان شاهیدیان لەسەر دەدا،

ئەوسا حاڵیان مَعلوم دەبێ. ﴿ثُمَّ﴾ دوای أدای شَهادت. ﴿لاَ يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ له إعْتذار،، له حَركه، بۆ هیچ لایێ نَجاتیان نیه. ﴿وَلاَ هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ﴾ إرضاش ناكرێن، مَعَ أنَّهُ عَظَمەت وتَكَبُّر وأنانیەتی وان وای دەویست كه خوا تَرضیه بداته وان، أمّا أهمیەتیان پێ نادرێ. ﴿وَإِذَا رَأَى الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ به شرك وكُفْران. كه حسّیان كرد، زۆر به شدّەت حسّی دەكەن. ﴿فَلاَ يُخَفَّفُ عَنْهُمْ﴾ فَضل له برانەوه ﴿وَلاَ هُمْ يُنظَرُونَ﴾ مُهلەت نادرێن، نەله أوَّل، نەله نهایەت. ﴿وَإِذَا رَأَى الَّذِينَ أَشْرَكُوا شُرَكَاءَهُمْ﴾ كه رواساكانیان دیت. ﴿قَالُوا رَبَّنَا هَؤُلاَءِ شُرَكَاؤُنَا الَّذِينَ كُنَّا نَدْعُو مِنْ دُونِكَ﴾ خۆیان كردبووه رواُساء وەدەیان ووت: (ئێوه مُنَجَّسن، نداكەنه ئێمه، ناگەن بەو مَرْتَبه كه ندا كەنه بەر خوا، ئەو بپەرستن!). أصلی قَباحەت لەوانه، بەحەق لایەقی عَذاب، ئەوانن! ﴿فَأَلْقَوْا﴾ شُركایەكان ﴿إِلَيْهِمُ الْقَوْلَ﴾ قسەیان هاویشتنێ. ﴿إِنَّكُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ ئێمه سُلْطانمان لەسەر ئێوه نەبوه، ئێوه نەبان ئێمه هیچ قووەت وقُدْرەت وشكوهمان نەبوو. ﴿وَأَلْقَوْا﴾ طَرَفَيْن ﴿إِلَى اللهِ يَوْمَئِذٍ السَّلَمَ﴾ له حُكم كردن، كه أساساً قَباحتی كام لایانه. ﴿وَضَلَّ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ له دونیا له حق یەك چیان دەگوت، به چ میلێ هەڵدەخەڵەتان، به چ میلێ هەڵیاندەخەڵەتاندن، ڕۆژی جَزا هەمووی گوم بوو كەلكی نەگرتن، ئەوڕۆژێ درۆو دەلەسه بەكار نابێ! من زۆر تَردُّد دەكەم گومراهی أوَّلاً لەمەڕ كێیه؟ ظَنّي غالِب دەچێ لەمەڕ أهالیه! نا، رواُساء بەگوێرەی مَیلی وان، عَقاید وأحكامیان بۆ دادەنێن، عاقبة خۆشیان مُتأثِر دەبن. مُضلّەكانی ئێستا وەكو عَرض دەكەم، وان! ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ خۆیان ﴿وَصَدُّوا﴾ خەڵكی. ﴿عَنْ سَبِيلِ اللهِ﴾ له ڕێی ڕاست مَنْعیان دەكەن، یعنی له دینی حەق. قابل ونا قابل أقارب وأجانب وأباعدْ ﴿زِدْنَاهُمْ﴾ زیادمان بۆ كردن. ﴿عَذَابًا فَوْقَ الْعَذَابِ﴾ كَمّاً وكَيْفاً! خوایه هەروەكو له دونیا بۆمان مَعلوم نەبوو ئەو زێدەییه به چیه، له قیامەتیش نەیبینین وەنەیزانین!!.

﴿بِمَا كَانُوا يُفْسِدُونَ﴾ ضَلال وإضْلال. ﴿وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ﴾ حتّا قَوْمي من، يَعني (كوردي) نَجيب ﴿شَهِيدًا عَلَيْهِمْ﴾ ئەوەی لە دونیا بە رِسالەت ناردرایتە سەریان ﴿مِنْ أَنفُسِهِمْ﴾ لە خۆیان، وەك جنابی رِسالەت لە (عَرَبْ). ئەمرِۆ أكْثَرِي دانایانی (کورد) دەڵێن: ("زەرادوشت" رەسولی کوردان بووە). حَقيقةً گەلێ لە عُلَمای عِظام حَسْبَ التَتَبُّع، تَصديقي رسالەتی "زەردەشت"یان کردیە، رِەسولێ بە حەق بووە، لام وایە ئەم (سەردەشت)ی مَشهور أصلاً بەناوی وی بووە، تحریف کرایە، تأريخی معلومە لە آذربایجان بووە، مُعجزەی نُور بووە، لە (إبنُ الحَجَر) وەردەگیرێ (مَجوس) تَحریفی کِتابیان کردیە، ئێستا دەڵێن: بَعْضە آثاري لە کتابي دەرکەوتووە، أحكامی مَعقولی تیایە، أمَّا نابێ کورد بەوقسە لە دین دەرچن. (زەردەشت) رَسولی خوایە، مَعَ الاسَف أساسی دین وئاینی مَجهولە، کتابیەکان هەموومان إیمانمان بە خاتَمُ الرُّسُل سَيِّدَ الكُلْ مُحَمَّد المُصْطَفَىیە! وَلەو حُكْمە دەبێ عالەم مَمونی حَضرەتی (محمد) بێ کە دەفەرموێ: (هەر قَومە رَسولی خۆی بووە)، زێرِا أُمَمی تر ئەوە إنکاری دەکەن، رِسالەت دەدەنە شَعْبی خۆیان وبەس. ﴿وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَى هَؤُلَاءِ﴾ کە رِسولیانی! لە خۆیانی! ئەوەی لەلاتە، لە حەقیان أداءْ دەفەرموێ. أمَّا حَمْلی (هؤلاء) لەسەر أمَم وشُهَدایان، نازانم چۆنە؟ أمّا شمولی بۆ أُمَّة —إلی یَومِ القیامە— لە آثاری رِسالەت پەناهە دوور نیە! دیارە شُهَدای أُمَمەکان شَهیدن لەسەر أُمَّتی خۆیان، ئەمە باشە! أمّا تَعمیمی آیەتی ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ﴾ قُرآني عَظيمُ الشّأن ﴿تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ﴾ عَلى الإطلاق، خۆی نیە، گەرچی كُلِّی أُمَّة لە حەقّی کتابی خۆی ئەو إدِّعایە دەکات، لە حَقیقەت دا وانیە، چ جَبر، چ بە جَفر، ئەو تَعمیمە نابێ! ئەو کُلِّیە إعْتِباریە! واقعاً قرآن بَحرێ بێ پایانە. علمێ غایَة زۆری تیایە، لە فَوْقی کُلِّی کتێبە! لە بَعضە حکایات دەردەکەوێ، إدِّعایەکەیان بە تَسامُحە. (فَخری رازی) لە (إبتدای تَفسیری دەفەرموێ: دەهەزار مَسألە لەو سورەتە إستِنباط دەکرێ، مَعَ أنَّهُ کە تَفصیلاتی تَطبیقی دەکا لەسەر مَسائلي عِلْميەی مُحَرَّرەی مُدَوَّنة، إسْتِنباط لەکوێ؟ تَطبیق لەکوێ؟

ئەگەر تبیان وإشتمال وابێ، دەتوانم هەموو علومی عَقْلی ونَقْلی لە (ضَرَبَ زَیْدٌ) إجْرا بكەم! ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةً﴾ أشهدُ باللهِ مایەی هدایَتە، ئەوەی إتّباعي بكا، نائلی سَعَادَتی دارَین دەبێ، لە ڕەحمەت دا دەژێ، لە ڕەحمەت دا دەمرێ، لە ڕەحمەت دا زیندوو دەبێتەوە، لە ڕەحمەتی أبدی دا دەمێنێ ﴿وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ﴾ عَیْنی بَشارەتە —(إنْ تقل بُشْراً فهذا بُشْرَیانِ بَلْ بَشائِرُ)— بُشْری بە قُرآن، نە بُشْری بە (عیسی) خوای مُتَحَوِّل مُتَطَوِّرْ، نە بە (قادیاني) بەخۆو تَأیدی مَسیحیّەتی، نەبە (بَها)، نە بە رِسالەتی (مُسَیْلمە) و (سَلْمی)!.

خۆزی مُسلْمانان إستِفادەیان لە ما في القُرآن كردبا، ئەوەی بە تَصریح بۆیان بَیان كرایە، لەو های هوویە گەرابان، كَهْرَبا إخْتِراع كرایە؟ بەلێ فلان آیة دەلالەتی لێ دەكا! وَهكَذا طَیّارە وسَیّارە وتَلَفون وتَلَفزیون ومیكروفۆن ومسطاط، لە قُرآن وەرگیرایە؟! دەولەتی (عُثْماني) تا (مَهدي) پایەدارە، كە (مَهدی) وەفاتی كرد، باز خَلافَة بۆ آلی عُثمانە؟!! بە قُرآن راضی نین، أنّهُ عِلْمي زیاتریان دەوێ، دەچن بۆ (لَوْحَ المَحفوظ) چی تیایە؟! بۆ ئێمە ناشُكری نەبێ لە قُرآنْ، لە لَوح، لە أرضي (سمسمە) چیان دۆزیەوە، ئەمڕۆ بۆ أمَّةْ بەكاربێ؟ أجانِبْ بە عِلْمي طَبیعي كیمیا میكانێكی، بە مَقصَد گەیشتن لەسەر ئێمە غالب بوون، حالاً مُسُلمانان خاصَّةً رۆحانیەكان دەست لە ئوشتلومو لاف وگەزاف هەلّناگرن —واغُربَةَ الإسلام وقِلَّةَ الحَیاء—؟!! أشهد بِالله ئەمڕۆ وایە إسلام لەو غُربَتە لەو كُربَتە لەو ذِلّتە، بێ حیایش بەو دەرەجەیە!!! لە ولایەت صَرفِ نَظَر، بۆ رِسالەت دەڕۆن!! برادەران ئێوە بەهۆش بن بنوارن لە آیَتي قرآن، بە عِلم وعَمل إستِفادە كەن، لە ثَمرات ومَنافعي خۆ مَحروم مەكەن! إصلاحی دونیا بكەن بۆ خزمەتی دین! دونیا بۆ دین، پەرژینە! دینی بێ حورمەت، ژینە؟ ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ﴾ لە أحكام، لە إعْتِقاد، لە مَیْل، عَدالەت ڕووحی تَشریعە، ڕووحی إجتماعە، حَتّا كە طَبایع عَدالەتی تێكچوو، كائنات دەكەوێتە زَلزَلة! ﴿وَالإِحْسَانِ﴾ كاری جوان، جوانی كار، جووانكاری ﴿وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى﴾ پێیان كَرَم كەی ئەوی خزم بێ، بابی یا دایكی، تەماشای

خصوصی مەکە. ﴿وَيَنْهَى عَنْ الْفَحْشَاءِ﴾ شتی خراپ وەك زناو وأشباهی. ﴿وَالْمُنكَرِ﴾ ئیشی ناشیرین. دیارە پێشی نَهی، مُنكَرە! نەك مُنكَرَی بە نَهی بێ! ﴿وَالْبَغْيِ﴾ إسْتِعلاء وإستیلاء. دەفەرموون أوَّل راجعە بۆ قووەی شَهَوِیّە، ثانی بۆ قووەی غَضَبِیّە، ثالث بۆ قووەی وَهْمِیّە. کەسێ لە أهلی وجدان بێ، حەزی لە مَکارِم بێ، أخلاقی مُتَنَفِّر لە سَیِّئات بێ وەکی (أكْثَم ي صَفي) ئەو آیَتەی کافیە بە قَومی خۆی فەرمووە: (لەو أمرە سەرین، کلك مەبن!) یَعنی زوو مُسُلمان بن، تأخیر مەبن وەك کلك! –ڕەحمەتی خوای لە (عُمَرى بنی عبدالعزیز) بێ کە ئەو ایَتە هاویشتە خطبەی جمعە–.

سەیری قَومێ ئەوە آیَتي بێ، بَعْدَ الإسلام، لەسەر مَنابرِ لَعْنی یەك کەن!! ﴿يَعِظُكُمْ﴾ جەنابی حق بِالذّات تَنْبیهتان دەکا ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ بەڵێ رجای خوایان بەجێ هێنا، تا کافر بوون قصوریان نەکرد، پاش إسلامەتی ئەوەی فَحْشاو ومُنْکَرو بَغي بوو کردیان هیچیان تیا نەهێشتەوە! ئەمڕۆ تەماشاکە ﴿وَأَوْفُوا بِعَهْدِ اللَّهِ إِذَا عَاهَدْتُمْ﴾ لەگەڵ رَسولی خوای چۆن عَهد دەکەن، بەجێی بێنن بێ نُقصان؟! ﴿وَلاَ تَنقُضُوا الأَيْمَانَ﴾ سوێند. ﴿بَعْدَ تَوْكِيدِهَا﴾ کە لە صَمیمي قَلب بێ. لَغْو الیَمین چ نیە! ﴿وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلاً﴾ شاهد ورَقیب وئاگادار. بایعەکانی شاران کە دەڵێن: (الله وَکیل) ئەوجا قوڵی إنسان دەبڕن. ﴿إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾ ظاهر وباطِن ونَقْض وإبْرام. ﴿وَلاَ تَكُونُوا﴾ مَعاشرَ الرِّجال. ﴿كَالَّتِي﴾ وەك ئەو ژنەی ﴿نَقَضَتْ غَزْلَهَا﴾ هەڵیشوەشاند ڕیسو ڕێسراوی خۆی. ﴿مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ﴾ لە پاش دووتا کردن وڕێستن وهۆندنەوەو تەنینی بە مَحْکَمی. ﴿أَنكَاثًا﴾ نِکثْ بە (کَسري نوني) لە قاموس دەڵێ: هەڵوەشاندنی کۆنە جلکە لە بال یەك بێتەدەرێ بپشکندرێتەوە تادووبارە بڕێسرێتەوە، وە (نَکَثَ) بە (نَقَضَ) مَعْنا لێدەداتەوە، (نَکَثَ) وە (نَقَضَ)، یەکە! یاخود (نَقَضَ) پارچە پارچە کردنە، (نَکَثَ) أجزا لە بال یەك دەرهێنانە، دیارە ئەوە کارێ أحْمَقانەیە!!.) پیاوی عاقڵ بەبێ شُبْهە بەو مُعامَلە راضی نیە. کە بَعْضە نَقْضي عَهد هونەرەکی تیایە، لەبەر شَهامەتی عِزّتی نَفسە، أما

أكْثَري خاصّه به عَهْدي سياسەت، زۆر له إيمانەوه نيه. ئێوه ئەی رِجالی كِرام ﴿تَتَّخِذُونَ أَيْمَانَكُمْ دَخَلاً بَيْنَكُمْ﴾ سوێند ئەخۆن لەگەڵ (قوم)ێ، خۆتان ئەهاوێننه ناو وان، (أنّه) لەوانن. (مقصد)يشتان (غدر)ە (فساد)ە، ئەبينی (عهد)ی وان ئەشكێنن، ئەبنه سوێند خۆری (أمّەت)يكی دی ﴿أَنْ تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرْبَى﴾ به (عَدد) ومالّ زێتر بێ ﴿مِنْ أُمَّةٍ﴾ لەوانەی سوێند خۆرن لەگەڵيان، (كافه)يی (عُهود) و (أيْمان)ی (دُوَلی) (حاضِر)ە وايه. (إيطاليا) (حليف)ی (ألمانيا) بوو، له سايەی ئەو خۆی گرت. له (حرب)ی (عموم)ی نوێ، لەبەر جلوای (حرب) چووه لای (إنكلين)و (فرەنسه). خۆزی (كتاب)ی (إختلال)ی (تَوازن) كه (أصلاً) (تأليف)ی (غوستاف لوبون)ی (أفرنسی)يه ياری (وفاء) دار دقتور (صلاح الدين) (وصف)ی (ترجمه)ی كرديه، لام با، (بعض)ی (فقرات)ی (دائر) به (عهود) و (إيمان)ی (دُوَل)م (نقل) كردبايه ﴿إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ اللَّهُ بِهِ﴾ بەچی؟ بەشتێ (مُستفاد) له پێشەوه، يەعنی (كَوْنَهم أرْبی) خوا (إمتحان)تان ئەكا، بەكەمی (جهەت)ی (نَبوی) وەزۆری (قريش)يان، لام وايه خۆش نيه، يا (راجع) بێ، بۆ (وفا)ی (مفهوم) له (سابِق)، ئەمەش خۆی نيه، لام وايه (راجع)ە بۆ (يَمين)، خوا به سوێند (إمتحان)تان ئەكا (محافظ)ەی ئەكەن، يا ئەی شكێنن؟ ئەوەی پياو بێ، سوێندی پێ ناوێ گوفتايی (عهد) سووندە، ئەوانەی نامەرد بن، زنجير ئەپسێنن، چ جايه (عهد) وسووند! (كورد)ی (صاحب)ی (عهد) و سووند ئەڵێ (إنسان به زوبانی دەبەسترێتەوه، كه گوتی، (كافی)يه ﴿وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ﴾ خوا بۆتان (بَيان) ئەكا ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ كه (أسرار)ی تيا ئاشكرا ئەبێ ﴿مَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ چيه؟ لەبەرچيه؟ (عيسى)و (موسى) (رسول)ن، (محمد) رسول نيه! بۆ (بت)و (أصنام) (تمثيل)ی خوا ئەكەن؟ بۆ (بَشَر) (تحمل)ی (رسالەت)ی خوا ناكا؟ ئەبێ (مَلَك) بێ ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ﴾ (سابِقاً) ﴿لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾ يەك (دين) ويەك (مشرب)، (لكن) ئەمە نابێ تا (أمزِج)ە و (مَيل) و ئارەزوو (مختلف) بێ، گرد بوونەوەی (بَشَر) (محال)ە. گەر خوا له (خلق) و (إيجاد)ی (طبيعی) يەك يا نزيك لەيەكی

داناباں، یەك (شرع)یش ئەبوو. (أمّا) (تفاوت)ی (خُلق) بەو (درجە) (إتحاد)ی (عام) (غَیرە) (مُتصوّر)ە (حتّی) (بعض)ە مەلا، (إجماع)ی (عُلما)ی (أمەت) بە (مُحال) ئەزانن، لەبەر (إختلاف)ی (أدمغ)ەو (أمزج)ەو (میول) ﴿وَلَكِنْ يُضِلُّ مَنْ يَشَاءُ﴾ (متكبّر) و (حسود) و (أرباب)ی (أطماع) و (فتنە) ئەنگێز ﴿وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ﴾ لەیەك حُكْمْ جمعێ هدایەتیان دەبێ، قومێ ضَلال وگومراە دەبن. حَتّا من تَصَوُّر دەكەم مِزاج و مَشْرَبی أنام تەماشا دەكەم، شك نابەم كەس لەسەر ئەرزی هەبێ، بەهەموو أحكامی شَرْعی راضيٍ بێ! ئەوەی موافقی مَیْل ومَشْرَبی بێ، لای چاكە، وەإلّا لا!. دیومە یەك شَخص دَعْوای بووە هاتیتە لای مەلا شَرعی بەدوایا چووە، ئەدی بابم برام ئێمە بەچی مُسُلمانین؟! دەستەكی شَرع بیبڕێ خوونی لێ نایێ! جارێكی دی شَرعی دۆڕاندیە أصلاً راضی نەبووە، شَرعی چی؟ ئەوە كوو وادەبی؟ دەچمە مَحْكَمە بە قانون دەیكەم بە تِجارەت! مەلا ئەوە قسە نیە ئەتۆ دەیكەی!!. لازمە إنسان تەماشای أحوالاتی نَفْسیّە بكات، إختیاری إنسان، قُدْرَتی! تأثیري قدرتي وعِلْمي وعَمَلي وسَعي دائمي گەیشتیتە دەرەجەێ، بە (شێخی أشْعری) و (إمامي باقلاني) و (إمامي رازي) و (إبنُ المُنیر) (عَمْرو) (زَیْد) إنكار ناكرێ!. دەزانم ئەگەر ئەوانە زیندی بان لە فكری خۆیان دەگەڕانەوە، أمّا مُقَلدەكان لەبەر جَهالەتی تَقلید دەست لە مُزَخْرَفاتی إعتقادی هەڵناگرن، وە لەناوی مُعْتَزِلی دەترسن، مقارنەی فعل لەگەڵ قُدْرَتْ كە نەبێتە أثَري، چ قیمەتێكی هەیە؟ وە چ إمتیازێكی پێ دەدا؟. (مَوْلانا خالد) بۆ ئەو إمتیازە رِسالەكی داناوە، أمّاناً مُمْتازە! ﴿وَلَتُسْأَلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ یاربی ئەوانەی سَلْبی قُدْرَەت وإخْتیارو سَعي وكۆششیان كرد لە مُسُلمانان تا بێ هێز بوون لە قووەتی توو مَحروم كران بوونە زەلیلی دەستی أجانِبْ، دەبێ سۆال وجوابیان چۆن بێ؟ إلاهی وَسَیّدی بە مَحْضي خَلْقي تۆ، مُجَرّدی إرادەی كبریائی، بە عادەتی إلاهی، عالەمیان تۆقاند! ناوێرن مُقابِلی خَلْق وإرادە وقُدرەتی توو، ڕاوەستێ!! سست دەبن دەستەپاچە دەكەونە گۆڕێ، تا دوشمن بەسەریاندادێ، وەك كەر إسْتخدامیان

دەكا. ﴿وَلاَ تَتَّخذُوا أَيْمَانَكُمْ دَخَلاً بَيْنَكُمْ﴾ دەيكەن، بەلاّم نەيكەن چاكە! وەإلاّ ﴿فَتَزِلَّ قَدَمٌ بَعْدَ ثُبُوتِهَا﴾ لاقتان دەزەلىّ لە پاش ثُبوت ورسُوخ، لەگەلّ حَريفى خۆتان، حَليفى نويّتان چەپەلّۆكەكى لەوان دەدا، دوايىّ ئيّوەش دەهاويّتە سەر خاكى مَذَلّة، تەپلّە قووچانيّتان پىّ دەكەن! مُسُلمانان پاش قووەت وشَوْكَة زۆريان واكرد، لەبەر إختلافى خۆيان تَفرَقەيان دەكرد، لاىّ دەبووە حَليفى قَومىّ تر، آخري هەردوولا دەفۆتان. لە زَوالى شَوْكەتى (أَنْدَلس) تائيّستا بەو جوورە لەگەلّ يەك سلوكيان كرد. إلاهى وەختە شيّت بم! ئەو أُمّتە بە كُلّى، ئەو قُرآنە، دەلىّ ى نەيانبيستوە!! ﴿وَتَذُوقُوا السُّوءَ﴾ چەند جار تالاّوى مەرگيان چيّشت، عاريان نەنا، ﴿بِمَا صَدَدْتُمْ عَنْ سَبِيلِ اللّه﴾ إيمان وأُخُوَّة ووَفا نگەدارى سويّند ساعى بىّ غَلّ وغَشى. ﴿وَلَكُمْ﴾ في الآخرَة ﴿عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ عَذابي خوا، بەلىّ عَظيمە كافيە! ﴿وَلاَ تَشْتَرُوا بِعَهْدِ اللّه ثَمَنًا قَليلاً﴾ أكثَر لەبەر طَماعي دونيا حُبّي رِئاسەت گۆييا جەنابى مُستَطاب ببيّتە حُكمدار، عَهد وميثاق وأُخُوة قَطع دەكەن بۆ حطامي دونيا. هەرچەند بىّ كەمە ﴿إِنَّمَا عِنْدَ اللّه﴾ لە دونياو آخرەت. ﴿هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ بە إتّفاق وعزَّة إمرارى حَياة چەند خۆشە! إخْتلافىّ سەر بكيّشيّتە إنْقراض چ مُصيبَتە؟! چەند بەدە؟! چەند خراپە؟! ﴿إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ لكنْ جَهالَة غالبە. ﴿مَا عِنْدَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِنْدَ اللّه بَاقٍ﴾ ئەوەى لاى ئيّوە خيانەتى بۆ دەكەن، خَلاص دەبىّ دەبرِىّ، ئەوەى لاى خوايە لە دونيا ئەگەر بەريّك وپيّكى إدارە بكەن دەوامى دەبىّ! بۆ أخْلافُ وأعْقاب دەوام دەكا زياد دەبىّ لە آخرەت ديارە، ئەوەى سلوكى سَبيلى خوا بكا نائلى سعادەتى أبَدى دەبىّ ئەوەى نە كەم دەبىّ نە دەبرِىّ. ﴿وَلَنَجْزِيَنَّ﴾ ئيّمە ﴿الَّذِينَ صَبَرُوا﴾ لەسەر عَهْدى مُكافحەى عَدو، نَصْرَەتى حەق، لە وەقتى شَدائد ثابِت قدم بن، عَزم وجَزميان لا يَتَغَيّرْ بىّ. ﴿أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ بۆ حُصولى عَمَلى چاكى عمومى. وەدواى مُوَفّق بوون، جَزاى فِعْلى حَسَنيش، بە جَزاى أحسنى دەدريّتەوە. ديارە كەس تَوَهُّم ناكا فِعْلى حَسَنيان پاداشى نەبىّ!. بَعْضىّ لە عُلماى شَرع دەفەرموون: (رۆژى شەشەكانى، خيّرى واجِبى

دەگاتێ، وەك صَوْمی رَمَضاني وەإلاّ حِسابی سالێ بە تەواوی، تەواو نابێ!).
لام وایە نَظَر بە گەلێ أمری خصوصی یا شَأْنی لە شۆونی عامّە، إنسان فَرقی حَسَن وأحْسَن دەکا سُبحانَ الله لە بَحْثی حُسْن وقُبْحی عَمَلْ مەلایانی ئێمە کوو لێیان دەگۆڕێ! تەماشا بَعْضێ أحْسَن دەکەنە (نَفل)، حَسْن (واجِب)، کە جَزای (نَفل) بوو، جَزای واجب بَطَریقِ أولی، دەبێ! حَقاً ئەو قسە وەك (سَیّدي آلوسي) دەفەرموێ: (لَیْسَ بِحَسَنٍ أصلاً!!). ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا﴾ بەهەر کەسێ ببێ، هەر کەسێ بێ ﴿مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ﴾ لە نێر، لە مێ (فرق)ی نیە، قسە لەکاری چاکە ﴿وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ بە (إیمانێ) (کامل) (لِوَجه الله) ئیش بکا ﴿فَلَنُحْيِيَنَّهُ﴾ ئەو (مَن)ە، چ (مذکر) چ (مؤنث). داخی دەروونە (مسئلە)ی (تذکیر) و (تأنیث)، بە (ضمیر) بە (مَنْ) و (ما) بە (تَفَنّن)ی (عدید)ە. (لسان)ی (عَرَبی) هەرچەند (وسعەت)ی هەیە، (أمّا) (لسان)ی (عمل) نەی، ئەگەر (حدیثْ) و (قورآن) نەبا، تائێستا (مَحو) ئەبۆوە. ﴿حَيَاةً طَيِّبَةً﴾ ئەگەر بزانین ئەو (حیات)ە چیە؟ ئەزانین لە (دنیا)یە، یا لە (قیامەت). لە (دنیا) (حیات)ی (طیّب)و خۆش (تصوّر) ئەکرێ، بەو (وَجهی) کە (قورآن) إشارەی بۆ ئەکا. (قوم)ێ نێرو مێیان، (مشغول)بن بە (أخلاقی) (حسن)ە، بۆ (إدارە)یی (دنیا) (سعی) کەن (کَسابەت)، (تجارەت)، (زراعەت)، (صناعەت) بە (قانونی) (عادلان)ە بەجێ بێنن، (عمل)ی (فرد)ی (أهل)ی (منزل) (أهل)ی (مدینە) (خصوصی) و (عمومی) (مُوافِق) بێ وە (إیمان) یان هەبێ ڕۆژێ دێ (إنسان) بە (جزا)ی چاکەی خۆی بگا. ئەمەش بە (إیمان) بە (خواو) بە (رسول) ئەبێ. (بعث) و (جزا) لە (أموری) (سمعیە)یە، بەڕاستی لە (رسول)ێ بە (حق) نەبێ نازاندرێ. ئەو (قوم)ە (فرد)ی و (جمع)ی (حیات)ێ خۆش ڕائەبوێرن. ئەگەر (طبابەت)ێ باشیان هەبێ، نەساغیشیان کەم ئەبێ، ئەوانە یەکدی ناکوژن، ئاگر لە پاوان و خانوو وخەرمان بەرنادەن، دزی وڕێ گری ناکەن، (عطالەت) نیە، (فقیری) نا، (سؤال) (یۆك)، (دەرویش وصوفی) (خێر)، (فقیّ)ی زۆر و بۆر (لا)، قەحپەخانە، (سهرەیی) شراب خانە (رقص) وسەماوو (دانس) وچاوەشی

وگەوّادی ودەویتی ودووزیانی، و(تکبّر) و (عناد) و (إستحقار) هەر نا. (حاصل)ی ئەوی (مُخلّ)ی (إنسان)یش بێ یانیە، یا لە سایەی (حکومەت)یکی (موسڵمان)ی (عادل) کەمە. ئەو (حیات)ە (فردی) و (إجتماعی) ئەوەندە پاکە، خۆشە، کە (حیات)ی جاویدانی بەسایەی ئەو (حیات)ە تەواو خوش ئەبێ ﴿وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ لە (آخرەت) ئەو (قوم)ە (قبل کل شیءٍ) ئاگایان لە خۆ بێ (رؤسا)ی (دین) (عقل) و (وجدان)یان نەگۆڕن، (تفرق)ەیان نەهاوینە (بین)، بە ناوی (إیمان) و (دین) وەریان نەگێڕن ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ﴾ (قرائەت)ی بە (تبلیغی) بۆ خۆت بەو (نوع)ە کە خوا بۆت ئەنێرێ ﴿فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ (أهمیەت)ی مەدەرێ، ڕێ ی (وەسوەسە)ی بە (خاطر) مەدە، (حقیقة) (شیطان) بزرە (قیمەت)ی نیە، (شیطان)ی ئاشکرایی بە (تدلیس) و (تلبیس) جای (أهمیەت)ە ﴿إِنَّهُ﴾ (شأن) یا (شیطان) ﴿لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ﴾ (تَسلّط) و (قدرەت) و (قوەت) و (جبر) و تۆبزی نیە ﴿عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ (إعتماد)یان لەسەر خوایە، تەماشای (أفعال) و (أقوال)ی ئەکەن، بە (علم) و (عمل) نیزیکی ئەبنەوە، نەك بە تەنبەڵی وبێ (عملی) وەل پانی وورگ ئەستووری ﴿إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُ﴾ ئەیکەنە گەورە (جبّار) (مُتسلّط) لەسەر خۆیان، بە(أوهام) و (خیال) ئەوی زۆر بە (قوّەت) وە خۆیان بێ هێز ئەکەن ﴿وَهُمْ بِهِ مُشْرِكُونَ﴾ (أنّه) کردیتتانە (شەریك)ی خوای لە (علم) و لە (قُدرەت). کەسێ بتوانێ لە (آن)ێ (وسوسە) باوێتە دڵی (ملیار)ێ (بَشَر) بە (طُرفە)یی (مَشرق) و (مَغرب) (طَیْ) کا، لەناو جێ، نە لەسەرو (منبر) لیت (غافل) نەبێ ئەدی ئەوە (شریك)ی خوای نیە، چیە؟!

(وَهم) و (خَیال) زۆری بۆ هەیە، ئەڵێن: (شخصی) لە چیا پڵنگێکی دووچار بوو، نەیزانیە پڵنگە، لێ ی نەترسایە، عەمبازی بۆ بردیە، پیاوەکە دەستی لە قورقوڕاگەی نایە خنکاندیتی، بەو (هەیئەت)ە هەردوو دەستی پڵنگ لەسەر شان، بردیتیەوە، بۆ ماڵی، خەڵکی تووشی ئەبن، ئەترسن ئەڵێن: "ماڵ خراپ

ئەوە نازانی ئەوە پڵنگە؟ خانە خشتوور!" بەسەزمانە ترسی لێ (غالب) ئەبێ ئەلەرزێ، ئەکەوێتە ئەرزو ئەمرێ!

بەڵێ ئەوە ڕاستە، ئەوهاوو باوو بوویەی (صوفی)یانی (نقشی) هەمووی ترسی (خیاڵی)یە، چاو ئەچووقێنن، قجج وبجج دەهیننە بەر (خیاڵ)ی خۆیان، (أشکالی) (مهیب) و (عجائب) و (غرائب) دێتە بەر (وَهم)یان ئەتۆقن، ئەهاڕێنن وائەزانن ئەو (حالەت)ە (إلاهی)یە خۆزی (ملا)یان شتێکیان لە (أحوالی) (نفس) خویندبا تا نەخەڵەتابان.

لێرە (حضرەتی) (کبریائی) ئەو (آیەت)ە ئەفەرمو لە (سورەی) (إبراهیم) (ماجَری)ی (آخرەت)ی (نقل) فەرموو، ئیتر گوێ مەدەرە (أوهام) و (خیالاتی) (غزالی) و (أمثالی) (غزالی)، بە (ڕوایات) بڕوا مەکە ((شیطان) بچێتە (بین)ی دوولێوی (رسول الله)ی لە (وقت)ی (قرائەت)ی قورآن، (بعض)ی (جملە) بهاوێتە ئەو مەیانە، پێغەمبەر ئاگای لێ نەبێ، ئەوانیدی (حاضرون) گوی یان لێ بێ، وابزانن ئەوەش لە قورآنە!

خوا ئەزانێ (شیطان) ئەو (إقتدارەی) نیە، ئەو (جسارەت)ە ناکا. (إصلاح)ی (نفس)کە، کە (قورآن) ئەخوێنی لەو (شیطان)آنە خۆت بپارێزە (عقل) و (وجدان) و (إیمان) بە (تقلید) مەگۆڕە، (تقلید)ی (محض) لە هەزار هەزار (کید)ی (شیطان) خراپترە، بە (تقلید) ئەتوانن (إنسان) بکەنە (مَسخ)ە ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَكَانَ آيَةٍ﴾ دەیکەنە موجبی طَعن. ئەو تبدیلە لە طَرَف خوایە ﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ﴾ ئەو تبدیلە لە غَفلەت نیە. ﴿قَالُوا﴾ کَفرَە. مُمکنە ئەگەر مُشرکەکان وابڵێن لە إلقاآتی أحباری یَهودی بێ. ﴿إِنَّمَا أَنْتَ مُفْتَرٍ﴾ إفترا دەکەی قسە هەڵدەبەستی دەڵێی: (ئی خوایە، کَلمەی خوای تَبَدّلی نابێ!) ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ کەسێ أهلی علم بێ تەماشای کائنات کا حُکم بە نَسخ، بەڵکو بە وجودی نَسخ دەکا. خاصَّةً کەسێ إیمانی هەبێ خالقی طَبیعەت واضِعی شَریعەت یەکە، مَجْبوراً دەڵێ: مادام نَسخ لە عالەمی کَون دا هەبێ، دەبێ لە عالەمی شَرعیش دا ببێ! إنسان لە دەوری منداڵی تا دەگاتە کَمال،

چەند أطواری دەگۆڕێ! أحكاميشی بەو گوێرەیە دەگۆڕێ! ئەگەر بە گوێرەی حَرَكاتی مندالّی بكا زۆر ناشيرینە لۆمەی دەكرێ! فُصُول تَبَدُّل دەكا، حُكم چۆن تَبَدُّل ناكا؟ إقليم مُخْتَلِفن، أحكامی هەموان چۆن وەك يەك دەبێ؟ أوائلی تَعليم وأواسطي وأواخِري چۆن وەك يەك دەبن؟ زستانی (كۆێ) و (مصری) فَرقيان زۆرە! هەر حُكمێ نَسخ بكرێ، طَبعاً مَنسوخ دەبێ! ئەوجا شَرعاً نَسخ دێتە سەر أوامری زەمانی ضعف وأوائِلي نَشْأة، نايەتە سەر أوامری أيّامی قووەت و أواسِطي شَوْكَت وسَطوەت! شەڕ بە گورز وكەمەند ورمب وشێر وتیر، مُقابِلی أسلحەی ناريّەی عصريّە، چۆن نَسخ نابێتەوە، نسخ ناكرێتەوە؟ وەإلاّ قَومەكە خۆی مَنسوخ دەبێ لە كِتابی وجود مەحوو نابووت دەبێ!! وە نَسْخ ومُتَشابِهاتی كِتابی قَوْلی، تابِعی نَسْخ ومُتَشابِهاتی كِتابی فِعليە! نەزانينی وَثَنيان بەرجا، نا بەجا نەزانينی أهلی كِتابە! تا شَمس بلّند تر بێ سێبەر كورت دەبێ، نابێ! چ دەكا؟ چارەی چيە؟ حاصِلی جَهلُ وتَعَصُّب باعِثە بۆ إنكاری نَسخ. ﴿قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ﴾ ڕوحێ پاك لە ئالايشی مادّی، لە ميولی فاسدی قَومی وتَعُصُّبی. ﴿مِنْ رَبِّكَ﴾ زاتی أقْدَس. ﴿بِالْحَقِّ﴾ بە حُكمُ وحِكَمْ. ﴿لِيُثَبِّتَ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ بە سايەی إيمان، دەغدەغە بە خاطر نەدەن، قابلی قُدسيّەتن. ﴿وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ﴾ مُنْقادن، مَعَ العِلْمِ بالْحِكَمْ. دەزانن لەو أحكامە گەورانە ئەوان تَرقّی دەكەن، ڕوو لە أوْجی تعالين، وإلاّ لە يەك قَرار دەمان، بەو نَوْعە تَبَدُّل نەدەبوو، كأنَّهُ إسْتدلال دەكەن بە أثَر لەسەر مُؤَثِّرْ. ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ﴾ ساداتي قَوْمي قُرَيشي بَليغي فَصيح ﴿إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ﴾ كێيە ئەو بَشَرە، كە أستاذي ئەو زاتەبێ كە صاحِبی قُرآنە، لەوی وەردەگرێ، بەناوی خۆی إظهاری دەكا؟ باسەرامدەكانيان كەسێ تر بدۆزنەوە شتێكی وای لێ وەرگرنێ ئەوا لَفظی وەرگرن، صَبر وثَبات وإقْدام ومُقابَلەی أنامی لە كێ ستاند؟ تَسْفيهی أحكام وأحلام وقَوانينی دول وكُتُبی مَنْسوبی إلى الرُسُلي چۆن درابێ؟ ﴿لِسَانُ الَّذِي﴾ زوبانی ئەوەی ﴿يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ﴾ نِسبەتی بەلادەدەن، نِسبەتێ نارەوا! گۆييا مُعَلّمي وييە ﴿أَعْجَمِيٌّ﴾ خَفي، بێ بَيان

وبَلاغەت ولَطافەت ونَزاکەت. مُراد لە أعْجَمي، غَیْرە عَرَبي نیە! ئەوی گرفت ولەنگی لەلِسان دابێ، پێی دەڵێن أعْجَمْ! أعْجَمی عَرَب دەبێ، وەك زیاد باعَجَمی! ﴿وَهَذَا﴾ قرآن. ﴿لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ﴾ خۆتان دەیزانن تێ دەگەن، جەنابی رِسالەت پەناە دەناسن، ئەو شَخْصەس دەزانن چیە وەچۆنە! مَقصَد إیمان نەهێنانە، ئەوەلولکەی زوبانە! ﴿إِنَّ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ﴾ (آیات)ی قورآنی (ذاتاً) پڕە لە (آیات)ی (أکوان)ی (أنُه) (میل)ی ناکەن بە (نَفرەت)ن ﴿لاَ يَهْدِيهِمُ اللَّهُ﴾ (جبراً) (هدایەت)یان نادا، (إیمان)یان لە دڵ (خلق) ناکا ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ لە (دنیا) و (آخرەت)، لە (دنیا) بە (غلَبە)ی (رسول)، لە (آخرەت) بە (ئاگری (جهنّم) ﴿إِنَّمَا يَفْتَرِي الْكَذِبَ﴾ درۆ هەڵدەبەستێ، (آیەت) (تبدیل) ئەکا (مِنْ عِنْدِه) ئەڵێ: ئەوە لە خوایەوەیە!" واش نیە ﴿الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ﴾ (قرآن) و (سائر)ی (کُتب)ی (إلاهی) ﴿وَأُوْلَئِكَ﴾ ئەوانە کە ﴿هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾ درۆ (حَصر)ە لەوان، درۆی خەڵکی بە (نظر) درۆی وانە هیچ نیە؛ ئەوانە ﴿مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ﴾ وەك (أحبار)ی (یهود) ئەوانەی (ئایات)ی خوایان بە (ثمن)ێ کەم ئەفرۆشت، بۆ (رواج)ی (آمال)ی خۆیان، هەزار (إفترا)یان ئەکرد، خوا وائەڵێ، ئەمە (مُراد)یەتی، لە (لوح)دیم، (وحی)م بۆهات. هەم وەك (بهائی) و (قادی)یانی ئێمە، پاش شارەزایی لە (دین) و (إیمان) و ئاگاداری، (هوا)یان گۆڕی، بە (فکر)ی (سیاسی) و (تَرأس) (إفتراء) ئەکەن، ئەڵێن: "(رسول)ین، خوامان دیت، وای فەرموو، (أُلفەت) و (صُحبەت)ی لەگەڵ کردین" ئەو (إفترائات)ە لە (دین)ی ئێمە، بەسایەی (تصوف) وناوی (ولایەت) زۆر بوو. وەگەڵێ لە مەلایان بە ڕاستیان (تَلَقّی) کرد، بوون بە (مؤیّد)یان ﴿إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ﴾ (مجبوری)یەتێکی هەیە، بۆ ئەو (نوع)ە (کُفر)ە، (ظاهراً) لە گەڵیانە، أمّا (باطناً) وەك وان نیە ﴿وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ﴾ بە خوا، ناتوانێ لەبەر (إیمان) بە (علم) و (قدرەت)ی خوا (إفتراء) بکا، (کفر)ی ئەوانە (دائر) بە (لِسان)ە، (قابل)ی (زوال)ە بە ئاسانی ﴿وَلَكِنْ مَنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا﴾ سینگی پی (واسع) و (فراح) ئەبێ، دڵ خۆش، شادان

بە (كُفر)، (كيف)ى پێ دێ، وە (تَبسّط) ئەكا لە (إفتراء) بە گوێرەى (بَسط)ى سينگ ودڵى.

(رسول)ى (مُجتبا) (داخل)ى هيچ (دين)ى نەبوە، لە (أديان)ى (مُحَرّفە)ى (مُزخرفە)، تا فێرى درۆو دەلەسەيێ، (حَسبَ آلْ) خواهش (آيات) بگۆڕێ، (نَظم)ى (آيەت) ئەوها ئەگەيەنێ، (مُفسّرين) (غايەت) (مُضطرب)ن، لە (كيفيەت)ى (إكراه) لێرە، (خاصةً) لەبەر (سبب)ى (نزول) (بعض)ى (ضعفا)ى (مُسُلمانان) يان (عذاب) ئەدان، تا، بگەڕێنەوە، چەند كەسێ (صبر)يان كرد، بەزاريش (كلمە)ى (كُفر)يان ئەگوت، كەمێ بەزار گوتيان، بە دڵ (مؤمن) بوون ترسان لە خۆيان كە (مُعاقَب) بن، ئەو ئايەتە (نازِل) بوو، (ممكن)ە لەو (وەقت)ە (جناب)ى (رسالەت) بەو (آيەتە) (تلطيف)ى فەرموو بن. وايان زانى بە (سبب)ى (نزول)ى (سيد رشيد) ڕەحمەتي خواى لێ بى، زۆر بووە ﴿فَعَلَيْهِمْ﴾ لەسەر ئەو (مُنشَرِحُ الصدران)ەى بە (كُفر) ﴿غَضَبٌ مِنْ اللَّهِ﴾ (نعوذُ بالله من غضبه وعقابه) ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ بە گوێرەى (عظمەت)ى گوناهيان ﴿ذَلِكَ﴾ (إرتداد)ى (هكذا)يى، زۆر دوور نيە، لەو (مؤمنان)ە ﴿بِأَنَّهُمْ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الآخِرَةِ﴾ (ترجيح)يان داوە، (إختيار)يان كرديە، وەك شێخەكانى ئيمەو (مجتهدين)ى (رافض)يان، (حقاً) ئەو (نوع)ە حُبٌّ)ە، (دين)نايەڵێ ﴿وَأَنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ (غريق)ى فى (الكفر) (رئيس)ى (دين) هەركەس بەگوێرەى (مسلك)ى خۆى خوا لەدواى ئەدا ﴿أُولَئِكَ﴾ ئەوانەى غريقى (فى الكفر)ن ﴿الَّذِينَ طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ﴾ هەرچەندى دڵيان بە (كفر) (واسع)ە ئەوەندەش پڕە لە (كفر) و (ضلال) جێى چيترى تيا نابێتەوە ﴿وَسَمْعِهِمْ﴾ بو لاى (حق) كەڕن ﴿وَأَبْصَارِهِمْ﴾ نابينن، (حُب)ى (دنيا) كوێرى كردينە ﴿وَأُولَئِكَ هُمْ الْغَافِلُونَ﴾ (أدنى) (تنبه)يان نابێ، بەخۆنايەنەوە ﴿لاَ جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي الآخِرَةِ هُمْ الْخَاسِرُونَ﴾ (بشر)ى وان كە خۆيان لە (دنيا) بڕواو (دين)يان دا بە (دُنيا)، (دنيا) (خلاص)، لە (آخرەت) (محروم) و بێ بەش وتێ شكاون ﴿ثُمَّ﴾ (إشارە)يە بۆ (بُعد)ى (بين الفريقين) باشە ﴿إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا﴾ لە

ڕێی دین (ترك)ی (لذەت) و (وطن) و (حرمەت)یان کرد ﴿مِنْ بَعْدِ مَا فُتِنُوا﴾ (عذاب) دران، وەك زێڕ تاواندرانەوە بە ئاگر ﴿ثُمَّ﴾ پاش ئەو (ألم) و (ذل) و (فقر)ە ﴿جَاهَدُوا﴾ (سعی) و کۆششیان کرد، بۆ (مدافعە)ی لەسەر (حق) ﴿وَصَبَرُوا﴾ لەسەر (مُقابلە) و (مُقاتلە) ﴿إِنَّ رَبَّكَ مِنْ بَعْدِهَا﴾ لە پاش ئەو حاڵە بڵێین: چی؟ (أجر)یان (تقدیر) ئەکرێ؟ ئەوەندەیە، بە ڕاستی (رَبّ)ی توو ﴿لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ چ ڕۆژی؟ ﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ﴾ دێ ڕۆژی (کُلّ)ی کەس ﴿تُجَادِلُ عَنْ نَفْسِهَا﴾ خەریکی (نجات)ی خۆیەتی، ئاگای لە خەڵکی نیە، ئاگایان لە (وعظ)ی (کعب الأحبار)یش نیە. ئەو (مُجادلە) (مُجادلە)ی (روح)و (بدەن) نیە ﴿وَتُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا عَمِلَتْ﴾ نەخەڵکی، هەڵناگیری، ئەوی خۆتە ئەو بەکارە، ئی خەڵکی چ نیە، (مُستعارە). وەبو (نفوس)ی (أبیە) (مُوجب)ی (عار)ە ﴿وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ خۆیان (ظلم)یان لە خۆ کرد بە (تقصیر) لەوڕوژە خوا لە (حق) و ئەو (مهاجر)انە، (غفور) و (ڕحیم)ە خۆی ئەزانی بە چی؟ چەندە؟ چۆنە؟ (کَمّی) و (کیفی) ﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً قَرْيَةً﴾ أيَّةَ قَريةٍ كانَتْ. وأغلَبي قُراي رُسُلي سابقە وابووینە. ئەو قَریەیە ﴿كَانَتْ آمِنَةً﴾ لە مُهاجَماتي غُزاة. ﴿مُطْمَئِنَّةً﴾ بێ إضطراب وشۆرەی داخلی، بە أمن وئاسایش. ﴿يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا﴾ واسِع. ﴿مِنْ كُلِّ مَكَانٍ﴾ بە تِجارەت بە زَراعەت، لە هەموو أطراف بۆی دەهات. لە تأریخی هەزارو سێصەدو چار (١٣٠٤هـ) (تَحسین پاشا) والی موصل هاتە (کۆیە) أعیان ووجَهای بَلْدە لە خزمەت بابم چووینە زیارەتی، ئەو وەقتی (هەمەوەند) ڕێگایان گرتبوو، بە شَقاوَت عاڵەمیان خستبوە إضْطراب، کەس نەیدەوێرا بۆ تِجارەت بچێتە دەر، ووتی: حَضَرات تدبیرێکی بکەن، لەو وڵاتە تەرەقی تِجارەت بەچی دەبێ؟ بابم فەرمووی: تەرەقی تِجارەت بە أمنیەتی ڕێگایان دەبێ، ئەگەر أمنەیت بوو، بە طبیعەتی خۆی تجارەت ترقی دەکا! یەك دوو دەفعەی دی عَیْنی سؤالی کردەوە، بابم عَیْنی جَوابی داوە. ووتی: ئەوە حکومەت، خۆ إیْران عائدی وییە! بابم فەرمووی: بۆ وێ نابێ! پاش عَوْدتی بۆ موصل فەرموبووی: (حاجی مەلا عبدالله أفندی) زۆر مەلایە،

أمّا قسەی ڕەقە بۆ دونیاو دین. ئەمە نِعمەتە، أمن وئاسایش وسعەتی ڕزق، جا ئەگەر پیاوی تیابێ، علمیش تەرەقی دەکا. خُلاصە حیاتی طَیِّبەیان بوو، أمن وئاسایشی دێهاتی ﴿فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ﴾ بە واسِطەی نِعمەتی إلاهی کافر بوون، تَجَبُّر وتَكَبُّریان کرد، دڵی خەڵکیان ڕەنجاند، شَقاوەت وفتنەبازیان دەست پێ کرد، تِجارەت وفَلاحەت تَدَنّی کرد، خەرمانیان سووتاند، ئەمەش عَیْنی کُفرانی نعمەتە! کەوتنە اضْطِراباتی داخِلی وخارجی ﴿فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ﴾ برسیایەتی وترسێ شامِلْ، سەراپای داگرتینە، بەهەموو أعْضا دەیچێژن، ئەمە ذَوقی زاری نیە، زاری ونە زاریە، بە وِجدان بە هەموو حَواس دَرکی دەکەن مُتألّمْ دەبن! ﴿بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ﴾ کُفر وکُفرانی نِعْمەت بووە باعِثی سیِّئاتی مُخِلْ بە أمن و ئاسایشی دیهاتی. ئەو سَیِّئاتەش بووە سَبَبی ئەو پێ چێژانە! ﴿وَلَقَدْ جَاءَهُمْ﴾ وەك أهلی مَکّە. ﴿رَسُولٌ مِنْهُمْ﴾ لە خۆیان، أعلی وأنْسَبیان. ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ لە رِسالەت ﴿فَأَخَذَهُمُ الْعَذَابُ﴾ عام. ﴿وَهُمْ ظَالِمُونَ﴾ لە حالێ إلتِباسیان بە ظُلم بوو، أنە لِباس بە لِباس. ﴿فَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا﴾ خِطاب عامّەبۆ أمَّتی دَعوەت وأیجابَتْ! ڕزقێ واسِع، بێ حَدّ وپایان، پاك و خاوێن. ﴿وَاشْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ﴾ شِرکی تیا پەیا مەکەن! نعمەتی خوا، لە ڕێی غَیْری، صَرْفی مەکەن! کُفرێ عَظیمە، کُفران ئەمەیە! ﴿إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ نَصیب هەر بۆ وی دابنێن! زاتاً مؤمن هەر عِبادەتی خوا دەکا! ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنْزِيرِ﴾ بەراز دەعبایێ سەیرە، بەسم وسەر لە مَقولەی ثَورە، بە شلفەو بێ ملی وکلك کورتی فیلە، بە گووان دەم باریکی أمّا لووت زۆر نابیە لە نَوعی سەگە! لووتی لەسەری لموزیە، دەڵێن دەم لە ناو ڕادەکا دەیخواتەوە.

﴿وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾ ئەمە، صَرْف دی نیە. لەو عالەمە واسعە ئەوەندەی لێ حَرام کردینە، بۆ چ إسْتفادە لە کائنات ناکەن؟ بۆ جێی حَسَن بەدەست ناخەن؟ ئەوە لە سعەت! ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ﴾ مَجبوور بوو بۆ حفظی، بۆی رُخْصَەتە شتێ لەوانەی چنگ کەوت بیخوا. ﴿غَيْرَ بَاغٍ﴾ تَعَدّا لە مُضْطَرّی دی

نەکا. ﴿وَلاَ عَادٍ﴾ تَجاوز لە قەدەری ضَرورەت نەکا. قاعدەیٚ أصولیە (الضَّرورَةُ تُقَدَّرُ بِقَدَرِها) بۆیە مەلایانی (شافعی) فتوایان بە وِلایەتی فاسِق داوە، وەإلاّ نَسل نامێنیٚ، عالەم دەبێتە وَلَد الحَرام!. باپیرم بەو قاعدە دەفەرمویٚ: کەوابیٚ فاسق حەقی إجْباری نیە، خصوص لەسەر کچکە، چونکی چ ضرورەت لە إنکْاحیا نیە، بەلْکو نە مُباحیە نە إستِحْسانیە!. ﴿فَإِنَّ اللّهَ﴾ سُبْحانَهُ. ﴿غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ مُؤاخَذە ناکا. حەق وایە شَرعی إختیاری وإجباری لێك جودا بن! کە أحوال گۆڕا، حُکُم کوو ناگۆڕیٚ؟! ﴿وَلاَ تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ﴾ (أنّهُ) فێری درووی بووە، سوپاس وستایشی درۆی ئەکا، ئارایشی ئەدا ﴿هَذَا حَلاَلٌ وَهَذَا حَرَامٌ﴾ بیٚ (وَجه) و مەعنایە (معقول) ﴿لِتَفْتَرُوا عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ﴾ لەبەر (تمرین)ی درۆ (جَرائەت) ئەکەن (إفترا)ی بە خوای هەلْ ئەبەستن، ئەمە بە (حُکُم)ی خوایە. ترسی مەلایان لە (فَتوی) لەبەر ئەو (ئایەت)ە بیٚ معنایە، ئەوانی (رَبط)ی (حُکم) بە (دلیل)ی (شرع)ی ئەدەن ئەگەر (إجتهاد)ی ئەفەرموون (ظن) نیە. بەلْیٚ (إعتناء) (لازم)ە (تطبیق)ی (قواعد) لە کیٚ؟ (وَصفُ الکَذب) لە کیٚ؟ ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ لاَ يُفْلِحُونَ﴾ (فائز) نابن، بەلیٚ (فائدە) کیان چەنگ ئەکەویٚ ﴿مَتَاعٌ قَلِيلٌ﴾ کەم، بیٚ تام ﴿وَلَهُمْ﴾ (في الآخرة) ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (حسّ)ی ئەکەن ﴿وَعَلَى الَّذِينَ هَادُوا﴾ (جوو) ﴿حَرَّمْنَا مَا قَصَصْنَا عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ﴾ لە (سورە)ی (أنعام) (بیان)ی فەرموو. (واقعاً) گەلەکی بی (وَجە)ە لە (حکمت)ی (إلهی) ناوەشێتەوە، دیارە (أثر)ی (تضییق)ە ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ﴾ بەو (تحریم)ە ﴿وَلَكِنْ كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ ئەوان (غلیظ) بوون، (حُکم)یان لەسەر (غلیظ) کرا، گەلیٚ (طیّبات)یان لیٚ (حرام) کرا ﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُوا السُّوءَ﴾ (حتّی) (إفترا)ی (عَلی الله) ﴿بِجَهَالَةٍ﴾ بە (عاقبەت)ی (غیرەت)ی (مَیل)ی (جاهل)ی (نەفام)ی ﴿ثُمَّ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ﴾ لەپاش ئەوەی کردیان، (تَوبە) بکەن ﴿وَأَصْلَحُوا﴾ (مُقابل)ی (فساد) و (إفتراء) بەدەرخەن، (إعتراف) بکەن ﴿إِنَّ رَبَّكَ مِنْ بَعْدِهَا﴾ (توبە)ی ئەوانە ﴿لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (غفور) و (رحیم)ی لەسیٚ (موقع)ان فەرمووە: لە

(أوّل)ی (مُقیّد) به (یَوم)، بیَ (شُبه)یه، (أثر)ی (غُفران) و (ڕەحمەت)ی (إلهی) به گوێرەی (مواقِع) (تفاوت)ی هەیه ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً﴾ (أبو الكُل) (حاو)ی (خیرات) (لا یُعَد بِملیون) چ جایه (آلاف)؟! ﴿قَانِتًا لِّلَّهِ﴾ (قائم)ی (بأمر الله)، (مطیع) (متواضِع) بی (تَکَبّر) و (أنانیەت) ﴿حَنِيفًا﴾ (مائل) له (باطل) ﴿وَلَمْ يَكُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ ئێوه ئەڵێن: ئێمه له (ذُریەت)ی ئەوین" ﴿شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ﴾ (مقصد)ی (مناسب) لێره ئەو (صفەت)یه، لەبەر ئەو (مَناقب)آنه ﴿اجْتَبَاهُ﴾ هەڵی بژاردو (إختیار)ی کرد ﴿وَهَدَاهُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ ڕێ‌ی ڕاستی بۆ دانا، (إرشاد)ی (عِباد) بکا، بۆ ڕێ‌ی بێ (مَیل) وخواروکه ﴿وَآتَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً﴾ (مَحبوب القلوب) گوزەرانی باش، (أولادی) چاك، ژنی پاك، ڕێك وخاتون، چی بڵێی...! ﴿وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ﴾ وەکی خۆی (دُعای) کرد. کەسێ به تەمای (إبراهیم) بێ، ئەبێ دوای کەوی، (إنتساب)ی بێ (مُتابَعه) خۆی نیه ﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ﴾ بێ (غَلّ) و(غَش)، (مُوَحّد) (متواضع) (هادی سبیل) ﴿حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ ئەگەر دوام نەکەون، به (قطع)ی له (إبراهیم) (محروم) ئەبن، دیاره خۆی له (أمّەت)ی (مُستقل) بوه، وه (مِلّەت)ی له هەمووماں (مُقدّم)ه، (أبو الكُل) (مَتبوعُ الجمیع) ﴿إِنَّمَا جُعِلَ السَّبْتُ عَلَى الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ﴾ (مفسّرین)ی (کرام) (علی العموم) (سَبت) به ڕۆژی شەممویان فەرمووه، و (ضمیر)ی (فیه)یان بۆ وی ناردیه، بۆ (وَجه)ی (تعدیه)ی (جُعِلَ) به (عَلی)، وه(توجیه) (إختلاف) له (سبت) (مُختلِف) و (مُضطرِب)ن، وەبۆ (نظم)ی (آیەت) (مُحتاج)ن به (جواب) و (سؤال)ێ نا (مَفهوم). ئەوەی (إمام) و (زمخشری) ئەی فەرموون، وه(سیّد)ی (آلوسی) (نقل)ی کردیه، هیچی ناچێته دەماغم، شەوو ڕۆژێ لێره ڕاوەستام، (مُراجَعه)ی (لُغەت)م کرد (معنا)ی (سبت) به (حیرەت)، (ثُمّ) (مَوت)، (مُناسب)ی ئێرەم دیت، وه(ضَمیر)ی (فیه) (راجع)ی (إبراهیم) بێ، یەعنی (حیرەت) و (ضلال) مردنی (مَعنوی) نەگێردراوه (إلا) لەسەر ئەوانەی (إختلاف)یان بوه، له (إبراهیم)، (فرقه)یه ئەڵێن: "(موسوی) بوه" فرقەیی:

"(عیسوی) بوە" ئەوانە ڕێ بە (هدایەت)ی (إبراهیم) نابەن، دەربارەی (إبراهیم) (مادّی)و (معنوی) گوم بووین لە ڕێ. (خلاف)ی (حق) و (حقیقەت) و (تأریخ) یان كردیە ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ﴾ (جلَّ جَلاله) ﴿لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ﴾ (أهل)ی (خلاف) ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ڕۆژی (جزاء) ﴿فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ ئێوەو خودا (إختلاف) لە (سبت) لە (جمعە) و (یەك شەمە) ئەوەندە قیمەتی هەیە؟ خوا لە ڕۆژی (قیامەت) بەو (نوع)ە (فصل)یان لە (بین)دا بكات! (مَعَ أَنَّهُ) بە هیچ (وَجْه)ێ (إختلافیان) لە (سبت) نەبوە، (واقعاً) (إختیار)ی (سبت) بو (تعطیل) (بِنا) بە (تأویل)ی (بنی إسرائیل) (كُفر)ە، وە(كذا) (إختیار)ی (یسوعیون) وادەرئەكەوێ لە قسەیان (بَدأ)ی (خلق) لەو ڕۆژە لە (طرف) (عیسی) بوە، كە خواو (عرش) و (روح الله) (یُرفرِف علی الماء) ئەم (روح)ە بە (عیسی) (تأویل) ئەكەن، وە(خلق)ی (ماعدی)ی ئەوانە بە (عیسی) (نسبەت) ئەدەن، (كفر)ێ (هائل)!

(تَورات) ئەڵێ:"خوا (أمر)ی كردنێ بە (تعظیم)ی شەموو، ئیش وكار نەكەن، هەتا شوان وگاوان دانیشن" ئەبێ ئەو ڕۆژە (حیوانات) یان چی كردبێ؟ وەسێ (شەموو)ی دیشیان هەیە، (أسابیعی) لە حەوت حەفتە، حەفتەیە، (شهُوری) لە حەفت مانگ مانگێ، (أعوام)ی لە حەفتا ساڵ، ساڵێ، باغ وزراعەتی دی (مُشترك) بێ، هەر كەسێ بیخوا، (إدخّار) نەكەن. (صاحب)یان ئەوانەیان نەكرد، بەس شەموویان گرت. (أمّا) ئیستا لە ولاتی (منوّران)ە كەمیان (رعایەت)ی ئەكەن، لە ولاتی ئێمە ماوە. لێرەش ئەوا دەستیان كردیە بە ڕیش تراشین. (أهل)ی (سیاسەت) ئەگەر بۆیان ڕیك كەوی، (إیجاب) ئەكا، ئەو (قیود)انە بشكێنن، وە(كذا) (وهابی) ئەبی (قیود)ی (بِدعەت) و (سُنّەت) هەلگرن لە (إدراه)ی (مُلك) و (سیاسەت).

بابۆ (عبادەت) بە (شرط)ێ بێ، (تَعصّب) لەجێی خۆی بێ ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ﴾ (دین)ی (إسلام) ڕێی ڕاستی (هدایەت) ﴿بِالْحِكْمَةِ﴾ بە أموری ثابتة موافِقي حەق وحقیقەت بە تَمویهْ وتَلْبیس وتَدْلیس وقَلْبی حقایق مەكە، وەكی

جوان بۆ تَرغیب دەڵێن: (إبراهیم لەسەر دینی موسی بووە). أحوالی کائنات عَلی ماهُوَ عَلَیْه بۆیان ذکر بکا بە وَجهێك دَلالەتی موافقی فَوقی دەلیل بۆ مُدعی بوویێ. ﴿وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ﴾ فائدەی هەبێ ثَمَرەی باش بێ، عِبَرەکان واقع بن، تَمثیلي مُطابِق بێ، بە عباراتێ جووان وشیرن سَهْلُ التَّناول بێ. دقەت کەن نقالان مَشغول دەبن بەباسی مَلائکەتێ دەڵێن: (ماشاءَ الله زەلامە! چەند هەزار سەری هەیە، هەر سەرە چەند هەزار ڕووی هەیە، هەر ڕوویە چەند هەزار زاری هەیە، هەر زارە چەند هەزار زوبانی تیایە بە هەر زوبانێ چەند لُغَةْ دەزانێ، بەو لُغاتانە، ثَنای خوای دەکا!!).

ئەم باس و خواسە لە قُرآن دا نیە! أمّا ژنێ حَتّا میرووێ قسەکی عاقلانەی حِکْمَةْ ئامێزی بە نَفع بۆ أُمَّتی کردبێ، جەنابی حەق بۆ رەسولی خۆی، وَحْیاً دەینێرێ! لە کِتابی مُقَدَّس دەرج دەکرێ! ئا ئاوا بە ملیون درۆیان دەکەن بۆ تَرغیبی قَلْبی حَقائِق وە آیاتی قُرآنی نَقل دەکەن بۆ مواقعی عَقیدەو فکری خۆیان، قسە دەهاوێن تێ نافکرن زەرەری بۆ أُمَّةْ چیە؟ لەگەڵ قواعدی إسلام چۆن موافقە دەکا؟! بەهەزاران رَمَضان رۆیی وَعْظ کە عادەت بوو لە رَمضانان بخوێندرێ بۆ موسڵمانان هەر عبارەت بوو لە حکایاتی (سَهل بن عَبْدالله) وحوشتری و (رابعەی عَدَوي)، مِنْ أوّلە إلی آخرە، کَراماتی بێ هودە، أشعاری غَرامی باسي لَوْح وقَلَم ومَساحەی جَحیم وجَنَّةْ، لە هەموو آیات وعِبَرْ غافل بوون!!.

لە واعِظان بە ڕاستی دوو واعِظم دیت بە حەق وَصْفی ئەوەی بکەن بەکەڵکی أُمّةْ بشێ، بە مناسباتێ زۆر جوان بۆیان بیان بکەن، یەکێ (نعْمان الأعْظَمي) لە (بَغْدا) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دووەم دوعا گۆتان لە (کۆیە). أمّا وَعْظی ئێرە بە هَدَرْ چوو دەماغێ نەبوو قسەکان بگرێ، ئەگەر لە گوێێ چووبا زۆر لە گوێی دی دەچووە دەر!! ﴿وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ ئەو مُعاندانە، ئەو مُناظرانە، قسەیان لەگەڵ بهۆننەوە بە وَجهی طَریقي أحْسَن، بی إستهْزاء، بێ عَلامەتی إسْتِحقار وعیبارەتی ناشیرن! ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ﴾ خوا

أحوالاتی نَفْسیّەی عِبادی خۆی مُؤْمِن وكافِرْ دەزانێ، دەبێ تووش بەو نَهْجە دَعْوەت بكەی! لە وەقتی دَعوەت غایَةْ حِلَم ورِفق ونَزاكەت بنوێنە! بَعْضە كەس بە لۆمە، بَعضێ بە ثَنا ومَدح دێنە ڕێ! ئەوەی گومراە بووە، بە چ تَأْثُرو مەیلێ لایداوە. مەیلی ژنی بووە؟ یان حالێ و مالە؟ قابلی زوالە!! بە بُرهان تێ دەگا، یا بە إقناعیات دەگیرێ، یا بە عَطا مەیل دەكا ﴿وَهُوَ أَعْلَمُ بِالمُعْتَدِينَ﴾ بە چی هاتینە هدایەت، وەدێنە ڕێی ڕاست؟ بە أفكاری حَسَن، یان كەمێ ضَئْعیان هەیە، سِقْلي پێ دەوێ! یادەها إعتنا لازمە!. حاصِلی رَسولی صاحِبْ دَعوەت، مەلای ناصِح، مرشِدی ناصِحی بێ درۆ و دەلەسە، دەبێ مِزاج بناسێ! حَتّا ئەوانەی وَضْعی قانون دەكەن، دەبێ وابن، مُطَّلعی أحوالاتی روحیّەی قَوم بن، لە أهلی تَجربە بن! (گوستاف لوبون) گەلێ لَوْمی (رئیس ولسن) دەكا: كە بَعْضێ أساتذەی جامعاتی هێنایە بنودی مُعاهَدەی صُلحی پێ تَحریر كردینە، دەلێ: أساتِذەی سەر كاغەز كەلَّك ناگرێ! إنسانی تَجربە دیدە ئاگاداری أحوالی روحیّەی بَشَرە، خاصَّةً ئی مُسُلّمانان، بزانێ دەرەجەی قووەتی إیمانیان چەندە، ولو بە ظاهِری مَغلوب بووین، ئایا مَعنویاتیان قووەتی چیە؟ حَقاً أساسی إسلامەتی بە أفكاری ئەو نَوعە كەسانە تێك چوو، بێ خَبَر لە هەموو شت، حُكم لەسەر هەموو شت دەكا بەنەبوو! بە نووكی قَلَمْ ئەو عالەمە عَظیمە بە آنێ دەباتە عَدَمْ، مِثلی دێنێتە وجُود!. بَعْضێ سَلبی قووەت لە كائنات دەكەن، مُناسَبە لە بینی مَوجودات نایَلَن، حَواسیان عَقلیان دەگۆڕن! جا أُمَّةْ لەوانە بە غَیْری خەسارەت مەندی چ قازانجیان لێ ناكا!.

ئەگەر لە مَیانی مُناظَرە وگفتوگۆ ڕەنجە خاطریان كردن، ئێوە مُقابَلە مەكەن! ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ﴾ مەیلتان كرد جَزایان بدەن ﴿فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ﴾ تَجاوز مەكەن لە مُقابَلە.﴿وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ﴾ لەو مَقامە. ﴿لَهُوَ﴾ صَبْر. ﴿خَيْرٌ﴾ چاكترە لە مُقابَلەی ناشیرین ﴿لِلصَّابِرِينَ﴾ بە وَەجهێ حَسَن دەتوانن مُدافعەیان بكەن. دەلێن ئەو آیتە لە (مَدینە) نازِل بووە پاش وَقعەی (أُحُد) وشَهادەت ومَثْلَي (إمامي حَمْزة)، رَسولُ الله سوێندی خواردیە ئەگەر غالب ببم

بەسەريان حەفتايەكيان لێ مَثْلَ دەكەم مَثْلَەی لووت ولێو، بَعضه أعضایَ تری نیه مەردی كرما رِنەوزگی دەرێنی، حقاً كارێ ناشیرینه، باورِناكەم جەنابی رسالەت سوێند لەسەر شتی وها بخوا. جابرۆ بۆ مُنازَعەی عُلَمایان لە خصوصی مُماثَلة!! ﴿وَاصْبِرْ﴾ لەسەر تَحَمّلی شَدائد ومَكارِهی دەعوەت، ئەزیەت و عذاب وألَمي قَوْم و خوێشت. ﴿وَمَا صَبْرُكَ﴾ ئەوەندە گرانە بە كێو تَحَمُّلْ ناكرێ ﴿إِلاَّ بِاللَّهِ﴾ بە صَبْرى (محمد)ی بلێن مَحض بە خَلق وتأيد وتَقويه وإمدادی خوایە، راضیم! فی الحَقیقەت إنسان كە تَصَوّر لە حالی رسالەت پەناه دەكا، تَحَيُّر دەیگرێ، نێزیكە إنسان شێت ببێ! ئەو زاتە چ بووە؟! شَخْصی أُمّی لە قَوْمی جاهِل وبە عِناد وقووەت وهورِەمل، دەعوەتی عالەم بكا بۆ دینی نوێ، نەبە آداب ورِەوشتی قَوْمی خۆی راضی بێ، نە بە أحْكامی گۆییا سَماوی (جوو) و (دیانانە)، نە بە دەستوری دەوڵەتی رۆم، نە بە قَوانینی حُكومەتی إیران، نە بە عِبادەتی ثَوْر وصَنَم وئاگرو شَمس وقَمَر ونجوم وهَیاكِل وأرواحی غائِبە، قایل نەبێ!!! دەعوەتی أنام بكا بە تَركی إعتِقادیّات وأفعال وآداب وعَنْعَناتي أسْلافیان، لە هەموو لایَ عَذابي دەن تَحْقیري كەن، بێ كەس ودەرەتان، بێ قُدرەت وقووەت، لەسەر ئەو دەعوەتەش صَبْر وثُبات كا، یەك لە دوای یەك آلامی لە طَرَف خوا بەسەردا بێ، لە دونیا دڵی بە حَرَمی مُحْتَرَمەی حَضرەتی (خَدیجە) خۆشبوو، تَهْوینی آلامی دەكرد، لێی ستاند! مامی حِمایەی دەكرد، كوشتی. نەیارێ، نە غەم گوسارێ! بەو أحْزانە صَبْرو شُكر بەجێ گەێنێ، نازانێ مُتَأمِّلْ بلێ چی؟!! خۆ ئەوەی لە مُنافقانی دیت، ئەو مَرارەتی لە إفْكی چێشتن، لا إله إلا الله، چۆن تَحمُّل دەكرێ؟!! أعْمالی أُمَّةْ دوو شەموو پێنج شەمووان، عَرْضی رِسالەت پەناه دەكرێ، لە رَسالِمی أرواح، إیمانم بەو قسەیە هەیە! خۆم بە تَجْرَبە دیم! مادام وابێ پاش شَهادەتی (عُمَر) تا ئەمرۆ، شادیەكە لە أُمَّەت، پێ نەگەیشتیە، بە غَیْری فتنەو فَسادو ژێركەوتن، لە أُمَّة چی تری نەبیستیە!! ﴿وَلاَ تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ﴾ كە إیمان نائێنن بە هیلاك دەچن. زاتێ بە رِەحم وەك رسولی أكرَم دڵی بۆ عالەم مَحزون دەبێ، لكن

بِالآخِرَةِ﴾ زاتاً مَداری گوێ لێ نەبوون و گوێ نەدان، إنکاری حَشْره! مەیلی دونیایە لە غایەت بەدەر! زۆر دەبێ ئەوەی صَفای عَیْشی لێ مُکدَّر دەکا، نایبنێ! ﴿حِجَابًا مَسْتُورًا﴾ پەردەێ بزر، مَعْنَوی! ﴿وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً﴾ غطاو پەردە. ﴿أَنْ يَفْقَهُوهُ﴾ یَعني مانعێ لە فهمی. ﴿وَفِي آذَانِهِمْ﴾ لە گوێیان دا. ﴿وَقْرًا﴾ گرانی، کەڕن، نابێن! لێرەش تەماشای روایاتی (روحُ المَعانی) بکەی، تَعَجُّب دەکەی لەو حِجابە ئەو جَعْلە مَشیَّتە لەو مَقامە، زۆر مُوافقە، ئومێد ئەکەم ئەوە مُعْتَزلیش إنکاری نەکەن!. ئەو حجابە چیە؟ لەبەر چیە؟ إشارەی بۆ کرا!! ﴿وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي الْقُرْآنِ وَحْدَهُ﴾ أسبابی نەبیستنیان، دووە! إنکاری قیامەت، إنکاری وَحْدەتی إلاهی! ﴿وَلَّوْا عَلَى أَدْبَارِهِمْ﴾ ئەگەڕێنەوە. ﴿نُفُورًا﴾ بە نَفْرَت و وَحْشَتْ. (وَصَلَّ النَّبيّ) ئەوانە گوێیان لەو قسانە نیە، أمّا شتێ هەیە زۆر کەیفیان پێ دێ، بە سرتە ئەیلێن! ﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَسْتَمِعُونَ بِهِ﴾ بۆ وی، لەبەر وی. ﴿إِذْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ﴾ بە ظاهری لە وەقتێ چ قەشمەریێ بە قُرآن ئەکەن. ﴿وَإِذْ هُمْ نَجْوَى﴾ لە حەق تۆو چی ئەلێن؟ ﴿إِذْ يَقُولُ الظَّالِمُونَ إِنْ تَتَّبِعُونَ﴾ ئەگەر إتِّباع کەن. ﴿إِلاَّ رَجُلاً مَسْحُورًا﴾ سحر لێ کراو، شیت بووی. خُصوصیەتی تووش دەکەن بە مانع لە إیمان، دەعیەیان نایبنێ إیمان بە جەنابت بێنن ﴿انظُرْ﴾ بە وَجهی تَعجُّبْ! ﴿كَيْفَ ضَرَبُوا لَكَ الأَمْثَالَ﴾ ئێستاش بَعْضێ لە ظالمانی ئەوروپی أمْثالی ناشایستە دەربارەی رسالەت پەناه لێدەدەن. ﴿فَضَلُّوا﴾ لە ڕێی ڕاست بە حَماقَةْ. ﴿فَلاَ يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلاً﴾ موجبي طَعن لە حقیقەتدا نیە، بەو هَذَیانانە دەربارەی ئەتۆ تَحریکی لِسان دەکەن، خۆشیان نازانن دەڵێن چی!. (تازە لە طَریقي عِلمی پێ ئەگەیشتم ڕۆژێ دوازدە دەرسم ئەگوت، وەدەرسیشم لای بابم ئەخوێند، ئەوەی لە ڕێ داماڵا بوون دەیانووت: (شەوێ ئەو دوازدە دەرسە لای بابی ئەخوێنێ، بەڕۆژ دەیلێتەوە بە دەرس)، کە بیستم وتم: (بە خودای ئەو اِقتدارم نیە بە شەو دوازدە دەرس بخوینم، وای وەرگرم سبەی بە فەقییانی نیشان دەم تێیان بگەێنم، ئەو طَعنە بۆ من مَداری فَخْرە ئەگەر وابا، بەلاّم مَع

الأسَف ئەو لياقەتەم نيە! ئيتر بەدخواه نازانێ ئەڵێ چی! وَلَوْ كەسێ وەك ((طوسي)) بێ كەزبان لە حەق أبو بكرو عمر دەكوتێ؟ ﴿وَقَالُوا﴾ أنَّهُ إنكاري رۆژی جزا دەكەن بە حُجَّة و دَليل. ﴿أئِذَا كُنَّا عِظَامًا﴾ ئێسكێ بێ گۆشت ورابطە. ﴿وَرُفَاتًا﴾ رِزيی، ورد ورد بووی ﴿أئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ﴾ زيندی دبينەوە؟ ﴿خَلْقًا جَدِيدًا﴾ خلقێ نوێ، نوێ ئەبينەوە؟ سەر لە نوێ إعادە ئەكرێينەوە؟ ئەمە مُحالە! أمّا إعادەی مَعْدومی صِرف، أصْلاً مُمْكِن نيە!! ئەگەر لە كَلمەی إعادە بفكرن ئەزانن إعادە بە كەرەستەی أوَّلی ئەبێ! إعتِقادی ئێمە وايە لە عَناصِری أصليَّة ئەم هەيكەلە دادەرژێتەوە، رووحی خۆی دەچێتەوەبەر ﴿قُلْ كُونُوا حِجَارَةً أوْ حَدِيدًا﴾ حَقيقَةً قسلُ وئاسن داخلي عَناصِري ئێمەن. ﴿أوْ خَلْقًا مِمَّا يَكْبُرُ فِي صُدُورِكُمْ﴾ زۆر دور بێ لاتان لە حَياة، أوكسجين وهايدرۆجين لە موادی ناری لە إمتِزاجيان ئاو پەيدا ئەبێ، ئاويش مَداری حَياتە. تَفسيري (ما يَكبُر) بە سَماوات وأرض وجِبال بە تَوَهُّمی كِبَری حِسِّيە يا بە مَوت، زۆر دوورە لە حَياة، زۆريش دوورن لە مَقام! وەمُبالَغەی گەلێ شيرن نيە! وە (كَبُر كُبْری)يی ناخۆشيە. ﴿فَسَيَقُولُونَ﴾ ئەو سؤالە ئەكەن، بكەن! ﴿مَنْ يُعِيدُنَا﴾ لەسەر ئەو تَباعُدە! ﴿قُلِ الَّذِي فَطَرَكُمْ﴾ اِخْتِراعی كردينە ﴿أوَّلَ مَرَّةٍ﴾ غايەتی ئەو هەيكەلە لە پاش رزين، پارە پارە بوون، ئەچێتەوە سەر عَناصِری أصليَّە تَكْرار تَشَكُّل بكا، حَتّی عَلی سبيلِ الصُّدفە، دوور نيە! ﴿فَسَيُنْغِضُونَ إلَيْكَ﴾ بۆ لای تۆ. ﴿رُءُوسَهُمْ﴾ سەری خۆيان بەلای تۆ، بە (حركە) دێخن. ئەو (هيئەت)ە (تصوير) ناكرێ، ئەبێ (تەماشای) (خارج) كەی، كەسێ (إنكاری) قسەيەكی بكا، سەری بۆ (طرف)ی وی ئەبا، بە (حركە)ی ڕاست و چۆپەی، وەخۆی گرژ ئەكا؛ (أمّا) سەر هينان وبردن بۆ بلّند و نەوی دوو (نوع)ە، يەكی (أثر)ی (زێد)ە (تأمّل) و (تعجب)ە، يەكی (علامەت)ی (تصديق)ە ﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هُوَ﴾ ئەو (سؤال)ە لەو (حال)ە بۆ چی يە (مناسب)ی سەريادان ئەكرێ ﴿قُلْ عَسَى أنْ يَكُونَ قَرِيبًا﴾ كە (فَهم)تان كرد ئەزانن زۆر (قريب)ە، (لكن) دوورن لە (فهم)ی بۆيە دوورە، ياخود بە (مُحال)ی ئەزانن، (حقاً) (إيمان)مان

هەیە، هەر (آن)ێ خوا ئارەزووکات ئەو (نظام)ە تێك ئەدا؛ (نظام)ی چاتر دادەنێ؛ (لکن) بە زەمان، یەعنی کەی ئەبێ؟ قسە لێ کردنی (هَذَیان)ە، وە (لَو) (ملا)ی زۆر گەورە (حد)یان بۆ دانایە، (لکن) بێ (حَدّی)یە. (قول)ی (برهانی) و (دلیل)ی (حُجّتی) نیە، (خیالات)ێ دوورو (غلط)ی (ظهور)یان کردیە ﴿يَوْمَ يَدْعُوكُمْ﴾ بۆ (حَشر) (مانَع) و (مُخالف) نیە، دەر (عَقب) ﴿فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِ﴾ وەکی (عبد)ی (مَطیع) و(أمر) بەر ﴿وَتَظُنُّونَ إِنْ لَبِثْتُمْ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ ئەوەندە نەمانەوە، بڕێن (متفرق الأجزاء) بن وەك (هیاکل)ی (فراعن)ی (مۆمیا) کراو (حاضر) و آمادەن بۆ (روح) هاتنەوەبەر ﴿وَقُلْ لِعِبَادِي﴾ ئەوانەی (إیمان)یان بە (وحدانیەت)ی (إلهی) و ڕۆژی (جزا)و (رسالەت)ی (خاتم) هەیە؛ (حجاب)ی (جهل)یان لەبەینا ناماوە ﴿يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ لەگەڵ ئەوانە بە (إستهزا)یان (حدّەت) نەگرن، لە (بَین)ی خۆیان دەرحق یەك قسەی نالایەق نەکەن، بێ (غیبەت)و (نمیمی) بن، خوایان یەکە، (دین)یان یەکە (رسول)یان یەکە، (مُتّفق) بن، بە قسەی پڕوپووچ ئەو هەموو (رابطە)ی (إتحاد)ە نەپسێنن ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْزَغُ بَيْنَهُمْ﴾ (فساد) ئەهاوێتە ناویان، بە ئەنگوستی (فتنە) ئەنگیز (بین)یان تیك ئەدا ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ﴾ (سابقاً) ﴿لِلْإِنسَانِ عَدُوًّا مُبِينًا﴾ (ظاهر العداوە)یە، دوشمنی (قدیم)ە، هەرچەند خۆی بزرە، (عداوەت) و (سیاسەت)ی ئاشکرایە، (إنسان)ی بە هۆش زووتێی ئەگا ﴿رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ﴾ مەڵێن: (جناب)ی (حق) وائەفەرموێ، ئێمە (لە الحمد) (اهل)ی (إیمان)ین" خوا بە ئێوە لە ئێوە (عالم)ترە، (مزاج) و (مَیل)و (أحوالات)ی (نفسیّە) لای ئێوە (خفی)یە، لای خوا ئاشکرایە ﴿إِنْ يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِنْ يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ﴾ لەسەر خۆی (فرض)ی نەکردیە، (إلاّ) (رەحم)تان پێ بکا، ئێوەش وەکی (سائر)ی (أقوام) بە (نصائح)ی ئەکەن باشە، بۆ (دین) و (دنیا)، وە (إلاّ) خراپە بو (دارین) ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلاً﴾ نەمان ناردیە سەروان، بە (مُفوّض) ئیشیان دەبی (عُهد)ە بکەی، ئەبێ ئاگاداری خۆبن، نەڵێن" (الصّالحون لله والطّالحون لی) ئێمە زۆر خۆشەویستین ﴿وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَنْ

في السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ به (مزاج)یان (أدوار)یان (أطوار)یـان (دَوام) و (ثَبـات)، (زَوال)و (إنقراض)یان (أحوالات)ی (سرّی) و (عَلنـی)یـان ﴿وَلَقَدْ فَـضَّلْنَا بَعْـضَ النَّبِـيِّينَ عَلَـى بَعْـضٍ﴾ (تفاضـل) لـه (بـین)ی (أفـراد)ی (كـلّ)ی (صـنف)ی (ضروری)یه (فطری)یه. (فضل)ی (رسول) به (فـضائل) و (مَزایـا)ی (تبلیـغ) و (إصلاح)ە، (قوّەت)ی (بیـان) (قـوەت)ی (إرادە)، (صـبر) و (عـزم) و (جـزم) و (وقار) وشكۆە، ئیوا هەیە (رسالەت) (فخر)یان پێ ئـەكا وەكـی (خـاتم الرسـل) (موسی الكلیم)، (حقیقة) (سطوة) و (هیبەت) و (نباهەت)ی (شأن)، ئەدەن بـە (رسالەت). (عباد)ێ (خالص)ی خوان، هەرچەند گەورەتر بـن، هەنـدە لـە خـوا ئەترسن، (إنذار)ی خوێش بێ (كأنّه) ئەكەن كەسیان نالێ: "تۆبالێ به ملی مـن، چـی دەكـەن بیكـەن، خـوا (عَفـو)تـان بـۆ ئـەكا، ئێمـە تكاتـان بـۆ ئەكـەین!" (حاصل)ی وەكی (أمـم)ی تـر (مَغـرور) مـەبن ئاگـاداری (إتحـاد) كـەن ﴿وَآتَيْنَـا دَاوُودَ زَبُـورًا﴾ كـە ئەفـەرموی: "إن الأرض يرثهـا عبـادي الـصالحون" ئـەزانن (صالح) چیە؟ مەخەڵەتێن (صَلاح)ی (إدارە) و (مِلـك) داریـە (جُـوایَز)ە لەگـەڵ (صلاح)ی صوفیلكە و موفیلكان. وەلەگەڵ (صلاح)ی (ملا)یان.

بنۆڕنە (تأریخ) (دڵی بطروس) چی كرد بو (رووس)؟ (بسمارك) بۆ (ألمـان)؟ (حالا) (هتلر) بۆ (ألمـان)؟ (موسـولینی) بـۆ (إیطالیـا)؟ لـە زەرفـی ئـەو چـەند ساڵە (إیطالیا)ی گەیاندە چ (دەرەجە)یە؟ ناشـكری نـەبێ ئێمـە كێمـان هەیـە؟ پڕی (دنیا) (شێخ)ن چیان لێ بكەین؟ چیمان بۆ دەكەن؟ خۆزی لە جیاتی ئـەو (ملیون) (أولیا)یانە چوار پێـنج كەسـی وەك (مرحـوم) (ملـك فیـصل) وە(سـعد زغلول)مان هەبا. ئەمـە بـەرجا خـۆزی یـە (روایـەت)ی ئـەم و ئـەو لـە (شـهد)ی (بن)ی (حوشب) (حضرت)ی (داود) بە بـۆقی نەشـكێنین، لـە (تـسبیح)ی خـوا (تفضیل)ی بۆقی بەسەردا نەدەین. بریا ئەو (آیەت)ەیان گـوێ لێ بـا لـە (بـدل) قیڕەقیڕی بـۆق ئەگـەر (أحـسن) و (حـسنا)یـان دەربـارەی (حـضرت)ی (داود) نەگوتبا، قسەی ناشیرین وپڕوپوچیان دەربارەی ئـەو (خلیفـە) (عظـیم)ە هـەڵ نەدەبەست، (قَول)ی تریش هەیە (مـراد) لـە (عبـاد) (كفـار) بـن، (فخـر الـدین)

لەسەر ئەو قسەش (تفسیر)ی (آیەت)ی فەرمووە، (أمّا) نازانم (قائل) کێ یە؟ چونکی (فخر) (قائل)ی (بیان) نەفەرمووە. ئی دواییش ئەیلێن: "(قیل)" ﴿قُلْ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُمْ مِنْ دُونِهِ﴾ لە عُقَلای أقویای شایانی عبادەت لەلای خۆتان ﴿فَلاَ يَمْلِكُونَ كَشْفَ الضُّرِّ عَنكُمْ﴾ ناتوانن ضُرێ وەکی ناصاغی وفَقر وقَحط وأمْثالیان، لەسەر ئێوە نەیەڵن إزالەی کەن! ﴿وَلاَ تَحْوِيلاً﴾ بۆ کەسێ، قَومی کەی بنێرن کە عباداتیان ناکا! حَتّی خۆتان لەگەڵی مَواقعی شدّەت، دەزانن إلاهەکانتان کەڵك ناگرن، لەبەر خوا دەپاڕێنەوە بۆ دَفعي ئەو بەلایە. کەسێ بە فریادی ئێوەو ئێمە دێ، قُدرَتێ کامِل وعِلمێ دائم وشامِلی هەبێ، غَیْری خوا، عاقِلێ ناتوانێ بلێ إقتداري لەسەر هەموشت وعِلمي بە هەمووی هەیە! أساساً دَلیل لەسەر وجودی (مَلَك) و (جِن)، حَتّا عقولی مُجَرّدی حُکمایان نیە! دَلیل ئەگەر هەبێ دوای إثْباتی واجبُ الوُجود و واحِدي حَقیقي و دوای إرْسالي رُسُل دەبێ!.

جەنابی حەق ئەگەر بِالْفِعل کَشْفی نەکا، دەتوانێ بیکا! زێرا نَقص بۆوی مُمکن نیە! بۆیە دەفەرموێ (لا يَمْلِكون) نالێ (لا يَكْشِفون)، وَلَوْ کي (لا يَكْشِفون)! ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ﴾ بۆ دَفعی شَدائد. ﴿يَبْتَغُونَ﴾ ئەوان طَلَبْ دەکەن، بە تاسوخی! ﴿إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ﴾ وسیلێ بدۆزنەوە خۆیان لە دەرگاهی کِبریائی نزیك کەن. وَسِیلە غَیْری إیمان وعَمَلی چاکە، نیە! بەلام لێرە (صوفیّە) فێڵێ ئەکەن خەڵکی ئەخەڵەتێنن، ئاگامان لەخۆ بێ! ئاگاو لەخۆبێ! وەنەبێ، کاری خۆیان کرد، بۆیان چەسپا، بوونە وَسائل! سَعي و وَسائلیان کردە سَلاسل! بە أنْوار زیاد دەکا، أما لە حَقیقەتدا، وەکی إلاهی ئەوانە، بۆفن! أمّا وەکی (هەیکەلانی پیر) کە لە حِکایەتی ئەسکەندەر باسی دەکەن، ئەوەی ببێ نێك ویەد دەربارەی خۆی یا دوژمنی، دەڵێ: ئەوە خۆم تَقدیرم کردبوو، إلاّ ریش تاشینی (نەسیمی عَیّار)!!!.

طَلَبی وَسیلە ئەکەن ﴿أَيُّهُمْ أَقْرَبُ﴾ لە واقعْدا، یا لە نَظَری ئێوە. ﴿وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ﴾ ئومێدی ڕەحمەتیان هەیە. ﴿وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ﴾ لە عَذابی ئەترسن.

ئـەبیٚ مَلائکـەتـیش مُقـابلی عِبـادەت جَـزای مُوافـق وەرگـرن، وەقـابلی عَـذاب چێژانن. هەرچەندە ڕەحمەتی إلاهـی لـە غایـەت بـەدەرە، سـعەتـی هەیـە، أمّـا مُناسبی حال و مَقام ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا﴾یە، لەو عجز زیاترە، وَلَـوْ لای مَلَكْ أوْفَقَه، مَلَكْ کە ئەڵێن (نَباتُ الله)هن لێی ئەترسـن! ﴿وَإِنْ مِـنْ قَرْيَـةٍ﴾ نیـە! ﴿إِلاَّ نَحْنُ مُهْلِكُوهَا﴾ بەجارێ مەحوو دەبێتـەوە، بـە مـەحووی إهْلـی، بـەدەردو بەلاو شـەڕو شـۆڕو نارەحـەتی بـێ نَظـافـەتی وعَـداوەت وفَقْـر. ﴿أَوْ مُعَذِّبُوهَا﴾ أهْلـي. ﴿عَـذَابًا شَـدِيدًا﴾ بـەلاّم ئـەمێنن، بـەڵکو مُکَـرراً ئافاتیـان بەسـەرا دێ، وەدووبارە إعْمار دەکرێتەوە.

لای خوا فَرقی (مَكّة) وغَیرە مَکّـە نیـە، ئەوانـە مَغـرور نـەبن، نـەڵێن ئێمـە فی الدّارَین آمنین لە عَـذابي إلاهـي! تَفـسیری هلاکـی قُـری وەبەچـی ئـەبێ، عائـدی علمی عَلاّم الغُیوبە! ئەوەی وتوویانە چ (وَهَبي بِن مُنَبـه) چ غَیـری، بـێ أصـلە، نابێ إعْتباریـان پـێ بکـرێ! ئـەڵێی (كَعْـبُ الاحْبـار) و (وَهَـبْ) بـۆ دەرسـی درۆ ناردراونە سەر ئێمە، وەکی (هارووت) و (ماروت) بۆ تَعلیمـی سـحر! !. (شـام) حالاً لەبەر حُکمی (فرەنـسەیە)، (مَهْـدی) نـاوێرێ بچێتە وێ، تـا مُخْلـصەکانی (مَدینە) بچنە لای، مُنافقەکان بەبەر جَفا بکەون! مَعَ أنّـهُ بَعْـدَ الاسـلامْ – يَعـني تَقْریی– مُنافق لە (مَدینە) نەما! لەوبەینـە (إیطالیـا) إسْـتیلای (حَبَـشة)ی کـرد ئیتر وازوو (حَبَشە) ناتوانێ بۆ سـەر (مَكّـة) بـێ! ئـەو حَبَـشەی أحْمَـر الـسّاقَين أزرَق العَیْنَین أفطَسُ الأنْف کَبیرُ البَطن کەپوداتسای زگ گـەورە ورگ ئەسـتوور، خوادەرفەتیانندادا، (كَعْبة) بڕوخێنن! خصوص ئەمڕۆ (مكّە)و (مَـدینـە) لـە ژێـر إدارەی ملـك إبـن الـسعدون بحَـوْل الله لـە شـەڕی هـەموو چـاو شـینان مَحْفـوظ دەبن! !. ﴿كانَ ذلكَ﴾ ما ذُکرَ، ﴿في الْكتاب﴾ کتابی کَوْن ﴿مـسْطوراً﴾ ئـەوەی لـە آثـاری بفکـرێ، ئەیخوێنێتـەوە وەفائدەشـی لێ چـنگ دەکـەوێ. تەماشـا چ خَزائنیان لە خَراباتي (بابل)و (ئاشووري) دەرخست! لـە سَـیْری أنـامْ ئـەزانین، ئەوەی مَدَنیّەتی فاضلەی هەبێ، پایەدار ئەبێ! مَدَنیّـەتـی فـاجرە وەك سـابقـاً إشارەمان بۆ کرد ئەوەی قانونـێ باشـی ببـێ، وە میللـەت هـەموی عَمَلـی پـێ

نەكا، ئەویش داخلی فاجرەیە مَحكُومی زَوالە! با ئەوانی دی تەماشی لَوْحَ المَحفوظ كەن! أمّا ئێوە تەماشای آثار وسیَر كەن! ﴿وما مَنَعَنا اَنْ نُرْسِلَ بِالآیات﴾ (آیات)ی (مُقترحە) دوور لە (قواعد)و (نُظم)ی (كائنات) ﴿إلاّ أنْ كَذَّبَ بِها﴾ لە بۆیان (إظهار) كران (حَسب) الخواهِش ﴿الأوَّلُون﴾ (أمم)ی (سالِفە) بە گوێرەی (إقتراح)یان (آیات)یان بۆ هاتیە، (تكذیب)یان كردیە، بە (آیات)یان نەزانیە، (خُلاصە) (إیمان)یان نەهێنایە. یەكی لەوان (ثمود)ە (معروف) و (مشهور)ە، (آیەت)ی (عجیب)ە ﴿وآتَیْنا ثَمُودَ النَّاقَةَ﴾ لەبەر (أعجوبە)یێ پێی ئەلێن: "ناقةُ الله" ﴿مُبْصِرَةً﴾ (مُوجب)ی (بصیرەت) و تێگەیشتن و (إیمان) بوونە ﴿فَظَلَمُوا بِها﴾ چ جای (إیمان)؟ (ظلم)یان لێ كرد، بە (سبب)ی وی (ظلم)یان لە خۆیان كرد. ئەوانەش وان زێدە (تجاوز) ئەكەن، لە (حدود)دەرئەچن. (عذاب) (بالفعل) بەسەریان دادێ، ئەمەش نابێ ﴿وَمَا نُرْسِلُ بِالآیَاتِ﴾ (خوارق) و (معجز)ە ﴿إلاَّ تَخْوِیفاً﴾ تا بە (خوف) بێ، دێ، وە(إلاّ) (خوارِق) بێ (فائدە)یە ﴿وَإذْ قُلْنَا لَكَ﴾ (یامحمد) ﴿إنَّ رَبَّكَ أحَاطَ بِالنَّاسِ﴾ (سر)و (علن) و (أحوالات)ی (نفسیە)یان ئەزانم (عَلى أتّم وَجه) بۆیە (آیات) نانێرم (إیمان) نایەنن، پێیان بڕوامەكە ﴿وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤْیَا الّتِي أرَیْنَاكَ﴾ ئەوەی شەوی (إسراء) دیتت. ئەگەر چی (عیان)یش بوو، بە (رُؤیا) (حساب)ە (أمّا) ئەوەی بلێ: "(رؤیا)" بووە (حاجەت) بە (توجیە) ناكا ﴿إلاّ فِتْنَةً لِلنَّاسِ﴾ (حتّى) (بعض)ی (أهل)ی (إیمان) پێ ی گۆڕان، چ جای ئەوانە (إیمان) بێنن؟! چ جای بە (مشاهد)ەو (عَیان) بە خەونیش لێ یان (قبول) ئەكردین ﴿وَالشَّجَرَةَ الْمَلْعُونَةَ فِي الْقُرْآنِ﴾ (شجر)ی (آدم)ی (في الجنة) بوە (مدار)ی گوناهی (عالَم)! (بنی آدم) تا زەمانی (عیسی) لەبەر ئەو گوناهە (مُعذّب) بوون، دوایە خوا (تصوّر)ی كرد، مانی ئەوانە لە (عذاب) بێ ڕەحمی یە، (نجات) یان (خلاف)ی (عدل)ە، (تدبیر)؟! خوا خۆی كرد بە (عیسی) چووە ناو زگی (مریم). (بعد التطور) گوێت لێ بێ" (داروین)، وەك (سائر)ی (حیوانات) هاتە دەر، گەورەبوو، خۆی بە (صلب)دا، خۆی كردە (فدیە) (آدم) و (نوح)

(إبراهیم) و (موسی) و (سائر)ی (رسُل) و (أنبیا) بەو (فِدیە) (نجات) یان بوو! وە کەسێ ئەو (إعتقاد)ە بکا (نجات)ی ئەبێ. ئینجا دار لەو دارە (ملعون)تر هەیە؟ بە (ملیان) (عالَم)ێ (بعد الإیمان بِالله وآیاتِه) پێ ی وەرگەڕا!.

(أمّا) (شجره الزقوم) ئەوەندە (ملعون)نیە، وە (کذا) (حنظل) و (کشوث)، بەڵکو ئەمە زۆر دوورە.

﴿ونُخَوِّفُهُمْ﴾ ئەو (قوم)ە (عنود)ە ﴿فَمَا يَزِيدُهُمْ﴾ ئەم (تخویف)ە ﴿إِلاَّ طُغْيَانًا كَبِيرًا﴾ (تقدیر) ناکرێ (أمّا) (حمل)ی (شجر)ە لەسەر (شجر)ەی (خبیث)ەی (بَنی أُمیّە) (رؤیا) لەسەر خەونی (رسالەت) پەناه (بنی أمیّە) ئەچنە سەر(منبر)ی، بێ(معنا)یە، بێ (ربط)ە، لە (قرآن) (إشعار)ی پێ نیە. وە (بعض)ە خەوی دیتوە لە (مدینه) ئێرە جێ‌ی نیە (عرض)مان کردن یەکی لە (أسباب)ی (إیمان) نەهێنانیان، (خصوصیەت)یکە (عائد)ی (ذات)ی (رسالەت) پەناه. (حسد) و (کِبر) لێ یان ناگەڕێ، بە قسەی ئەم و ئەوو (ابلیس) (إشارە)ی بۆ ئەفەرموێ ﴿وَإِذْ قُلْنَا﴾ ئەمەش یادکە، تێ یان بگەیەنە ﴿لِلْمَلاَئِكَةِ﴾ ئەوانەی ئەڵێن: "(إلاه)ن (بناتُ الله)ن ﴿اسْجُدُوا لِآدَمَ﴾ باوکی ئێوە ﴿فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ﴾ ئەو (سجد)ەی نەبرد (بعد السؤال) لە (جواب) ﴿قَالَ أَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا؟﴾ (إبتداءاً) قوڕ بووە؟ ﴿قَالَ﴾ (بعد الرَّد و الطرد) ﴿أَرَأَيْتَكَ؟﴾ دیوتە؟ (خبر)م دەیە ﴿هَذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ؟﴾ ئێوەش وەك (ابلیس) بە (تکریم)ی (رسالەت) پەناه (راضی) نین– (مَع أنّهُ) بە (إعتبار) ی نەژادو دودمان، یەك (عنصر)ن. دیارە ئێوە بەدترن! ﴿لَئِنْ أَخَّرْتَنِي إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ تا ڕۆژی وا پسین، ئەم کوڕی بژیەم ﴿لأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ﴾ پەتیان لە شەویلاکەی ئەخەم، ڕاین ئەکێشم، بۆ هەر جێ یە حەزکەم! ئەو (نوع)ە بەستنە، (کورد) پێ ی ئەڵێن:"(شیطان) لغاو" یاخود بە (هلاك)یان ئەبەم، وەك: کلۆ (زراعەت) بە (هلاك) ئەبا! ﴿إِلاَّ قَلِيلاً﴾ ئەوی (مخلص)ن، پاك و خاوێنن ﴿قَالَ﴾ (جناب)ی (حق) ﴿اذْهَبْ﴾ بڕۆ ئاڵچاغ، ئەوەی ئەی کەی بیکە، چی لە دەستت دێ (قصور) مەکە! ﴿فَمَنْ تَبِعَكَ مِنْهُمْ﴾ لە (بَنی آدم) ﴿فَإِنَّ

جَهَنَّمَ جَزَاؤُكُمْ﴾ ئـی تـوو و وان ﴿جَزَاءً مَوْفُـورًا﴾ زۆر (مُکمَـل) ﴿وَاسْـتَفْزِزْ مَـنْ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ﴾ له (موقع)ی خۆیان هەلّیان کەنە ﴿بِصَوْتِكَ﴾ به دەنگی خـۆت دەنگیان دە، بـه فێـلّ بیانخـه داو ﴿وَأَجْلِـبْ عَلَـيْهِمْ﴾ بەسـەریان دادە ﴿بِخَيْلِـكَ وَرَجِلِكَ﴾ به سوارەو پیادەت لەشـکریان لێ بکـه ﴿وَشَـارِكْهُمْ فِـي الأَمْـوَالِ﴾ بـه (تبذیر) پێ یان (صرف) که ﴿وَالأَولاَدِ﴾ گـاهێ پـێ یـان زینـده بـه گۆڕکـه، لـه (فَقر) بیان ترسێنە، گاهی پێ یان (مغرور)که. (روایەت)ی له (مُجاهدی) ئەکـەن (لازم)ە (إنسان) (إستیعاذ)ی لێ بکات. خۆزی ئەو (نوع)ە (هَذَیانانه)یان (نقـل) نەکردبا. (حقّاً) (نَقّال) به دەست (شیطان)ی زۆر (ضعیف)ن، وەکی تۆپۆکـەی مندالآن گەمەیان پێ ئەکا ! (أمّا) ئەوەی به (عقل) گران بـێ (شـیطان) نـاتوانێ هیچی له (حق) بکا. ﴿وَعِـدْهُمْ﴾ بـه (شـفاعەت) و (عدالـەت) (إنهـا) و (مَنْهـا) و (وَعد)ەیان پی بـدە ﴿وَمَـا يَعِـدُهُمْ الـشَّيْطَانُ إِلاَّ غُـرُورًا﴾ (وعـد)ەی منـدالّ هـەلّ خەلّەتێنە (تزیینات) و (تمویهات)ی بـێ (أصـل)ە ﴿إِنَّ عِبَـادِي لَـيْسَ لَـكَ عَلَـيْهِمْ سُلْطَانٌ﴾ دەسەلآتت به سەریاندا نیه. ئەوانەی ضَعیفن به مَیْلي سوئي شَهَواني وحَیواني، دەیانتوانی دایـان بـرێ، ئەوانـه بانگیـان کـەی، بـه دووت دەکـەون! ئەوانەی به مَزایای إنـسانی مُحَلاّن، میـولی حَیوانیـان بـێ هێزکردیـه، ڕەزیـن و رَصین و گران وَ قورِن، به فیکەفیکی شَیْطان به قانك و صَواعقِ له جێی خۆیان دەرناچن. له بَعضه تَأریخـێ ئـەلێ: ((نـاپلیۆن) لـه مَـوقعێ ڕاوەسـتابوو أمـری ئەنووسی بۆ قائدەکانی، لەو وەقتێ گوللە تۆپێ هات له نیزیکی کـەوت، کـردی به تۆزو گەرد، أصلاً ناپلیۆن نەجوولآیەوە نەخَجْلا ووتی چا بوو زاتاً خـۆلّم پـێ ئەویست کاغەزەکەی پێ هیشك کەمەوە، ئەو گلّە یاریدەمی کرد خۆلّی بەسـەرا ڕژاند). ﴿وَكَفَى بِرَبِّكَ وَكِيلاً﴾ بۆ عِبادی خۆی که إعتمادیـان لەسـەر ئـەوە. لـەو خصوصه أهَمیەت نادەنەکەس. ﴿رَبُّكُمْ الَّذِي يُزْجِـي لَكُـمْ الْفُلْـكَ﴾ إلاهـی ئێـوەو شَیْطان لەو صُنْعه چ مُداخَلەیان هەیه؟ له کۆل خَوارِق گـەڕێن، بـێ فـائدەیـه! وەك بروسکه دێت و دەڕوا! بنۆڕنە آیاتی کَوْنیّه مُفیدە! آیـاتـێ مـوجبی علـم و عملی بێ! خوای ئێوە ئەو خوایه یه سَفینەتـان بـۆ سَـوق ئـەکا ﴿فِـي الْبَحْـرِ﴾

بَشَري هِدايَةْ داوە بە فكري دَقيقي خۆی، تەمەشای أحوالّی طَبيعياتي كرديە، بە وَحْي و إلْهامي ربّاني، ئەو سُفُن و پاپۆڕو غوّاص و غانبوط و بەلەم و قفّە و كەلەكی كوردان و ماتۆريان، دروست كرديە ! ! . ئێوە بەرابەر بە (هُبَل) و (نائلە) و (لات) و (عُزیّ) ڕادەوەستن، چ فائدەتان پێ دەگا؟ جارێ هیچ نەبێ وەكی سائری بَنی آدم ئێوەش صُنْعێ فێر بن ! . لە بَحر سەيری سَفاين بكەن ﴿لِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ﴾ رِزقی خوای بە تِجارەت طلب كەن ! ﴿إِنَّهُ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ بە إعْطاي إسْتعدادو تَفَكّر و أسباب و مَوداي إبْتِدائي– عَلاوەی نَفعی دی– . ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فِي الْبَحْرِ﴾ كەوتنە فرتەنە ترسان لە غرق ﴿ضَلَّ مَنْ تَدْعُونَ﴾ آلِهە و شَيْطان ديق كەن، چی ناكەن ! كۆڕی أَلْخنّاس ئەگەر ڕاست دەكەی، نَجاتيان دە ! . جيق كەن فيق كەن، هيچيان پێ ناكرێ، كەس نيە هاواری كەنێ ﴿إِلاَّ إِيَّاهُ﴾ ذو الجلال وَالْكبرياء. ﴿فَلَمَّا نَجَّاكُمْ﴾ خطابە لەگەلّ ئەوانەيی نجاتی داين، وَإلاّ إجابە مُطَّرِدْ نيە، نەبۆ كافر نەبۆ مؤمن ! ﴿إِلَى الْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ﴾ لە ذِكري خوای لە تَوْحيدي ! ئەمە هيممەتی شێخی بوو، بريا حَمْليان كردبا سەر مَهارَەتی مَلاّح و (قَبْطان)، نسبەتيان نەدابا بۆ كەسێ خۆی لە ئاو لەوان زێتر دەترسێ، لەناو قايَغْ دەبێ چاوی ببەستنەوە ! ! ﴿وَكَانَ الإِنْسَانُ كَفُورًا﴾ شُكرانەی صاحِب نعْمەت ناكا، چ حقيقی چ ظاهری ! ﴿أَفَأَمِنتُمْ﴾ ئايا آمنين ئەی (كَفورين)ە ﴿أَنْ يَخْسِفَ بِكُمْ﴾ ڕووتانبا؟ ﴿جَانِبَ الْبَرِّ﴾ لە جهەت قوڕنەيێ كە قَرار گاهتانە، بەچی لە خوا آمينن؟ ناوی عارديتان كَشْف كرديە تابزانن پتەوە، قابِلی ڕوو چوون نيە؟ يا دەروونی خاليە لە مَوادی ناری، قابِلی إنْفِلاق نيە؟ ياخود ئەلێن: خوا ناتوانێ بە عارديماندا بباتە خوارێ؟ ئەم جَزمە بەچی؟ ﴿أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا﴾ زۆر دوور نيە أصحابُ الفيلی بەچی دَفع كرد لەسەر ئێوە ! ﴿ثُمَّ﴾ ئەگەر ئەوەبوو ﴿لاَ تَجِدُوا لَكُمْ وَكِيلاً﴾ حِفْظتان بكا، لێتان لادا. ﴿أَمْ أَمِنتُمْ أَنْ يُعِيدَكُمْ فِيهِ﴾ لە بَحرێ. ﴿تَارَةً أُخْرَى﴾ نەوبەتێ تر، ما جَراتان لەياد نەمێنی، كاروبارتان إيجاب بكا سَفَری بَحری بكەن ﴿فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ﴾ ئەو وەقتی ﴿قَاصِفًا مِنْ الرِّيحِ﴾ بای بە شِدّەت

بە هەوایْ مُـزعجْ، سَفینەتـان پارچـە پارچـە بكـا ﴿فَیُغْـرِقَكُمْ﴾ لـە بحـریْ بتانخنكێنیْ. ﴿بِمَـا كَفَـرْتُمْ﴾ مَرّەی أولی ﴿ثُـمَّ لاَ تَجِدُوا لَكُمْ عَلَیْنَـا بِـهِ تَبِیعًـا﴾ نصیریْ دوامان كەویْ مُطالَبەمان لیْ بكا. ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾ بـە (عنـوان)ی (بنی آدم) بیْ (نظر) له (دین) و ئایین، به (أنواع)ی (فضائل) ئاراستەی كردیە. هەر (مفسر)ە شتێكی فـەرمووە، لـە هـەموان (مناسـب) تـر (تـسلّط)ی لەسـەر (غیر) و (تسخیر)ی (أشیا)یە ﴿وَحَمَلْنَاهُمْ فِـي الْبَـرِّ وَالْبَحْـرِ﴾ لەسـەر (عَـرّابـە) و (فلك)ە، ئێستا (ئوتومبیل)، (قطاری شـەمەندوفەر) رینـوط، (غـوّاص)، ئەگـەر ئیستابا ئەی فەرموو: (فی البر والبحر والجوّ) ﴿وَرَزَقْنَاهُمْ مِنْ الطَّيِّبَـاتِ﴾ پـاك بـە (لذەت) (موافق)ی (صحەت) ﴿وَفَضَّلْنَاهُمْ﴾ به (علم)ی (عمل)ی (إطّلاع) لەسەر (دقائق)ی (صُنعی) ﴿عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا﴾ ئەوەی ئێوە ئـەیزانن ﴿تَفْـضِيلاً﴾ (تفضیل) لەسەر (حیوانات) (مُراد) نیە، لەسـەر (نـوع)ی (مثـل)ی خـۆی، وەك (مَلَك). ئەگەرچی قسه لـە (فـضل)ی (قیامـەت)و پاداشـی (أعمـال) نیـە (أمّـا) ئەوەندە ئـەڵێم: "(مِـن كُـلِ الوُجُـوه) (إنـسان) لـە (مَلَـك) زێـترە، لـە (صُـنع) و (إیجـاد) بـە هـەزار (درجـە) لـە (فـوق)ی (مَلَـك)ە" خـۆزی (زمخـشر)ی ئـەوڕۆ (إنسان)ی بدیبا، چۆن بە ئاسمان دا ئەفڕیْ؟ كوو (قَعْـر)ی (بِحـار) ئەپـشكنی؟ چۆن چیایان دەكوڵیْ؟ چـۆن ئـەمڕۆ، ئـاوا لـەم سـەری (دنیـا) بـە (تلفزیـۆن) و (تلفـون) و (ڕادیـۆ) یـەكتر ئـەبینن، گوێیـان لێـك ئـەبیْ؟! ئـەم (سـعی) كۆشیشەیان كرد، (مَعَ أنّهُ) هەروەكوو هـەموو (مَعایش)ی (دنیـا) (عـائق)ە لـە (عبادەت) هەموو (أدیان) (مانع) بوون لەم (إكتشافات)ە!.

(إختلافـات)یـان (عجایـب)ە، تـازە گوێیـان لیْ بـوو، خـوا (أمـر)ی كـردە (ملائكەت) (سـجد)ە بـۆ (آدم) ببـەن. وە(سـابقا) (عـرض) كرایـە، (تفـضیل)ی (إنسان) لەسەر (مَلَك) بۆ (بَشَر) (أوفق)ە، (خاصةً) (مقابـل)ی ئەوانـەی ئـەڵێن: "(بَناتُ الله)ن" تا خۆیان بناسن، خۆیان لـە (معبـود)یـان زێـترن، كـە (إنـسان) خـۆی ناسـی، بـەو گـوێرەی یـە (ترقـی) ئـەكا، تـیْ ئەكۆشـیْ ئـەوەی (روح)ی (سعی)تیا بیْ (إعتقاد)ی بۆ (بَشَر) زۆر باشە.

(زمخشری) بنۆڕێ بە (دینمیت)ی شارێ بەربا ئەدەن! ژێربەرەو ژووری ئەكەن، بەكەمێ غازی (مُخنق) (عالم)ێ ئەخنكێنن!

سەیری بەدبەختی (بشر)، دوو (فرقە)ی ملایان یەك (نوع) یەك (دین) لەسەر (ملائكە) بووینە دوژمنی یەك؟ قسەی ناشیرین لە (تفسیر) دەربارەی یەك ئەكەن!

﴿يَوْمَ نَدْعُو كُلَّ أُنَاسٍ﴾ لە (أتباع)ی (شیطان)و (عِباد الرحمن) ﴿بِإِمَامِهِمْ﴾ (متبوع)یان (مُقتدی بە)یان ئەوانەش شتێكیان بەدەستەوە هەیە، پەیڕەوی بكەن. ﴿فَمَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ﴾ (كتاب)ی خۆی، (كتاب)ی خوای ﴿بِيَمِينِهِ﴾ بە (قوەت) و (إرادە) و (عزم) و (جزم) بێ (تَرَدّد) و (ریب) ﴿فَأُولَئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَابَهُمْ﴾ بە (كمال)ی (نشاط) و سەربەستی، بێ گرفت (خط)ی وی بە (أُمّی)یانیش ئەخویندریتەوە، وەك (صُوَر) ﴿وَلاَ يُظْلَمُونَ فَتِيلاً﴾ (أدنی) (فتیل)ی ئەو پێستەیەی لەناو قەڵەشتی ناوكەقەسپا.

(تفسیر)ی (إمام) بە (أُم) چونكە هەموو كەس لە (قیامەت)ێ بە ناوی داكی بانگ ئەكرێ، بۆ (خاطر)ی (عیسی) و (حسن) و (حسین) و (رعایەت)ی (أولاد)ی (زِنا)، وەك (كشّاف) ئەفەرموی (بِدعەت)ە، (حقیقة) بێ (معنا)یە، لە (عَرصات) (خاطر) و خوطر نیە. (عیسی)ی (صاحب الدَعْوا) لەوانە نیە. (حسن) و (حسین) (نقص)یان لە (نسب)ی نیە، (علی) لەوانەیە، بە (نسبەت)ی (إفتخار) بكرێ. ئەوەی (حسن) و (حسین) بناسێ ئەزانێ (قُرّة العین) (زهرا)نە. لە وەقتی (نزول)ی ئەو (آیەت)ە، ئەوان نەبوو بوون، ئەگەر (روایەت) هەبێ، بۆ (إفساد)ی (روح)ی (آیەت)ە.

قسە لە بانگ كردن بە ناوی باب یا داك نیە، (توجیە) هەڵناگرێ لە (ربط)ی (آیەت) و (تفسیر)ی دوای (دعوەت) ئەڵێن: چی؟ پیرەژنی قوڕ بەسەر (قباحەت)ی چیە؟ وە(ولد)ی (فطری)یە یا (شرعی) نەبێ. ﴿وَمَنْ كَانَ فِي هَذِهِ أَعْمَى﴾ بێ (كتێب) بێ (هِدایەت) (أعمال)ی (كیفی)، بێ (قید) و (حساب)، (حركات)ی نا (مُنتظم)، (حاصل)ی بێ (بصیرەت) بێ ﴿فَهُوَ فِي الآخِرَةِ أَعْمَى﴾

كۆرە، نابينی (دفتر)ی (أعمـال)ی بخوێنێتـەوە، وەلـەترس و (خجالـەت) ڕووی تێ ناكا نازانێ ﴿وَأَضَلُّ سَبِيلاً﴾ بـە چ ڕێـیـە خـۆی دەركاتـەدەر، قورتـار نـابێ ﴿وَإِنْ كَادُوا﴾ ئەو (أعْمی) بێ (بصیرەت)آنە فێڵیان كرد لە توو ﴿لَيَفْتِنُونَكَ﴾ بە (هِلاك)ت بەن، یەعنی بۆ (إضـلال) بـە (بـصیرەت)ن، بـۆ (هـدایـەت) تـا بلّـێی كۆرن، نابینن، حتّی (إقـدام) ئەكـەن بـە (حیلـە) كـاری، هـەڵت خەڵـەتێنن، بـۆ (جلب)یان، (نوعاً ما) (رعایەت)ی (عَنعنـات)یـان بكـەی، بیكەیـە (سیاسـەت)ێ (دینـی)، (لاشـك) (جنـابی) (نَبـوی) زۆر ئـارەزووی هـەبوو، گەورەگـەورەكان (مُسلّمان) بن – چ لە (قریش)، چ لە (ثقیف)، (وَلَوْ) (مَیـل)ێ (شـدید) و (حـق) دار بوو، چونكە ئەیزانی (عَوام) (تـابع)ن، (بَقـا)ی ئەوانـە (صَـدّە) (سَـدّە)، بـۆ (دین)ی (مُبین)، بەلاّم ئەوانیش ئەیانزانی، ئەو (میل)ەی هەیە، لـەو (جِهـەت)ە تەمایان بوو، (خدعە)ی لێ بكەن، (حقیقـة) ئـەمر (جهـەت)ە زۆر (دقیـق)ە، بـۆ (إبـادَ)ەی (دیـن). (لازم)ە ئاگـاداری بكـەین، بـە فێـڵ (صـرف)ت نەكـەن، لات نەدەن ﴿عَنِ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ﴾ ئـەوەی ئـەوان لایـان گرانـە ﴿لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُ﴾ ئی بە (كیف)ی وان ﴿وَإِذًا﴾ ئەگەر وات كردبـا ﴿لاَّتَّخَذُوكَ خَلِيلاً﴾ وەك (هُدْنە)بە (دینی)، (مُحبّەت) پەیا ئەبوو، (سوء)ی (تفاهم) نەدەما. ئێستا لەبەر (بُغـض) (إیمـان) نایـەنن، كـە (خُلّـەت) پـەیابوو هـەمووی ئـەبن بـە (تـابع)ی (جنـاب)ی (رسـالەت) پـەناه. لەسـەر ئـەو (میـل)ە (شـدید)ە، بـەو (تـدبیر)ە، ڕەفتاری كردبـا، دوورنـەبوو ﴿وَلَوْلاَ أَنْ ثَبَّتْنَاكَ﴾ بـە (بیـان)ی (كیـد)یـان، بـە (شدّەت)ی (كفر)یان، بە (فوات)ی (إستعداد)ی (إیمان)یان، بە (عُمر)ی (دنیـا)و (آخرەت)یان ﴿لَقَدْ كِدْتَ﴾ نێزیك بووی ﴿تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ﴾ (میل)یان بكـەی ﴿شَيْئًا قَلِيلاً﴾ (میل)ێ كەم ﴿إِذًا﴾ ئەگەر (میل)ت كردبان –(ولَـوْ) كـەمێ– ﴿لأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الْحَيَاةِ وَضِعْفَ الْمَمَاتِ﴾ دووچەندانەی (عذاب)ی (دنیا)و (قیامەت)ت پـێ ئەچێژین، ڕەنجەڕۆ ئەبێ، ئەو هـەموو (مـشقّەت)ە تـا ئێـستا بـە (هَـدَر) ئـەڕوا، (حیرەت)و ئەندوە، قات قات زیاد ئەكا! ﴿ثُمَّ لاَ تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا﴾ (حق)ت لای ئێمـە نامێنـێ، كـەس نابـێ لەسـەر ئێمـە (نـصرەت)ت دا؛ دەسـتەو ئـەژنۆ

(مُعطل) ئەبێ، ئەوانە یارویاوەری ودۆستیت ناکەن، بە جاریێ (نظر) بـە (عـالَم) قسەی خۆیان ئەبەنە سەر، ئەوە بێ (ثُبات)ە (أساساً) (إدعّا)کەی (واهی) بوو، تەماشای دوێنێ لە چ (طَور)ێ دابوو، ئەمڕۆ لە چ (طور)ێ دایە؟! ئەوجا کـەس ڕووت تـێ ناکـا! ﴿وَإِنْ كَـادُوا﴾ بـاز هـەر کـۆرن هـەرکۆن، ڕێ نابـەن بـە شـت ﴿لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ الأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَـا﴾ ئـەرزی خـوای (دنيـا) بـە (قتـل) يـا ئەرزی (مَكّة) بە (تبعيد)، (مجبور)ت کەن بڕۆی، یـاخود، بـە (طـرز)ێ سـووکت کـەن، (جبـل)ێ (شـديد)ت پـێ بکـەن، لـە جـێ ی خـۆت هـەڵ کـەنن، بـۆ لای (مسجدالأقصى) (سَوق)ت (کەن) (مادام) توو لێرە خوا شەو ڕۆی پێ کردی بـۆ (طـرف)ی (قـدس)، دیـارە لـەوێ (مـەرام)ت پێـك دێ، (إيمـان)ت پـێ ئێـنن، بە(قوەت)ئەبی. دەگەڕێیتەوە سەر وڵات، (فـتح)ی ئەکـەن ﴿وَإِذًا﴾ ئەگـەر وات کرد ﴿لاَ يَلْبَثُونَ﴾ نامێنن ﴿خِلاَفَكَ﴾ خەڵکە کە دوای توو ﴿إِلاَّ قَلِـيلاً﴾ زەمـانێ کەم، لەوێش خوا (أمل)ت پێك دێنی، یـاخود (معـاذالله)(آفـەت)ەکـت بەسـەر دا هات، خوا (مُتَأصِّل)ی ئەکردن ﴿سُنَّةَ مَنْ قَـدْ أَرْسَـلْنَا قَبْلَـكَ مِـنْ رُسُـلِنَا﴾ وابـوە لەگەڵ قەومان – بعد الی ب – خوا (نصرەت)ی (رُسـل)ی خـۆی دایـە، (أعـد)ی فەوتاندنیە ﴿وَلاَ تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلاً﴾ ئەگـەر چـی (ممکـن) (عـادەت) بگـۆڕێ (أمّـا)خـوا ئـەو (عـادەت)ە نـاگۆڕێ، (عاقبـەت)بـۆ تـووە ﴿أَقِـمْ الـصَّلاَةَ﴾ بـە (دوام)نوێژ بەجێ بگەیەنە، بـە تـەواوی ﴿لِـدُلُوكِ الـشَّمْسِ﴾ (زوال)ی لادانـی لـە (نصف النهار)، لە (غُروب)ی لە (أفق) ﴿إِلَى غَـسَقِ اللَّيْـلِ﴾ (أوائـل)ی تـاریکی، (شدّەت)ی تاریکی شەو، بە ڕوناکی بـە تـاریکی، ڕوو لـە خـوا کـە، (فـرائض)ی (إلهي) (أدا)کە﴿وَقُرْآنَ الْفَجْرِ﴾ (إعتناء)بە ئەو کـە، (قـرآن)بخوێنـە. لـەو (نـوع) (أوقات)ە و: (خلوەت)ە، (خالی)یە دڵ (جمـع)، (وقـت)ی (ذَهـاب)ی (سـواد)ی (ليل)و (إقبال)ی (نور)ی (نهار)ە ﴿إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾ (مـشهود) بـۆ (قارِء)ی، دەرکەی (إستنبـاط)ی بۆ ئەکریتەوە زێـدە (تعمّـق)ی بـۆ پـەیا ئـەبێ، شتی وای بۆ ئاشکرا ئەبێ لە (أوقات)ی دیـدا نـابی، (ذهـن)و (بطـن) (فـارغ)ن، لەسەر (قوّەت)ن، (وقت)ی (شهود)ی (ملائکە) نیە،ئەمە بۆ (مدینە) بێ ﴿وَمِـنْ

اللَّيْلِ﴾ پێشی (فجر) ﴿فَتَهَجَّدْ بِهِ﴾ به (قرآن) پیٚ ی بەخەبەر بە، (مُواظبة) بکە لەسەر (قرائەت)ی (قرآن)، دڵت بە (بَشائر)ی (إلهی) زێتر ئەگەشێتەوە ((رُسُخْ) ئەبەستیٚ، (ثبوت)ت بۆ پەیا ئەکا ﴿نَافِلَةً لَكَ﴾ زێدەیی بۆ توو ئـەبی، (دوام)کـە لەسەر (عبادەت) و (قرائەت)، (أهمیەت) مەدە (کید) و کـاری (أعـدا )، لەسـەر (دعوەت) و کاری خۆت (إستمرار)کە، (رُکون)و (میل)یان بەلاوە مەکە.

ئەو (نافله)ی که له (حدیث)ی (قدس) ئەفەرمویٚ:

(لا یزال العبـد یتقـربُ إلیَّ بالنّوافـل)لـە (بحـث)ی (روح) (تفـصیل) (عـرض) ئـەکریٚ ﴿عَـسَى﴾ ئومێـد نێزیکـە (عَـسی)ی خـوای لـە (جـزم)ی (ملـوك)آن بـە (قوەت)ترە ﴿أَنْ يَبْعَثَـكَ رَبُّـكَ﴾ وەك (بحـث)ی (بعدالموت)، پـاش ئـەو هـەموو (أذیـەت)و (مـشّقەت) و (مـرارەت)ە، دوای ئـەم هـەموو (زلّـەت) و بـیٚ هێزیـە، نێزیکـە بتنێرێتـە ﴿مَقَامًـا مَحْمُـودًا﴾ پێـت (عطـا) کـا (مقـام)یٚ کـە (أوّلـین) و (آخرین) بە (نظر) ئەو (مقام) (عالی)یە هەر (ثنـا) خـوا نیـت بکـا، ئـەو (مقـام) چیە؟ لە کویٚ ئەبیٚ؟ دووایٚ (عرض) ئەکریٚ ﴿وَقُلْ رَبِّ أَدْخِلْنِي مُـدْخَلَ صِـدْقٍ﴾ هەر کاریٚ بـیٚ، هـەر دیٚ و شـاری بـیٚ، بمهاویـە، هاویـشتنیٚ چـاك، راسـت، بـیٚ (میل)ی (فاسد)، بیٚ گۆران ﴿وَأَخْرِجْنِي﴾ وەدەرم خەی لیٚ ی، بۆم پێك بێنی، لە (عهد)یٚ بم ﴿مُخْرَجَ صِدْقٍ﴾ پاك خاوێن، نە لەبـەر (زلّـەت) و بـیٚ (قـدرەت)ی (مـأیوس)بم، نەلـە (عـزّەت) و بـە دەسـەلاّتی (مغـرور)بم، یـەك (نَـسق)یـەك (مَشرب)بم ﴿وَاجْعَلْ لِي مِنْ لَـدُنْكَ﴾ لـە (طـرف)ی خـۆت ﴿سُـلْطَانًا﴾ (قـوەت)یٚ (عزەت)یٚ (غلبـە)یٚ ﴿نَـصِيرًا﴾ لەسـەر (أعـدا)ی (دیـن) بەتـەواوی بەسـەریاندا (غالـب)م کـا، بـیٚ گـۆڕانی خـۆم (یاأیّهـا الرسـول) ئـەوا (دُعـات) (قبـول) بـوو، (إمداد)م دای، ئەو ڕۆژەبە چ حالیٚ چوو یە دەر لە (مکە)؟ ئەمرۆ بە (عـسکر)یٚ (جـرار) (١٢) هـەزار مـەردی نامـدار، هیێنامیـەوە (مکـە)، لـەو دەم، (بـت) و (أصـنام) بـانگ کـەی﴿وَقُـلْ جَـاءَ الْحَـقُّ وَزَهَـقَ الْبَاطِـلُ﴾ (حـق) (راسـخ) بـوو، (قرار)ی گرت، بت و (أصنام) شـکان، (باطـل) نـەما، (روح)ی دەرچـوو، لەبـەر غەم و (حزن) و (أسف) و خەفەت. ئەم (آیەت) لە (مَقوله)ی (لَتُنبِـأنَّهمْ بـأمرهم

هـذا)ى (يوسـف)ە ﴿إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا﴾ گەرچـى نـەختێ (دوام) ئـەكا، (آخر)ى (مُضْمَحِل) ئەبێ، ئەمرێ ئەو رۆژەی لە (مقام)ى (محمود)لە (بـين)ى دوو لادەركەی (كعبە) رادەوەستى ڕوو بەو (أعدا)يانە، كە تا ئـەمڕۆ ئـەوەی لـە (قدرەت)يان هـات، درێغيـان نـەكرد، بـۆ (إضـمحلال) و (إضـماد)ى (ديـن)، وە (نفس)ى توو، بڵێ: "إِذهَبوا فأنْتُم الطُّلقاء " (أصحاب)ى (هِمَم) (نوى النفوس العاليە) ئەزانن، ئەو (مقام) چەند بڵندە، چەند خۆشـە، دواى ئـەو (ذِلّـەت) ئـەو (عِزّەت) ئەو دەسەڵاتە ! دواى ئەو بێ هێزيە لەسەر ئەو دەسەڵاتە، ئەم (عفـو)و آزاد كردنـە، خوايـە چـيە؟ چ (لـذّەت)ە؟ (حقـا)ئـەوە (مقـام)ى (محمـود)كـە (لايـق)ى ئـەو (مَقـام)ە بـێ. ئـەمڕۆش (مُستـشرقين)ى (ئاوروپـايى)(ثنـا)ى (جناب)ي (رسالەت)پەناە ئەكەن، لەسەر ئەو (عفو) و (صَفح)ە، ئەڵێن: ئەگـەر (حضرەت)ى (محمد) (أدني) (حسّ) و (خيال)ي (إنتقـام)ى هـەبا، ئـەو سعاتە هەمووى (إعدام) ئەكردن. (مقـصد)ى بـەس (إعـلا)ى (كلمـە) (حـق) بـووە، وە (مـدح)ى (رسـالەت) پـەناە ئەكـەن ئـەلێن: ئـەوێ ڕۆژێ كـە دەركـرا لـە (مكّـە) لەسەر چ (ميل) و (مشرب) و (حُسن)ى (خُلـق) و (تواضـع) بـووە، ئـەوێ رۆژى كـە بـە (١٢)ە هـەزار (عـسكر)ى (جـرّار) (فـتح)ى (مكـە)ى كـرد لەسـەر ئـەو (مشرب)ە نەگۆرابوو.

(كِبر)ێ (ميل)ى (إمتيان)ێ (تحويل) (فكر)؟ (حاشا)، ئەو (ذات)ە نە لەگـەڵ خـوا، نـە لەگـەڵ (بـشر) (خـائن) نـەبوە. (مـدخل) و (مخـرج)ى (صـادق)ى بووە.ديارە (مقام)ى (محمود)ى رۆژى (قيامەت)، (حقّا) لێرە (مقام)ى نيە.

(إيمان)م هەيـە، (مقـام)ى (محمـود)ى لـە (دنيـا) و (قيامـەت) بـۆ هەيـە. يا (ربیّ) زۆر (شُكر)كە ئەو (مقام)ە (محمود)م چەنگ كەوت، ئـەو (آيـەت)ەم بـەو (نوع) بەو (نَظم) (تفسير) كرد ﴿وَنُنَزِّلُ مِنْ الْقُرآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ﴾ (شـفا)ى دل دەدا، (ترديد) نايەڵێ ﴿وَرَحْمَةٌ﴾ (كما ترا) جێدار بێ ﴿لِلْمُؤْمِنِينَ﴾تێ ى بگـەن، (إقتدا)ى پێ بكەن. توخوا ئەمە (مناسبە)ى لەگەڵ (قيامـەت)هەيـە؟ (إنـشا الله بە (بركەت)ى (قرآن)خوا لە هـەموو (أمـراض) (شـفا)مـان ئـەدا، بـە (صـدق) و

(صفا) و (إتباع)ی (حضرەت)ی (محمد مصطفى ئەکەوێتە (مقام)یَ (محمـود) بە (مسعود)ی ئەژیەین، (نائل)ی (ثنا)ی (دنیا) و (قیامەت) ئەبین ﴿وَلاَ يَزِيدُ﴾ قرآن ﴿الظَّالِمِينَ إِلاَّ خَسَارًا﴾ (هلاك) بە (امراض)ي (قلبی) و (قالبی) ئەبن، مایە پووچ دێنە دەر، لەبەر (تجاوز)ی بە (عکس)ی (قرآن) (عمل) ئەکەن بە (غیر)ی (نقص) چیدی نابینن، دەستیان ناکەوێ، قانزاج بۆ (أهل)ی (إیمان)، (نقصان) بـو (ظـالم)آن (أهـل)ی (طغیـان) ﴿وَإِذَا أَنْعَمْنَـا عَلَـى الإِنـسَانِ﴾. هـەر کەسـە بەگوێرەی حالّی خۆی إنعامیَ وا کە وَقعەکی هـەبیَ. ﴿أَعْـرَضَ﴾ إسـتغناء ئـەکا ﴿وَنَأَى بِجَانِبِهِ﴾ تەکبُر ئەکا دوور ئەکەوێتەوە لە جَوانب و أطرافي خۆی لا ئـەدا. خەلکی پیَ نەکەویَ، نعمـەت ئەکاتـە مـوجبی نیعمـەت لەبـەدەل ئـەدای شـوکر ئەبێتە باعثي كِبُر تكَبُرْ. ﴿وَإِذَا مَـسَّهُ الـشَّرُّ كَـانَ يَئُوسًـا﴾.زۆر نائومێـد ئـەبیَ. ئەمما ئینسانی حەکیم ئولـو العَزْم نـە لـە ئـەیامی نیعمـەت خـۆی لـیَ ئـەگۆریَ بەڵکو دائما خۆی بە موحتـاج ئـەزانیَ. زێـدە سـعی ئـەکا مـوکرَمُ و متـواضـعُ و صاحبي خیران ئەبیَ. وەنە لە ئەیامی نەقمەت و شـدّت مـەئیوس ئـەبیَ بـەڵکو. وثوقي زیاد ئەکا جەزم بە نەجات دا دێنیَ، ئەتو لە وانـی ناگۆرێـت. هـەر چـەند شەرو تـەنگي و ناخۆشـی دەورت لـیَ دا مـەئیوس نـابی. ئەمـەلت وثوقـت زیـاد ئەکا. ﴿قُلْ كُلٌّ﴾ لە طرفين مُتَغیُر و ثابتْ. ﴿يَعْمَلُ عَلَى شَاكِلَتِهِ﴾ لەسـەر مـەیل و مەشرەب و تەبیعەتی، قووەت و ضعفي نەفسی، ئەحوالی ڕوحی، ﴿فَرَبُّكُمْ﴾. ئـەوەی ئێـوەی خـەلق کـردی یـە مقتـضای طبـعُ مـەیلتان ئـەزانیَ. وە ئـەزانیَ ئەصلی تینەتان چۆنە؟! طبیعەتی نائی یەتان بە چی پەیا بووە؟ وە موحکـەم کراوە. لەبەر ئەوە ﴿أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَى سَبِيلاً﴾. ئینسان کـە تەماشـای صـونی بەشر ئـەکا تَفـاوتْ ئەوەنـدە زۆرە. بـەینیان ئەوەنـدە دوورە، نزیکـە بڵـیَ ی:— نفـوس صـنونی موختـەلفی بألماهیـەتن. ئـەو عالەمـە حَـسْبَ الظـاهرْ متمـدن، ئینـسانن، ئـەممـا کـە لـە ئـەحوالاتی روحیـە و طبیعـەتیـان ئـەفکری، گـەلیَ موختەلفن. ئەبران متمدالعناصرْ بن إختلافْ بـە روحـە لـە أثرْ وا دەردەکـەویَ. ﴿وَيَسْئَلُونَكَ عن الرُّوحِ﴾ کە مەداری إختلافی بەشەرە ئەوە چی یـە؟ ئـەو روحـی

کە مەداری حیاتی حیوانی یە حەقیقەتن نازانرێ. وە إختلاف لەوە دا نی یە، هەموو ئینسان بەڵکو حیوان، لە ماهیەتی تامی ئەو روحە شەریکن. لکنْ إختلافْ لە شتێ ترە روحێ هەیە لە بەعزە ئەبدانی رجالی شواذ الأفراد کە لە طرفي هەموو بە شەرێ بە رۆوسی ئەصابع ئەژمێر ئەکرێن، موجبی حیرەتە، جای سؤال ئەوەیە! روحێکە! صاحبی إقدام ئەکاتە ئەمورێ وا مُوحیِّر العقولە. کە ئەڵێن:- ئەوە کاری خێردنی یە. روحێ لە شدَّەتی تەنگی حالاتی موجبی مەئیوسی. وثوق و ئەمەل ئەداتە صاحبی. مُطْمَئن القلبْ جازِمْ، مُنشَرحَ الصدر بە نجاحُ و نەجات. نشاطي بێ فتور ئەدا، ماندی نابێ، بە کەمالی صحَت و چالاکی سعی بە خاوەنی ئەکا. کاری وای لەبەر ئەچێ بە خیاڵ و وەهم دا نابێ. بە نەوعێ لە مضایق دەردەچێ، تَصوّر ناکرێ. ئەمە چی یە؟: مثلاً جەنابی رسالەت پەناە دیقەت کەن. لە حاڵی یەکی و تەنهایی، داعی إلى الله بوو. خزم و ((بیگانە)) عەرەب و عەجەم، رؤسای ئەدیانی و دووەلە دوشمنی بوو بێ کەس و یارو یاوەر. موقابەلەی کورەی ئەرضی راوەستا، صەبری گرت تێ کۆشی، تەحەمولی ئەو هەموو مەشاقەی کرد، سستی نەبوو، موفق بوو، تأسیسی دین و خلافەت و مولك و سلطنەتی کرد. ئەمە چ روحێکە! ئەو روحە چی یە؟ ئەو ذاتە بەو نوعە إدارە ئەکا. بنۆڕە ((موسی)) موقابەلەی کێ راوەستا؟ بەرابەری لەگەڵ کێ کرد؟ نلتێ بوو بە عصا بە حری شەق ئەکرد. ئاوی لەبەرد دەردەقولاند. صەبرو تەحەمولی لەگەڵ قەومی بعد النجاة والهدایة نهایەت مُودهشە. أبوبکر و عمر موحیرن، جەنگیزخان مُدهشە ئەمیری تەیمووری لەنگ، محمد چلبی، مصطفي کمال، صلاحی ئەیوبی، سلطان محمودی سەبوکتەگین، ئەسکەندەر، ناپلیون، بسمارك واشنطن حاڵی حاضر مۆسۆلونی ئیطالي، هیتلەری ئەڵمانی، کە لە کردەوەیان عەقل شێت دەبێ، وەکذا سعد زغلول. ئەمما غاندی کە ئەکتەری إعتقادلتی قەومی ملنگا بووە، لە مۆفەق بوونی سەر سور ئەمێنێ. رەزا شاش لە رجالی نادر حیسابە، مەرحوم (ملك فیصل)یش لەوانەیە، منیش لەمەسلەکی خۆم لله الحمد بە رجال

حیسابم، صاحیبی جەزم و عەزمم. بێ ماڵ و صحت و یارو یاوەر بە دڵی پڕ غەم بە ئیسیتلای عدو، بەبێ ئینتظامی ماڵ و بەو نوعە مواظبەم کرد و ئەیکەم لەسەر تدریس و وەعظ و تألیف، تغیُر دەبی زۆر شوکور، کەسێ تەفصیلی حالْم بزانێ تَحَیُرْ ئەکا چۆن بویمە مەلا. وە چۆن صەبرم گرت لەسەر مەلایەتی. بەڵێ ئەو نوعە نواتانە تَقَرُبْ بە نوافل دەکەن. ئومورێ زائیدە ئەکەن لەسەر موعتادە لەسەر قوەت، لەسەر حوکمی عەقل، وردە وردە موفق ئەبن، قووەت زیاد ئەکەن. تا صدامانیان بێنە سەر، قوی تر ئەبن. ئەوجا خوا خۆشی ئەوێن. ئەبێتە چاویان، ئەبێتە سمعیان، ئەبێتە قووەت و بَطْشُ حَرَکەیان. بەڵێ ئەوەی ئیمانی هەبێ. خوای وی عالِمە، ئەبێ تێکۆشێ بۆ شت زانین، خوای قدیرە ئەبێ بە قووەت بێ. بە قودرەت بێ، خوای موریدە ئەبێ بە ئیرادەو عەزم بێ، وەهکذا خۆی هەڵکێشێ. خوای خالقە، صانعە، عالِمە، موجدە، ئەبێ لەو عالەمە ئەثەرێ دانێ، صنعێ، إختراعێ، إظهار کا بە جێ بێنێ، لە حدیثی قودسی نەبَوی، تَقَرُبْ بە نافیلە ئەو جۆرە نافیلەیە یە. بە دوو رکاعەت نوێژو رۆژووی ئەیام سودو ئەیام البیض، حەقیقەتن رۆژووی ایام السود وایام البیض روحێکی هەیە، گەر تەماشای ئەیامی نەحث وسعد کەن نەگۆڕێن، وە بە پتەپتی سبحە و چاو قوچاندن و پەیکەرێ شێخ هێنانە بەر خەیاڵ و ریشی درێژو پان چ ناکرێ. نابینە خۆشەویستی خودای. وەك لە بعضە ئەبیاتی کوردیم دا ووتیە. خوا چ ئیشی بەریشی ئێمە نی یە، گەورەیە گچکەیە رەشە، سپی یە، بە ردێنی درێژو گرژو پان خۆشەویستی خودا دەبا ((جوو)) بان. بەڵێ خیالیون ئەو نافیلە شیان تێك دا بردیانەوە إتحاد و حلول، ئەقلی مِرآة و مظهرە بەڵێ ئەمما ئەبێ مِرآة و مَظْهَرْ بێ، صفاتی ئیلاهی ئەثری تیا دیار بێ.. تەماشای فەرق کە کەشفی ئەرضي (سمسە) بۆمە لەگەڵ کەشفی أمریکا بۆ دیانات کامیان بە نَفْع بوون. حەقا بە سعەتی ئەوهام و خەیاڵ دونیا مان لێ بووە ئەرضي سمسە. چارە؟ جوابی ئەو سؤالە ئەڵێ ی چی؟ ناچار﴿قُلْ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾. شتێکە خوا ئەی هاوێتە ناو قەلبی (إنسان)خۆی نەبی کەس

نازانی چیە (حتّي) لەبەر (دهشەت)ی خۆیان (بعض)ە (ئاورووپایی) ئەو (حالّ)، بە (جِبلەت) (تعبیر)لیّ ئەدەنەوە.

با بێینە سەر باسی (روح)ی (حیوانی)، (مدار)ی (حیات)، (مدار)ی (حِسّ) و (حرکـە)، (جـوهر)؟ یـا (عـرض)ە (حاصـل)ە لـە (إمتـزاج)؟ (جـوهر)یّ (داخل)ي(بَدن)ە، یا (خارج)ی؟

(جوهر)یّ (مُجرّد)ە، (تعلّق)ی بە (مادّە) وە نیە، وەك (شێخ)ی (إبن سینا) ئەفەرمووێ (أعمالی) و (غیر)ی (اعمال)ی (مادّیات)ە، (لکن) ئەو قسە لای من (مقبول) نیە، گەر چی هەموو (أدِلّە)یانم (تحریر) و (تقریـر) کـردوە: بارەهـا لـە (کُتب)ی (کلامّیە)بە (درس)م گوتیتەوە. وە زۆر تەماشای (شرح)ی (إشـارات)م کـردوە، (أدلّـە)کانیـان زۆر (واهـی)ن. وە لـە (أساسـاً) ئەگـەر (إنـسان) بـە (إنصاف) تەماشاکا، (موجود)یّ (خارجی) لەو (فضا)یە هیچ (فراغ)یّ (إشغال) نەکا، وە (نسبەت)ی (قُـرب) و (بُعـد)ی (حیّـزی) لەگـەلّ هـیچ نـەبیّ (مُحـال)ە، وەك (شێخ)ی (إبن تیمیە) ئەفەرمویّ: (فرق)ی نیە، بلّیّ ی:" نیە"یا لـە "حیّـز و مکان دانیە" بەلاّم ئەو (حکم) (نظر) بە (وجوب)ی (وجود) (إستحالە)ی نیـە. (ذات)نیـە. (واجـب الوجـود) ئەگـەر لـە (فـراغ) دا بـیّ، وەك (سـائر)ی (ذوی الأوضاع) لە (وجود)دا ئەویش (إحتیـاج)ی ئـەبیّ بـە (مکـان) و (حیّـن)، نابێتـە (واجـب الوجـود). زێـرا (وجـوب)ی (وجـود) (مُنـافی)یـە لەگـەلّ (حاجـەت)بـە (مُوجِد)یا (أمر)یّ (مُتَوقّفُ عَلیهِ) (وجود)ی بیّ، (مثلا) (وجود)ی (إلیهِ) بیّ، کە وابـیّ خـوا دەبـیّ (کـونِ)ی (فی الحیّـن) نـالّیّ. (أرواح) و (عقـول) (داخـل)ی (ممکنات)ن، (ممکن)بیّ (مکان) و (حیّن)،(ممکـن) نیـە، (وجـود)ی ببـی. (بنـاءً علي هذا) (وجود)ي (ارواح) و (عقول)ي (مُجّرد)ە (مُحـال)،(أکثـر)ی (مـتکلّمین) ئەلّێن: (جوهر)ی (لطیف)ە، (ساري)یە لە (بَدَن) ئەو (جوهر)ە (لطیف)ە چیە؟ (سؤال) نـابڕیّ بەوەنـدە (کشف) نـاکریّ وە (حُکما) و (مـتکلّمین) (إلهیّـون) و (طبیعیّـون) قـسەیان لـە (روح) کردیـە، هیـچی "(حقیقیـەت)ی دەرنەخـستیە! بـەلّیّ (بعـض)ی فـەرموودەیان (نوعَامـا) (ظـاهِر)ە (ئـەبیّ (روح) شـتێك بـیّ

(داخل)ی (ذي روح) بی، ئەوە (ظاهر)ە (ساری)بیٚ، (علامەت)یٚ وا دیارە، (حاصل)ی بە (غیر)ی (علامەت) چیتری لیٚ نازانین. (ممکن)ە (کشف)ی (ماهیەت)ی (حُکما)ی (طبیعیون) خەریکن. (جمع)یٚ (أهل)ی (علم) (تتبّع) ئەکەن، جار جار گر ئەبنەوە، (نتیجە)ی (بحث) (مجهول) (أمل)یان بە (کشف)ی هەیە. (أمّا) (غایە)ی وان بۆ (کشف)ی (روح)لە (غایە)ی ئیٚمە جوایەزە﴿وَمَا أُوتِيتُمْ﴾ ئەی (حکما) و (متکلمین) (إلهیون) و (طبیعیّون)، (مُوحِّد) و (مشرکون). (مؤمنون) و (کافرون) ﴿مِنْ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ (سبحان الله) هاوو هوووی و لاف و گەزافی (صوفی)یان و (حقیقەت)ی (قرآن) لیٚك دوورن. (علم)ی (محیط) بۆ خوایە، ناتوانیٚ (علم)یٚ وەکی (علم)ی خۆی، (قدرەت)یٚ وەکی (قدرەت)ی خۆی بداتە کەس، بۆ خۆی بە (إراد)ەی خۆی نیە تا بۆ خەڵك بە (إراد)و بیٚ بە خشیٚ.

(دائر)بە (احوال)ي (روح) (خبر)یٚ (صحیص)بیٚ (قال) و (قیل) پیٚمان بکات (على رأسِ والعين) (قبول)ی ئەکەین، (ذاتاً) (ملاذ) و (ملجئ)ی ئیٚمە (حضرت)ی (رسول)ی (کبریا)یە. ئەگەر حەزت لە زیادە (تفسیر) ە (مراجع)ە ی (تفسیر)ی (کبیر) و (روح المعانی)کە. (لکن) ئەو (روح)ی من قسەم لیٚ کردیە، ئەوان قسەیان لیٚ نەکردیە. (معَ أنَّهُ) ئەو (روح) (مقصود)ە (روح)یٚ کە (حیات)ی (ملائین) ئەدا، نەك (حیات)ی (شخص)یٚ (يُلقي الروحَ من أمره) لە (کُتب)ی (سالفە) دەربارەی ئەو (نوع) (رجال)آنە ئەڵیٚن: " پڕبوە لە (روح)ی خوا " (لکن) (مع الأسف) ئەمڕۆ (عالم)ی (إسلامیەت) کەسیٚکی وا (صاحب) (روح)ی نیە. ئەی (رسول)ی (أکرم) تۆ (شکر)ی خوا بکە، لەسەر ئەو (روح)، نەکەی (معاذ الله)بیدەیتە (نفس)ی خۆت، (إعتماد) لەسەر خوا نەکەی ﴿وَلَئِنْ شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ﴾ (وَحی) (فطری) (مرکزی) ئەو (روح)ەی کە (إلقا)ی (ضمیر)ی تووی کردیە، (ممکن)ە (حمل)ی کەینە سەر (قرآن). (ذاتاً) (روح)ی (محمد)ی لە (قرآن)، کە ئەو چوو، ئەویش ئەچیٚ لام وایە کە (طلب)ی (تبدیل)یان ئەکرد، بۆیە یان بوو ئەو (روح)ی نەمیٚنیٚ ﴿ثُمَّ لاَ تَجِدُ لَكَ بِهِ﴾

(الذي أوحينا إليكَ) ﴿بِهِ عَلَيْنَا وَكِيلاً﴾ (مُتعهّد)و (مُلتزم)ی (إسترداد)نین، ئـەڕوا ناگەڕێتـەوە. وەکـی ئـەڵێ (مَرَنجـانْ دلم راکـه إیـن مُرغـی وحـشی زُجایـه کـه بَرخاست مَشکیل نَشیند)ئەو (روح)یە (إعادە)ی بۆ (بَدَن) (مُحال)ە ﴿إلاَّ رَحْمَـةً مِنْ رَبِّكَ﴾ ئەوی ڕۆیی بۆت (إبقا)بکا، ئاگاداری (کیـد)ی (أعـدا)ی بـو فـەرمووی ﴿إنَّ فَضْلَهُ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيرًا﴾ زور گەورەیە لـە (جهـەت) (مکاسـب) و (مواهـب) ﴿قُلْ لَئِنْ اجْتَمَعَتْ الإنسُ وَالْجِنُّ﴾ گر بوونەوە (بالاتفـاق) ﴿عَلَـى أنْ يَـأْتُوا بِمِثْـلِ هَذَا الْقُرْآنِ﴾ کە (روح)ی (حیات)ی (إجتماعی)یە (روح)ی (تَرقی)یـە ﴿لاَ يَـأْتُونَ بِمِثْلِهِ﴾ بەوێنەی ﴿وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾ لە (قُوا)ی (قُوةِ الظهـر)یەك بن، بەهەر (طِران)ێ (کلام)دانێن ئەو (روح)ی (قرآن) ئەیـدا، ئـەو (تـأثیر)ی ئـەو ئەیکا، بۆ (تطهیر)ی (نفس)و (تزکیە)ی (عمل) و (نشاط)ی (سعی) (قابل) نیە، ئـەو بیـدا. ئـەو (أدب)ی (نزاکـەت)ی (نزاهـەت)ی (نظـم)ی ئـی (آیـات)ی ئـی (سُوَر)ی بە کەس (رعایەت)ناکرێ، (عـلاوە)ی (کُـلّ)ی (شـیء)ی بـیٚ (میلـی)یـە ﴿وَلَقَـدْ صَـرَّفْنَا﴾ بـە (أسـالیب)ی (مُختلفـە) ﴿لِلنَّـاسِ﴾ بـۆ (أنـام) ﴿فِـي هَـذَا الْقُـرْآنِ﴾ ئـەوا ئـەی بیـەی چـیە؟ ﴿مِـنْ كُـلِّ مَثَـلٍ﴾ (معـني)ي (بـدیع)، جـاي (إعتبار)و (إتعاظ)و (نافع) بۆ (بشر) وە چەند (معقـولات) مـانِ بـە (صـورەت)ی (محـسوسات) بـۆ (تـصویر) کـردن ﴿فَـأَبَى أَكْثَـرُ النَّـاسِ إِلاَّكُفُـورًا﴾ لـە (کُـلّ)ی (عصر)یّ وایە، (أسباب)ی چـیە؟ (نفـرەت)لـە (تربیـە)ی (صـحیح)؟ وە هـەلّ خەڵەتانـە بەشـتی سـەیرۆکە سـەیرۆکە، (عجایـب)و (غرائـب)؟ (مَـعَ أَنّـهُ) (حَـقُّ الانـصاف) (قـرآن) لـە هـەموو (آیـات)ی (دنیـا)بـۆ (إنـسان)باشـترە. (أصـل)ی (خوارق)بیّ کەڵکە، (مقصد)(بعد الخوارق) (تعلیـم) و (تربیـە)یـە ﴿وَقَـالُوا﴾ بـە (عناد) لەسەر ئەو (قرآن)ە ﴿لَنْ نُـؤْمِنَ لَـكَ﴾ بـە (تأکیـد) ﴿حَتَّـى تَفْجُـرَ لَنَـا مِـنْ الأَرْضِ﴾ لەو ئەرزە هیشکە، ئەرزی (مکە) (واد غیر ذي زرع) ﴿يَنْبُوعًـا﴾ کـانی یە گەروە، ئاو زۆر، ئاوی لـیّ دەرکـۆلّیّ ﴿أَوْ تَكُـونَ لَـكَ جَنَّـةٌ﴾ ئەوەنـدە باسـی باغات ئەکەی، چ (دُینـوی)چ (أُخـروی)ئـەو (جَنّـەت)ە ﴿مِـنْ نَخِيـلٍ وَعِنَـبٍ﴾ لـە هەموان بە (فائدە)ترن. باغیّ بـەراو ﴿فَتُفَجِّـرَ الأَنهَـارَ﴾ جۆگـان (جـاری) بکـەی

﴿خِلاَلَهَا﴾ لە ناو ئەو (جنەت)ە ﴿تَفْجِيرًا﴾ بەزۆری﴿أَوْ تُسْقِطَ السَّمَاءَ﴾ (معلوم)ە ﴿كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا﴾پارچە پاچە بەسەرماندا بەردەیەوە، وەکو (زَعم) ئەبەی کە ئاسمان پارچە پارچە ئەبێ، لەباریەك دێتە دەر، (کواکب) بلاو ئەبێتەوە ﴿أَوْ تَأْتِيَ بِاللَّهِ﴾ (سُبحانَهُ) ﴿وَالْمَلاَئِكَةِ قَبِيلاً﴾ (مقابل) ئاشکرا، یا (جەمات جەمات) لە (ملائکه)﴿أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ﴾ خانوێ ﴿مِنْ زُخْرُفٍ﴾ لە زێڕ وەك خانووی بە هەشت ﴿أَوْ تَرْقَى فِي السَّمَاءِ﴾ بە ئاسمانا هەڵچن ﴿وَلَنْ نُؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ﴾ (إیمان) نایەنین بە هەڵاچوون، بڵند بوونت، بۆ لای ئاسمان، لە ئاسمان ﴿حَتَّى تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَابًا نَقْرَؤُهُ﴾ (تصریح) بەڕاستیت بکە ﴿قُلْ﴾ یا (محمد) (ﷺ) ﴿سُبْحَانَ رَبِّي﴾ (الذي أسري بي) ﴿هَلْ كُنتُ إِلاَّ بَشَرًا رَسُولاً﴾ وەك (سائر)ی (رسول) ئەڵێم:"(بشر)م، وەخوا ناردومیە سەر ئێوە، (هدایەت) تان بدەم، (دین) و ئایینی باشتان فێرکەم " ﴿وَمَا مَنَعَ النَّاسَ﴾ ئەوانە و ئەوانی گوێ ئەدەنە قسەی وانە ﴿أَنْ يُؤْمِنُوا﴾ لە (إیمان) ﴿إِذْ جَاءَهُمُ الْهُدَى﴾ (عیاناً) دیارە، ڕاستە، (حق)ە بێ فرۆفێڵە، هیچ (منع)ی نەکردینە ﴿إِلاَّ أَنْ قَالُوا﴾ ئەوان کەسانی (مُعاند) و (مُتردّد)ن ﴿أَبَعَثَ اللَّهُ بَشَرًا رَسُولاً﴾ چۆن ئەبی (بشر)ببێتە (رسول)ی خوای؟ (ممکن)ە ئەو (قول)و یان (تأثیر)ی لە (خلق)ی دیش کردبێ﴿قُلْ لَوْ كَانَ فِي الأَرْضِ مَلاَئِكَةٌ﴾ لە جێ ئێوەبان ﴿يَمْشُونَ﴾ وەکی ئێوە (مشی) (حِسّ) و (معنوی) ﴿مُطْمَئِنِّينَ﴾ وەك ئێوە بە (لذّات) (مشغول) بن بێ (خوف) و (دغدغە)ی (آخرەت) ﴿لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِمْ مِنَ السَّمَاءِ مَلَكًا رَسُولاً﴾ (رسول)ی (بشر)ئەبی (بشر) بی، (مَلَك)چ ئاگای لە (حوائج) و (طبائع)ی (بشر)ە؟ بۆیە ئەگەر بێن (سُفرا)ن لە (بَین)ی خواو (رُسل)ی (بَشَر). (جناب)ی (رسالەت)پەناە (أساساً)بۆ (هدایەت)ی (بشر) ناردراوە، نەناردراوەتە سەر (جِن)، (أمّا) (جن)لەگەڵ (بشر) تێکەڵاوە، ئەوانیش (مخلوق)ی (أرض)ین، (إیمان)یان بە (رسالەت) پەناە هەیە، وا ڕێك کەوتوە گوێ یان لە (قرائەت)ی بووە، یاخوا ناردوونی. (مع أنّه)(حالاً) (إرسال)ی (رسول) بۆ (جن) (موضوع)ی (بحث) نیە (وَإلا)ئەوانەی (بعد رسول) (إشکال)

ئێنن (أمثال)ی وان، لە (وقت)ی (نزول) (إعتراض)یان لە (جناب)ی ئەگرت. (سبحان الله) (إنسان) کە کەوتە باسی جنۆکان، ئەڵێ ی شێت ئەبێ! ﴿قُلْ كَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا﴾ (رسول)ی ئەوم، (کافی)یە (شاهد)ی وی بۆ من ﴿بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ ئاگادارە (تبلیغ) ئەکەم، ئەوەی ئەو (أمر)کا بەجێ ی دێنم ﴿إِنَّهُ كَانَ بِعِبَادِهِ﴾ (علي الاطلاق) (داعی) و (مدعو)، (رسول) و (مُرسَلُ إليه) ﴿خَبِيرًا بَصِيرًا﴾ ئاگاداری (ظاهر) و (باطن)یانە. (حاڵ)ی (بشر) لەگەڵ یەك زۆر سەیرە، (مُعین) و (نصیر) و غەمخوازی یەکن، (حیات)یان بەیەك (مربوط). (مُصلح)ە کان بۆ (حیات)ی (إجتماعی) وەك (روح)ن، (إتباع)یان مایەی (حیات)ی (طیِّب)ە، کەچی چاویان هەر لە (غَیر) و، (حتی) (سجد) بۆ (شکل) بۆ (ثور) ئەبا، (إباء) ئەکا لە (إیمان) بە (رسالەت)ی (بشر)! ئەمە (چ) (روح)ێکی (خبیث)ە؟ بەو (درجە) (إستخفار)ی (بشریەت) ئەکا ﴿وَمَنْ يَهْدِ اللَّهُ﴾ بە (إرسال)ی (رسول) و (تشریع)یّ (دین)یّ (مُبین) و (نظر) لە (آیات)ی (أکوان) ﴿فَهُوَ الْمُهْتَدِي﴾ ئەگاتە (مطلب) نە (دنیا)ی لە (کیس) ئەچێ نە (آخرەت) (نائل)ی (طیِّب)ی(حالتین) ئەبێ ﴿وَمَنْ يُضْلِلْ﴾بە (مَیل) بۆ (تکبیّر) و (فساد) و (إعتماد) لەسەر (عقل) (أنَّهُ) (مُغنی)یە! ﴿فَلَنْ تَجِدَ﴾ (أبداً)﴿لَهُمْ أَوْلِيَاءَ﴾ (انصار) و (مُرشد) لە (آله) و (غیر)ی (آلە) ﴿مِنْ دُونِهِ﴾ (جَلَّ جلالُهُ وعَمَّ نَوالُهُ) ئەگەر رووی تێ کەن (هدایەت)یان ئەدا أما بۆ ئەولایە (توجّە) ناکەن ﴿وَنَحْشُرُهُمْ﴾ ئەو گومراهانە ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى وُجُوهِهِمْ﴾ رایان ئەکێشین لەسەر ڕوو ڕۆیشتن لەسەر ڕوو (ممکن) نیە، (أمّا) لە (مشی) وەکی وانن. (حدیث)ی (نقل) ئەکەن، نازانم بڵێم: "چی؟" هەر بڵێن: "هاوار لە دەستی (نقّال)ان! ﴿عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا﴾ کوێر، لاڵ، کەڕ ﴿مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ﴾ (مُستقر)یانە ﴿كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا﴾ بلێسەی (ساکن)بوو، پشکۆی (ضعیف)و کەم (حرارەت)بوو، بلێسەی (زیاد)ئەکەین، (حرارەت) بە (قوەت) ئەبی، دیارە (قوا)ی (جسمانیە)لە (آخرەت)یش کەم دەکا، (حاجەت)ی بە (إمداد)ە ﴿ذَلِكَ﴾ ئەوە ﴿جَزَاؤُهُمْ﴾بە (سبب) ﴿بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا﴾ بە (عناد) و

(تكبّر) ﴿بِآيَاتِنَا﴾ (قولی)و (فعلی) ﴿وَقَالُوا﴾ بیّ (توقّف) و (تردّد) ﴿أَئِذَا كُنَّا عِظَامًا﴾ (هیكل)یّ ڕەق و ڕووت ﴿وَرُفَاتًا﴾ رزیو ﴿أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا﴾ (خلق)یّ نویّ (مخلوق)یّ نویّ ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا﴾ نەیانزانیوە؟ ﴿أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ كە ئەو (عالَم)، بو (إیجاد)ی چ (علم) و (قدرەت)ێكی ئەویّ؟ كەسیّ بزانیّ (قادر) (خلق)ی ئاسمان وأرزی بكا. (لاشَك) ئەزانی (قَادِرٌ ﴿عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ﴾ (مُرَكَّب) لە (مقدار)یّ (عناصر)ی (مَحدود) و (مَحصور)ە وەقتی (إرادە) كا (إعادە)ی ئەكاتەوە. (أمّا) (إعادە)ی (معدوم)ی (صرف)هەر (تصوّر)ناكریّ. كەسی هیچی لە (عالم)ی (وجود) دانەما چۆن ئەلّیّ ی: "(إعاد) ئەكریّتەوە؟ " ئیّمە لە (عدم)ی (صرف) نەهاتینە (وجود)، بەلّكو ((مِنْها خلقناكم وَفِيها نعبدكم ومنها نخرجكم) هەرچەندە (إمام) لەگەلیّ جیّ ئەفەرمووی: "إعادەی (معدوم) (ممكن)ە" (لكن) (مُغالطە) ئەفەرمویّ (سعدالدین) لە (شرح)ی (مقاصد) لیّ ی (نقل) ئەكا (إعادە)ی (معدوم) (محال)ە) وە (حقيقةً) (بَديهّي الإستحالة)یە ئەگەر (تصوّر)ی (إعادە)بكەن، ئەوەی ئەیكاتە (نظری) (سهو)ە. (إثبات)ی (بدیهی)بە (نظر) نابیّ. (متكلمین) (خلاف)یان زۆرە، (قسم)ی (فنا) و (هلاك) ئەكەنە (عدم)ی (صرف)، ناشزانن ئەو (عالَم)ە چوو بیّتەوە(فنط ) بە چی (إفنا)ی كەن؟ (مُعتزلی) قسەیە بیّ (معنا)یان هەیە، (مراجع)ەی (كُتب)ی (كلامیە) كە. ﴿مِثْلَهُمْ﴾ ئیّمە (إدّعا)ی (عینیّە) ناكەین، ئەو (شُخص) (حتّی) بە (عین)ی(تركیب)ی (دنیا) دیتەوە، (حاشا) (لكن) (تركیب)یّ (مثل)یّ (تركیب)ی (دنیا). ئەوی بیبینی وەبی ناسی ئەلّیّ: " ئەوە (فلان)ی (بن)ی(فلان)ە! " ئەلّیّن: " كلیّجە ناررزیّ" نازانم (قول)ی (مُناف) (حسّ) و (مشاهدە)یە (ذاتاً) (إبطال)ی(حسّ)و (عقل) لایان زۆر (سهل)ە ﴿وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلاً﴾ مُدةً وەقت ﴿لاَ رَيْبَ فِيهِ﴾ شكی تیا نیە. ﴿فَأَبَى الظَّالِمُونَ إِلاَّ كُفُورًا﴾ إنْكار. غَيْري إنكار، إبا لە هەموو شت ئەكەن.﴿قُلْ لَوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَائِنَ رَحْمَةِ رَبِّي﴾ توخوا چ فَرقیّ هەیە، بۆ (لَوْ تَملكونَ أنتُمْ)، (لَوْ أنتُمْ تَمْلِكونَ)؟ هەرای تَقديرو تأكيد با عائدی عُلَماي عَرَبي بیّ! ئەگەر ئیّوە

بالْفَرض ببنه مالكي خاوەنی خَزائنی رَحْمةَ ربّي، دَفـأني خَزنـي رِزق و نِعمـەتـی خوای. ﴿إِذًا لَأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ الإِنفَاقِ﴾ أنـهُ لـه مُجَرّدي صَـرف كـردن ئەترسـن، مادام وابیٚ چ فائدەی هەیە؟ عیُون وَ جنّـات و زَخـارِ في دونیـا بـۆ نیـيە لـه جیّـی چاك صَرف بكریٚ!! خۆ ئيوه صَرفي ناكەن! ئەو إقتراحە، بۆ؟ – ئەو نَظمه لـه (إمام) وەرگیرا–. ﴿وَكَانَ الإِنْسَانُ قَتُورًا﴾ زۆر نَجیـل و ثَقیلـه، ئەوانـه! دیـارە هەموو إنسان وادانیٚ! وادەردەكەویٚ حُبّی دونیا، یەكە له مَوانعي إيمان! ئايات هـەر چـەند ببیٚ، چـەند ظـاهر و بـە قـووەت بـیٚ، كـەلك نـاكرن! ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَـا مُوسَى﴾ علیه السلام. ﴿تِسْعَ آيَاتٍ﴾ له أوائلي رِسالەت متَواليـاً نـۆ (٩) ئایـەتی دابیٚ. أوَل (عَصی)، دووەم (یَدي بَیْضـاء)، (٣) جَراد، (٤) قَمل، (٥) دَمْ، (٦) طوفان، (٧) بۆق، (٨) قَحط، (٩) وَباء ﴿بَيِّنَاتٍ﴾ ئاشكراو هوێداء. أمّا انْفلاقـي بَحـر، انْفجـاري عُيُـون، مَـنّ وسَـلْوی، احْیـاي مَیّـت بـه ضَـربي ثَـور، ئەوانـه بـۆ مؤْمنەكانە!! ﴿فَاسْأَلْ﴾ یا مُحّمد (ﷺ). ﴿بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ مُحبّي خَـوارق. ﴿إِذْ جَاءَهُمْ﴾ بۆ انقاذیان، ناردرا، بـۆ سـەر فِرعَـون. ئـەو ئایاتـە چ تَـأثیري بـوو بـۆ هدایەتي فِرْعَوني وه مَلائي فِرعَون؟ وه پاشدان خۆیان چ إستفادەیان لیٚ كرد؟ غَیری كفر و عناد، (أرِنا اللّـه جَهْرَةً)؟ ئەوانـەش ئەیانـەویٚ خـواو مَلائكـەتیـانبۆ ببینی. ﴿فَقَالَ لَهُ﴾ به موسى ى گوت ﴿فِرْعَوْنُ﴾ مُقابلي دَعْوەتَ و ئایات. ﴿إِنِّـي لَأَظُنُّكَ يَامُوسَى مَسْحُورًا﴾ ساحِريٚ گەورەی! ئـەو ئایاتـە هـەمووی سِـحرن! یـا سِحرت لیٚ كراوە و عَقلت تیٚك چووە! ﴿قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ﴾ تۆ پیاویٚ زانای عـاقلّی ئـەزانی. ﴿مَـا أَنـزَلَ هَـؤُلَاءِ﴾ ئـەو ئایاتـە قُمَـل و أمْثـالي. ﴿إِلَّا رَبُّ الـسَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ئەوە كاری سِحر نیە! ئەو ئایاتە خالقي ئاسمان و ئـەرض نـاردیتی! ﴿بَصَائِرَ﴾ موجِبي بَـصیرەتـه، ئایـات و حُجّتـه، لـه سـەر راسـتی مـن! ﴿وَإِنِّـي لَأَظُنُّكَ يَافِرْعَوْنُ مَثْبُورًا﴾ به میلاك ئەچیٚ، حَقایق ئەكۆپیٚ، عَلامەتی لیٚ كۆرانـه! حَقّاً حَضرەتي (مُوسي) زاتیٚ گەورە عَظیمُ الشّأن بووە، له نَوادِري رِجالي تأریخ مَعدودە، موجِبی فَخـره بـۆ (مِلْیـون)!! إنـسانی لـەو قَوْمـه لـەو مَقامـه مُقـابلي فِرعَون مَلِكي مِصر إلاهی مِصریان (توت غَنج ئـاموون)، وا بەرانبـەری بكـا، بـیٚ

ئەندێشە بێ دەهەشەت – اللّە راستی جای حیرەتو دەهەشەتە –!! لە حَضرەتی عَلي مَنْقوله لە (عَلِمتُ) بە ضَمّي (ت)ي ضَميري خِطاب، خِطابي موسی لەگەڵ خۆی! – حَقيقَةً قرائەتێ بێ وَجه نيە–. أما إنكاري قرائەتي جَمْهور، بيَ مَعْنايه!! وه حَمْلي ئايات لەسەر أحْكام نهی لە شرك لە زنا لە قَتلي ظُلْم لە دزێ لە سِحر لە سِعايه لە قَذف لە فِراری مِنَ الزحف خاصةً يَهودی لە إعْتِداي في السَّبت، لێرە لام جوان نيە – وَ لَوْ حَديثيَ نَقل ئەکەن وە تَوجيهي ئەفەرموون–! وه ئەو أحْكامە پاش خُرُوج لە مصر وە هەنگامی نُزُولي تَوْارة وإعْطاي ألْواح بۆ أُمَّتی ایجابە هاتووە! ﴿فَأَرَادَ﴾ (فرعون) ﴿أَنْ يَسْتَفِزَّهُمْ﴾ (محوي)يان كا ﴿مِنْ الأَرْضِ﴾ بێ ناو ونيشان بمێنن (أمّا) (إخراج) لە (مصر) (فرعون) (مانع) بوو لە (خروج)يان ﴿فَأَغْرَقْنَاهُ وَمَنْ مَعَهُ جَمِيعًا﴾ ئەوانی تووش (إزعاج) ئەکەن، دەرت کەن لە (مكّه) خوا شەریان لە توو (دفع) ئەکا ﴿وَقُلْنَا﴾ بە (وحی) بو (موسی) ﴿مِنْ بَعْدِهِ﴾ پاش (فرعون) ﴿لِبَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ ئەو زەبوو نانەی لە دەست (فرعون) قوتار بوو بوون. ﴿اسْكُنُوا الأَرْضَ﴾ لە ئەرزی (مصر) ئارام گرن، ببنەوە گەورە، (قبله)ی (أنام) نەيان كرد، ئەوجا هەڵاتن بۆ (ارض)ی (موعود) ﴿فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ الآخِرَةِ﴾ كە (إسكان)تان كە لە أرزی (مقدس)ی (فلسطين) ﴿جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفا﴾ بە (جماعەت)ی پێچراو لە (قبائل) و (أسباط) ئەوە وا، (بنی إسرائيلی) دووای (تفرقه)ی دووەم لە (جزيرە) خۆيان گرتەوە، (قوّەت)ێ تەواويان پەيا كرد، تا (حضرەت)ي (رسول)ی (أكرم)هەناردرا، لە هەموو کەس خراپتر بوون لە (حق)ی. (جناب)ی (رسول) (موفق) بوو تارومارى كردن. (ألان) (عالَم) بە (يهودي) خەريكن لە هەموو (دولەت)آن دەريان ئەکەن. لەو رۆژانە (هتلر) پاش (بلع) ی (آوستريا)ی (أمر)ی دا بە (طرد)ی (يهود)، (ثروەت) و سامانيان، ميرات. (غير)ی (إنكلتر)ە كەس (معين)يان نيه، تەمای هەيە لە (فلسطين) (تشكيل)ي (حكومەت)يان بۆ بكات، لەگەڵ (عرب)ي (مسلمان)آن شەڕو شۆڕيانە. (عاقبەت) (مجهول)ە ﴿وَبِالْحَقِّ أَنزَلْنَاهُ﴾ بە (حق) مان (نازل) كرد، چی؟ (قرآن). ﴿وَبِالْحَقِّ نَزَلَ﴾ بێ (تغيير)

و (تبدیل)، دەست تێدانی جنۆکەو (شیاطین)، بی خوێنەوە، تێ ی بگە، ئەزانێ (آیەت)ێکی (قورآن) سەد (ملیون) (أُعجوبە)ی ئێنێ. بۆ (سعادت)ی (دارین) (کافل)ە، (موجب)ی (ترقی)یە، (باعث)ی خاوێنی یە (روح)ی (حیات)ی (إجتماعی)یە ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ مُبَشِّرًا﴾ (لِمَنْ أطاع)هەرکەسێ بێ ﴿وَنَذِيرًا﴾ بۆ (عاصی) وە (لَوْ) (فلذە)ی (کبد)ت بێ، ئەمە خۆیەتی. (رسول)ی (أکرم) (رسول)ی خوایە، بێ (میل) و (محابا)یە، (کتاب)ی (هدایەت) نە (شانامە)یە نە (حکایەت)ە!

ئەڵێن: "(حضرەت)ی (علی) (عرض)ی کرد،، (منت خۆشتر ئەوێ، یا(زهراء؟) فەرمووی: " تووم لە کن (عزیز) ترە، (فاطمە)م لا خۆشەویسترە، وائەبێ" (رسول)ی (رب العالمین) تەماشای (أشخاص) ناکا، ئەنوارێتە (مَزایا) ﴿وَقُرْآنًا﴾ (عظیم الشأن)، (کثیر الآیاتِ والبرکاتِ) ﴿فَرَقْنَاهُ﴾ ناردوومانە، (نجماً، نجماً) پارچە، پارچە، (قطعە)، (قطعە)،(آیەت ئایەت) (سورەت، سورەت) (حسب الإیجاب) ﴿لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ﴾ (عارف) و (عامی)، (زکی) و (بلید)،بە(حِفظ) و بێ (حفظ) ﴿عَلَى مُكْثٍ﴾ لە سەرەخۆ بە (تأنّیٍ) تا (حفظ)ی‌کەن، تێ ی بگەن﴿وَنَزَّلْنَاهُ تَنزِيلاً﴾ خۆمان ناردوومانەتە خواری بە گوێرەی (وقائع) ﴿قُلْ آمِنُوا بِهِ﴾ئێوە (ایمان)ی پێ بێنن ﴿أَوْ لاَ تُؤْمِنُوا﴾ (إیمان)ی پێ نەیەنن، یەکە، (أهمیّەت)ی نیە ﴿إِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ﴾ (علم)ێ بێ (غشٍّ) و (نافع) ﴿مِنْ قَبْلِهِ﴾ پێشی (نزول)ی (قرآن) لە (عُلما)یانی (خُلّص)ی (أدیان)ی (سالف)ە ﴿إِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ﴾ (وقت)ی (قرآن)یان بەسەردا بخوێندرێتەوە ﴿يَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ﴾ لەپەو ڕوو بەسەر چەنەگەدا ﴿سُجَّدًا﴾(أنَّهُ) بێ (إختیار)ن، (زمام)ی (إرادە)یان لە دەست نەمابوو، بۆیە بەسەردەم و چەنەگەدا ئەرمان ﴿وَيَقُولُونَ﴾ لەو (وقت)ە ﴿سُبْحَانَ رَبِّنَا﴾ پاکی لە هەموو (نقصی)، (سیّما) (خُلف)ی (فی الوعد) ﴿إِنْ كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا﴾ بەهەرچی هەبێ، لێرە (وعد)ی بە (إرسال)ی (رسول)ێ (یَأتی مِنْ بَعد) (مُصَدّق)ی (کُتب) و (رسالەت)ی (أقدمین) ﴿لَمَفْعُولاً﴾ کراوە (مُحقّق)ە، بێ (منع) و (مُعارض)ە یە

﴿وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ﴾ ئەگریەن ﴿وَيَزِيدُهُمْ﴾ (قرآن) (مرَّةَ بَعد أُخرى) ﴿خُشُوعًا﴾ (إمام) (تفسیر)ی (خشوع) بە (تواضع) ئەکاتەوە. (حقیقةً) (إنسان) گوێ بداتە (قرآن) (حال)ی (مُتکبِّر) آن تێ بگا (تواضع)ی ئەبێ وە (زیاد) ئەکا ﴿قُلْ ادْعُوا اللهَ﴾. أیها الخاشعون، الساجدون، الباقون. ﴿أَوْ ادْعُوا الرَّحْمَانَ﴾. بە صیفەتی مَرحَمەت یادی ئەکەن هاواری ئەبەنە بەر. یا بە إسمی جلالة مَحضْ ئەتۆرِنە ذاتی أقدَسْ. حیساب یەکە. ﴿أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى﴾ ئەوەی دەلالەتی لە کمالی کبریائی کرد چ بە حَسَبْ ذاتْ چ بە إعتباری صفات بیکەنە عنوانی دوعاو پاڕانەوە هەر وەصفە مقامێ موناسبی هەیە، کە سێ ئەکەوێ ئەلێ یا حافظ. ئاشوبی رووت تێ ئەکا ئەلێ ی یا ستّار.. وهکذا. أسمای خوای أشاعرە ئەلێن تَوقیفیە مُعْتزلە ئەلێن توقیفی نی یە. لام وایە ئەو آیەتە مُساعدەی مُعتَزلیان ئەکات. زێرا لە ئەوائلی نزولەوە جنابی رسالەت أسمط الله بەیان نەفەرمووە و. لە عدوێ حصری ((حصری)) نەکردی یە. ئەگەر ئە شاعیرە إثباتی حصر کەن قسەی وان ئەچێتە سەر. ﴿وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ﴾ یا محمد یەعنی بە قرائەتی ما في الصلاه من القران. ذاتاً مقصد لە نوێژ قورئانە. ﴿وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا﴾ زۆر بە بەرزی مەخوێنە لەو مەیانە بە دزی موجبی خشوع و خضوعة بە تأنّي، هێدی قورئان بخوێنە. بەسەر خەلك و لە نوێژ. ﴿وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ﴾. جەهرو خُوفی بە ﴿سَبِيلا﴾. رێ وەسط ﴿وَقُلْ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا﴾. نەنێر نە مێ، نە لە مەلەك نە لە ئینس، ئەو ئایەتە خاتمەیە بۆ سورەت. مُقَدمەیە بۆ سورەتی آتی. ﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ﴾. نە لە ئیجاد نە لە تەدبیر. ﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُ وَلِيٌّ مِنْ الذُّلِّ﴾.دیارە وەلی بۆ خوا پەیداکردن دەلالەت لە نولي ئیلاهی ئەکا تەمام. خودا وەليٌّ و ناصر مُعَینٌ، حافظٌ، متصرف في العبادَ. کەس وەلی خوا نی یە ((إن كلَ مَنْ في السموات والأرضِ إلاّ اتِ الرحمنَ عبداً)) وەکی دێ ی ﴿وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا﴾. تەعظیمي کە بە تەعظیمێ بەلیغ، شایانی شأنی کبریائی بێت. إمامی راضي ئەفەرمووێ تەواو بوو تەفسیری ئەو سورەتە. رۆژی سێ شەموو بەینی ظُهرُ

عَصْر رۆژی بیستەم لە مانگی مُحَرم لە شاری غەزنین لە سالی ٦٠١ هـ منیش ئەڵێم ((تەوا بوو تەفسیری سورەت کە مەکی یە علي أصَّح ِ الأقوال. وآیاتِ لە ((١١١)) زیاتر نی یە لە رۆژی سێ شەموو پاش عصری بیست و شەشی محرم لە شاری کۆیە سنە ١٣٥٧ هـ.. مطابق ١٦ی مارتی رۆمی لاکن وفاً بالعهد نەختێ باسی میعراج ئەکەین، خودا موفقمان کا ئامین. نازانم دائرْ بە إسْراؤ معِراج رسالەت پەناه بڵێم چی؟! جەمهور ئەڵێن بە جَسَدی موبارەکی بە بەخەبەری لە جوزئێکی شەوێدا چویتە مسجد الأقصی. لەویش ڕا رۆیی یە بۆ ئاسمانان الی ما شاءَ الله. بە أدنی مُدَتی هاتیتەوە. هەتا ئەڵێین ئەو دارەی لە چوونا بە جَسَدی مبارکِ وە کەوتووە وە کەوتیتە جەوەلانەوە لەو جوولانەوە نەکەوتی یە. جێ هەر گەرم بووە. ئەو نوعە قسە لە زەمانی سابقە بە ئاسانی قَبُولْ ئەکرا، نیسبەتیان بە قُدْرَتُ و ئیرادەی ئیلاهی ئەدا و ئەرۆیشتن. بەڵکو قسەی زۆر عەجایبتریان بێ موحاکەمە قەبوول ئەکرد. ئەڵێن قَطبی گەیلانی باسی میعراجی نَبَّوی ئەکا، گۆیا مُریدیکی مُقَرَّبی نەوعە ئینکارەکی دێتە دڵێ، ئەو شەخسە رۆژەکی جومعی لەوەقتی مؤذن گَەبار ئەکا لەسەر منارە، ئەچێتە دەجلە غوسلی جومعە بکات. دوو گردی شیخی لەگەڵ خۆی ئەبا لەناو ئاو سەری سێ جارە سەری دێنێتە دەر لە وولاتی تر، بە کەناری ئاودا دەروا پرسیار ئەکا:— ئەڵێن تۆ غەریبی؟ بەڵێ غەریبم ئێرە میسرە ئەو نەهرە نیلە، کابرا ئەچێتە شاری، لانی ((زێرنگری)). دادەمەزرێ کچی لێ موبارەك ئەکا. پاش مُدەی حَمْل و کورەکی ئەبێ، باز ئاوس ئەبێ کورەکی تری پاش ساڵێ ئەبێ باز ئاوس ئەبێ، زگی شەش مانگان ئەبێ، پیاوە ئەچێتە رۆخی نیل بۆ غوسلی جومعە، جاری سێ یەم سەر دەردێنێ لە کێ؟ لە دیجلە. ئەبینێ ئەوا جلی خۆی و دوو گردی شیخی کەماکان، ئەچێتەوە مزگەوت، کابرای سەر منارەی یالیلی یالیلتی یەتی. شێخ لە مجلسی خۆی هەڵناستایە موریدەکە سەری سور ئەمێنێ، ئەوە چی یە؟! ئەچێ دووگردی شێخی را ئەخا پاشی نوێژ لە هاتنە دەر کەوشی شیخی دادەنێ. شێخ گوێچکی ئەگرێ، ئەڵێ

منالەکانت چۆنن؟ ئەڵێ بە قوربانت بم عیلاجێ. ئەڵێ ئیتر ئینکاری میعراجی نَبْوی مەکە.. جا بنۆڕە ئەم حیکایەتە قیاس لە میعراج ناکرێ. میعراجی نَبَوی عبارەتە لە حَرَکەیێ زۆر لە مُدَەیێ کەم، ئەمما ئەوە علی الأقَلْ نۆ سەد نوبە شَمسْ دەوری داوە لە میسر لە بغدا وەکی خۆی بووە. تجارەت و مُعاملاتی و حەجی میسر چۆن بووە؟ حَرکاتێ مانگ و سائری نُجوْم کو بووە؟ بێ موحاکەمەیە بە ناوی کَرامەت قبوڵی ئەکەن. بۆ میعراجی نَبوی دلیلی پێ ئەوێ؟ ذاتاً ئومەمی حاضرە بأکْدة بۆگەلێ کەس ئەو نوعە إدّعایە ئەکەن. إمامی راضي و ئەمثالي بە بورهانی هَندسی تەمایانە مەسئەلە رێك خەن. رێك ناکەوێ. جِسَدی ئینسان تَحَمُلی ئەو حَرَکە ناکا ((بوراق)) با لە بەهەشتەوە بێ فَرقی نی یە. مەگەر لە عالمی مُجَرَّداتْ بێ. حَرکەکەی دەوری یە بۆ جسمی وەکی شَمْس جودایە لەگەڵ حَرکەی مُستَقیمەی قسْریە لە مَرْکَز بۆ مُحیطْ، بعضێ ئەڵێن بەخەون بووە، ظاهري بَعْضَە ئایات وای ئەگەیەنێ، سؤالی قەوم لە حضرەتی رِسالەت و جوابی رِسالەت پەناە لەخەو ناکا، بعضێ ئەولیا و الله ئەڵێن سەیرێ روحی بووە، ئەمەش نەوعێکە! یا مِثالی بووە هەر ((گوڵە ئاوازێ)) بۆ خۆمان ئەوی بیڵێن باشە. ئەمما موقابلی خەڵکی دی وەکی طَبیعیونان چ بڵێن؟! بەڵێ موقابلێ میلّیون ئەکرێ، ئەڵێن گەورەیێ لە یەسوعیان سؤال ئەکا لە ذاتێ محمدی رسولی ئێوە بەکام رێگا چووە ئاسمانان؟ ئەڵێ بەو رێگەی ((عیسی))یان پێدا بردە سموات. حقیقةً خصمی عَنود طبعیونن مُقَابلەیان مُشْکلەیە. لام وایە مەلای عاقل و سیاسی ئەتوانێ چارەی بکات.لە ئەوە لەوە وا بە گژی دا ناچێ بالمَرە مُتَوحِش بکات. بە إستحالةً بە موجاراتْ ئەتوانێ بیگەیەنێتە حەق. ئەمما ئەو نوعە مەلایە کەمن، حالاً پێم شك نایێ لە دیاری ئێمە هیچ. لە میسریش مع الأسف نەما. ئەوی بووش بە تەکفری جاهلیەکان مَنفور بوون جی یان نەگیراوە، ئەمڕۆ مەلای سُنی و شیعی ئەبێ ئاگادارو بە قووەت قووەت موتەفق بن. بە تەکفیر موقابەلە نەکەن. قەومی چروك....!؟ شێخ ابو علی کافر، فارابی کافر– ابن الرشد

کافر- ابن تیمیه طال و فطل، جمال الدین کافر- محمد عبده کافر - سید رشید کافر- طنطاوی کافر - ئەدی کێ ئەمێنێتەوە بۆ حفظي دین، ئەو گەجەرو گوجەرانە چی یان پێ ئەکرێ؟ خولاسە. موحافظەی دین علیم و عەقڵی پێ دەوێ. وەك لە حدیث ئەفەرمووێ ((نحن مَعاشِرَ الأنبیاء أُمِرنا أنْ نُكَلِّمَ النَّاسَ على قَدر عُقولِهْم)) بۆ مەلایان ئەوە دەستورێ واجب الرعایەیە والسلام.

## سورەتی (الکهف)

مەکی یە. مەدەنی یە، هەموویی جملةً نازل بووە.. عددی ئایەتی((١١٠))ە وایە موناسەبەی لەگەلّ سورەتی ((إسرا )) نەك زۆرە بەلّکو پێکەوە مُتَصِلف.

﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾

﴿الحمدُالله الذيّ أنزَلَ عَلـى عَبـدهِ الكتـاب﴾. قورئـانی کـریم. نیعمـەتیّ فـوق النَعیم، هادی الأممْ. مایەی سعادەتیّ حیـاتی دونیـا و ئـاخرەتْ. مَنبَـعِ أصـولی إعتقادیـات و أحکـام، عبـادات و معـاملات و سیاسـەتیّ پـاك و مەدنیـەتیّ فاضلة.﴿ولَمْ يَجْعَلْ لَهُ عِوَجَا﴾. کتابی ئیلاهی، رسولی ئیلاهی ئەبیّ بـیّ مـەیل و موحابابیّ. راست و رەوان و بیّ خوارەکە و پێچەکی تَعَصُبی قەومی و إمتیـازی ئەقارب و تەرجیحی قەوم و خوێش بیّ. دیقەتکەن، ملائیکەتیّ ٧٠ هەفتا هـەزار رووی هەیە. لەهەر روویێ ٧٠ هەفتا هەزار زوبانی هەیە، هەر زووبانـە ٧٠ هـەفتا هەزار لوغەتی هەیە بەو لوغاتە تەسبیحی خوا ئەکا. لە کُلُّ تەسـبیحەییّ، خـوا ملائیکەتێکی خەلق ئەکا، لەگەلّ ملائیکەتان ئـەفڕیّ، ئەمـە تاقیامەتـە، غـەیری عەرش خەلقیّ لەوی گەورەتر نی یە. هەموو ئاسمان و ئەرض ئەوی تێیان دایـە حەز بکا بە لوقمەییّ قووتی یان ئەدا، ئەوانە لە قورئان دا نی یە، ئـەمما باسـی وەحی ئیلاهی بۆ نَقْل ئەکات. کەلامی ژنیّ، سورەتە و ئیـشارەتی مێـروویّ کـە فائیدەی تیا بیّ، بە وەحی ئەینێریّ بۆ رەسولی خـۆی، کـەوابیّ ئـەو کتـابـە فی نَفْسِه کاملة. ﴿قَيِّمًا﴾ موکملی غەیرە، کافلی مَصالِحە، نازلی بـالخیرە، مُـورَبـی یە، ئەمەش بۆ إکمالە، وەکی (إمام فخرالدین) ئەفەرموویّ، ئەمما تەفـسیری بـە مُسْتَقیم گەر چی لە ((إبن العباس)) نەقل کرایە زۆر جوان نی یە، رەحمـەت لـە

إمام و أمثالي إمامْ، ئەوانەى تەماشاى روحى كِتابْ ئەكەن بە نەقل پێچەكەو خوارەكە ناكەن. ((سەيرى آلوسى)) في الحقيقة لە نوقادانە لكِنْ گاهـ گاهـ لەبەر ترس ريا غەلەبەى بەسەردا ئەكا. باز إمام ئەفەرمووىَ ((واحدى)) ئەلّىَ، جميعى ئەهلى لوغەت و تەفسير ئەلێن:- ئەوە لە تَقديم و تأخيرە، لە تَقدير ((أنزَلَ على عبدهِ الكتابَ قيماً ولم يَجْعَل له عِوجاً))يە. إمام روَّحَ اللّهُ رُوحَهُ ئەلّىَ: ئەمە فاسِدە حەق و مُوافِق نظيمي كەريمە. ئەوەل وەصفى ذاتى، دووەم وەصفى غەيرە ذاتي ذكر ئەكرىَ، ئەوەلاً كەمال ثانياً إكمالْ، حەقاً فەرمايشى عەينى صوابە، لەگەلىَ جىَ بەو تَقديم و تأخيرەى نظمي حقيقي ئەگۆڕن، نەظر بە إستقادەى قورئان ئەو قەومە لە نيهايەتى عيوەجە، نظمي وەضعي كِتابْ لەگەل طبعي رێكە. حەقاً قورئان كتابىَ زۆر خاوێنە، دوورە لە خرافات و أُمورى تافهە، غيرە معقولە، لە تورات ئەلّىَ:- خوا ئەمرى كردە موسى بە بەنى ئيسرائيلى بلّىَ، هەر صاحب مالّىَ گەر مومكين نەبوو بە دوو مالّان حيوانىَ بكوژنەوە، بەردەركەى خۆيان بە خونى پىَ برشێنن، ئەمن شەوىَ دێم ضربە لە ميسريان ئەدەم، ئەولادى بكريان ئەكوژم، هى ئينسان، چ هى حيوان، تا ئەو دەركەى بە خوێن رشابىَ بزانم هى ئێوەيە، نەى چمە ناو بە خانووى ميسريانم لىَ نەگۆڕىَ، جا بزانە قسەيىَ چەند چرۆكە ئەمرۆكە ئەو نوعە كتابە بەناوى كتابىَ مُقَدس ترجمە و إعلان ئەكەن، بزانن قورئان نيعمەتە بۆ سائلى رُسُلْ كە لەو نەوعە خرافاتانە تەبرى يەيان ئەكا ئەفەرموىَ كتابيان تەحريف كرايين. ﴿لِيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا﴾.لەگەل قەيمى چەند مولائيمە ﴿مِنْ لَدُنْهُ﴾. لەطَرفْ خواىَ كە ئەرحم و الراحمين، ئەساسى تربيەى بەشر لەسەر ترسە، گچكە على ألاكثر گەورە، بەترس دێنە راى، ﴿وَيُبَشِّرَ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ﴾ — هەر كەسىَ ببىَ قورەيش، حەبەش، مەدار لەسەر ئيمان و عەمەلى صالحە، وەهەر زەمانە، وەهەر صنفە، وەهەر شەخصە، نەوعە عەمەلەكى صالحى هەيە، ﴿أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا﴾جوان بە لەذەت،خۆش، باش، ﴿مَاكِثِينَ فِيهِ﴾.لە ئەجرەكەيان ﴿أَبَدًا﴾. فەوتانى نى يە، خۆيان مؤبّدْ لە

نعیمی مۆبەد، ﴿وَيُنذِرَ الَّذِينَ﴾. زێرە. ﴿قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا﴾ (مشرك)ی خرستوی (سائر)ی (أقوام) کە ئەڵێن:- "خوا(ولد)ی هەیە، نێرەمێ" ﴿مَا لَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ﴾ (أدنی)یە. (ذاتا) ئەوانە بەس لە (هەوەس) و (تقلید) وە ئەڵێن:- ئاگایان لە (مَباحث)ی (علم) و (حقائق)ی (أشیاء) نیە ﴿وَلَا لِآبَائِهِمْ﴾ ئەوانیش (علم)یان نیە، (میل) و (هوا)یە ﴿كَبُرَتْ كَلِمَةً﴾ گەرچی بە (سهل) دێتە سەر زاریان، (أمّا) گەورەیە ﴿تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ﴾ لە دەمیان، دڵی (عەقڵ)ی (واعی) ئاگای لێ نیە ﴿إِنْ يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا﴾ چیدی نیە، ئایا بە (خیاڵ)یان دادێ؟؟ (تەوالد) بوچی ئەبێ؟ بەچی ئەبێ؟ ئەگەر خوا (داخل)ی(قاعدە)ی (توالد) بێ، (فرق)ی چیە لەگەڵ ئێمە؟ بە (قاعد) ە ئەبێ بمرێ ﴿فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَفْسَكَ﴾ خۆت (هلال) ئەکەی ﴿عَلَى آثَارِهِمْ﴾ ئەوەی ئەی کەن. ئەوەی بە (إعتقاد)یانە، لەسەر (سیّئات) و (جهالەت)یان، خۆت ئەکوژیەوە ﴿إِنْ لَمْ يُؤْمِنُوا بِهَذَا الْحَدِيثِ﴾ (قرآنی)، یا ئەوە کە خوا بێ(ولد)ە، (فرد)ی (صمد)ە ﴿أَسَفًا﴾ خۆت بێ هێز و تاقەت ئەکەی، بە غەم و (حزن) و ئەندۆە، (حقا) جای (تأسف)، ئەوانە بە (آیات)ی (بیّنات) (إیمان) نایەنن، بە (هەوەس) بە (تقلید) ئەو درۆیە (عظیم)ە ئەکەن کە هیچ (دماغ)ی (هضم)ی ناکا، مەگەر (دماغ)ی نێزیك لە (دماغ)ی مەیمون ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ﴾ (حیوانات) و (نباتات) و (أشجار) و (جنّات)و (قصور)ەچی بەکەڵك بێ لەسەر ئەرز ﴿زِينَةً لَهَا﴾ ئارایشی ئەرزی یە ﴿لِنَبْلُوَهُمْ﴾ (بشر). (جناب)ی (حق) (قبل الوقوع) شت ئەزانی، (لكن) (نسبەت) ئەگۆڕێ، (مسلمان) ناتوانی بڵێ: خوا (علم)ی بە (جزئیات) نیە" (فخر) (نقل)ی لە (هشامی بنی حكم) ئەکا کە (قبل الوقوع) خوا (جزئیات) نازانی)! ئەدی چۆن دێتە (وجود) بە (خلق) و (إیجاد)؟ کەی ئەبێت؟ چ بڵێم؟ ﴿أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ کەچی ئەوانە، بە (حیات)ی (دُنیا) و (زینەت)ی (مغرور) بووین، با (وجود)ی زیباو (زینەت)ی (قریش) (نظر) بە (أمّەت)ی تر هیچە، چی وەی نیە (إفتخار)ی پێ بکەن. بەڵێ بە (نظر) رەش و رووتەکانی، هەڵقرچای (بَدو) (وَقعە) کی هەیە ﴿وَإِنَّا لَجَاعِلُونَ مَا عَلَيْهَا﴾ هەر

چی بی ﴿صَعِيدًا﴾ خۆڵێ ﴿جُرُزًا﴾ بێ (قُوَّه)ی (إنباتی)یە، ئەو جێ ی بەسەریا هات، گیا ناهێنێ، ئەوەی لاشەی ئەکەوێتە سەر، لەئەرز (مادّه)ی (تُرابی) (غالب) ئەبێ، ئەویدی (دَرك) ناکرێ، کەوابێ (لازم) نیە بڵێین: "(عناصر)کانی تریش (مُنقلب) ئەبن بە خۆڵ، گەرچی (حُکما)یانی (سابق) (قول)یان بە (إنقلاب)ی (عناصر) کردیە، وە چ (إستحالە)ی تیانیە، (بِناءً علیه)نە ئەبا، ئەوانە بە ڕەنگ و (نقش) و نگارو (زینەت)ی (دنیا) فریتە بن، بەڵکو خۆیان پێشماڵیان ئەبنەوە خۆڵ.

(یا محمد) بنۆڕە (عجائب)ی (مقدّرات) و (آیات)ی (إله) (قوم)ی توو بەو (آیات)ی (بَیِّنات) و (إرشاد) و (نُصح) و (إیمان) نایەنن، دەست لە (أباطل)ي خۆ هەڵناگرن ﴿أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ كَانُوا مِنْ آيَاتِنَا عَجَبًا﴾ بێ (هادی) بێ (رسول) و (ناصِح) و (مُرشد) بە (فکر)ی خۆیان خوایان دەناسی، دەستیان لە (قوم) و (مناصب) و (عِزّ) و (لذّەت)ي خۆیان هەڵ گرت، وەك (قوم)ی توو بە (زَخارف)ی کەم (مغرور) نەبوون، چاویان نەنووسا، بەڵی (عُجْب)ە (آیات)ی (إلهی) ئەبێ (وَلَوْ) بە (نَظر) (قدرەت)ی (الهی) کە (أسهل)ی (مایکون) بێ.

(کهف) ئەشکەوتە، ئەگەر بەرین نەبی پێی ئەڵێن: "غار" (رقیم) (بعض) ئەڵێن "ناوي سەگەکەیانە" – کە بە دوایانا کەوتوە –(بعض)ی ئەڵێن: " تاتە بەردێکە، ناویان و (قِصّە)ی وانیان لێ نووسیوەتەوە، لەبەر دەرکەی (غار)یان داندراوە " (بعض)ی ئەڵێن: "ئەوانیش (جمع)ی بووین، (حکایەت)یکیان دەربارەی (نقل) ئەکەن" (لکن) لە (قرآن) (رمز)ی تیانیە لە (قاموس) ئەڵێ: "(رقیم) (قریة أصحاب الكهف) أو (جبلهم) أو (كلبهم) أو (الوادی) أو (الصخرة)أو (لوحُ رصاصٍ) نُقش فيه نسبهم واسمائهم و دينهم، وَهُمْ هَرَبُوا" ئەڵێن: "لە (أبنا)ی (ملوك) و (رؤسا) ن، ناویان (مشهورە): (یەملیخا)، (مەکسیل منیا)، (مرنۆش) (دبرنوش)، (شاذنوش)، (کفش)، (ططیوش)، ناوی

سەگەكەيان (قطمير).گەلێ جار ماموستا (ملا أحمد) كوێر ئەوەی ئەنووس لە نوشتە، لە (كاك أحمد)ی شێخی وەرگرتبوو.

لە (روايات) (تحقيق) ناكرێ (رفع)ی (نسب) و (حقيقەت)ی (دين)يان، بە ئەوەندەی لە (قرآن) دايە (إكتفا) (لازم)ە. لەسەر ئەو (وعد)ی (مقام)ی (محمود) باسی (أصحاب الكهف) كە (إشارە)يە، بۆ (هجرەت) و (وَعد)ە بو(نصر) و (ظفر) (كرّ)ی (بَعد الفَرّ)ە ﴿إِذْ أَوَى الْفِتْيَةُ﴾(إلتجا)يان برد ﴿إِلَى الْكَهْفِ﴾ (فتيه) (جمع)ی (فتا)يە، جحيل و تەڕو بە غوبان، كوڕەلاو ﴿فَقَالُوا رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ﴾ لە(طرف) خۆت ﴿رَحْمَةً﴾ (مناسب)ی (حال) (رزق) و (أمن) (إلهی) (حفظ) مان كەی لە (عدو) ﴿وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا﴾ لەوكاری تێ يداين (هجرەت)ی (قوم) و (دين)يان، بۆمان ڕێك بێخی، ئامادەی كەی ﴿رَشَدًا﴾ (إصابە)ی (حق) و (مرام) (ادخلنا مدخل صدق، واخرجنا مخرج صدق) ﴿فَضَرَبْنَا﴾ لە (جواب)ی (دُعا)يان ﴿عَلَى آذَانِهِمْ﴾ لەسەر گوێمان دان، بێ هۆشمان كردن. وا ئەچێ دەستێ بە (قوەت) بە گوێ ی (إنسان) ئەكەوێ، مێشكی ئەتاسێ ﴿فِي الْكَهْفِ﴾ هەر لەوێ بێ (نقل) بۆ (طرف)ێ ﴿سِنِينَ عَدَدًا﴾ سالّەها، چەند سالّی زۆر، كە (إعتنا ) بە ژمارەی بكرێ، ببێ بە (آيەت)، (آيەت)ی (عجيب) (دالْ) لەسەر (بعث) بۆ (ذكر)ي (عددا)پاش (سِنين) (توجيهات)يان فەرمووە،ئی هيچ لە (نظر)ی (سيدی آلوسی) (توجيە)ی (شێخی إبن حجر)ە، كە لە (فتاواي حديثية) فەرموويەتی (مَعَ أنَّهُ) ئەو بە (توجيە) (زجّاج) (راضي) نيە. (وجە)ی (مُقرّر)ی خۆيەتی ﴿ثُمَّ بَعَثْنَا﴾ پاش ئەو (مُدّە)ي لەو خەوو (سُبات) دامان بە (خبر) مان هينان، زيندیمان كردنەوە ﴿لِنَعْلَمَ أَيُّ الْحِزْبَيْنِ﴾ لە خۆيان يا لەوان و لە (غير) ﴿أَحْصَى﴾ (ظبط)ی چاترە، (حفظ)ي (تأريخ)يان و (مدە)يان زێترە ﴿لِمَا لَبِثُوا أَمَدًا﴾ بۆ (مدە)ی مانەوەيان بەو حالّە، لە (كهف) دا، چەند بووە؟ بۆ (تركيب)ی (نجوی) (مراجع) وی (روح المعانی)كە تا (مدّە) و (غايە)ت لێ (مُشوّش) نەبی ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُمْ بِالْحَقِّ﴾ حقّيّ لاحِيّ و صفَوِيّ و مُفيدي، بێ درۆ و دەلەسەی

نَقّالان. ﴿إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ﴾ جَماتيَ لە کوڕە لاوان. ﴿آمَنُوا﴾ بە نَظَر لە مَلَكوتی سَماوات و أرض. ﴿بِرَبِّهِمْ﴾ خالِق و رَبّ و سَيِّد و گەورەی خۆیان. ﴿وَزِدْنَاهُمْ هُدًى﴾ بە زیَدەی شَرحی صَدرو نَظَر، لە آیات و عِبَرو اِرْشاد، بۆ عَمَلی صالِحْ، نازانم عَمَلیان چ بووە؟ ﴿وَرَبَطْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ﴾ رَبْطي بە (عَلی) مُقابِلي (فَتح)ە نایەڵێ قووەت و مَتانَتي إيمانی لێ بچێتە دەر، ترس و ریا و سُمعە تَقیە پەلاتیقەی بچێتە ناو! دیارە رَبط هەتا رَبط فَرقی هەیە! ﴿إِذْ قَامُوا﴾ لە مەیانی قَوم راوەستان لەسەر قَدمَي عَزْم و جَزْم و قووە و إرادە. ﴿فَقَالُوا﴾ عَلي مَلأِ النّاس. ﴿رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ عُلْوي و سُفْلي، چ جێیَ دی نیە خوایَ تر حُکمی لەسەر بکا. ﴿لَنْ نَدْعُوَ﴾ أبَداً. ﴿مِنْ دُونِهِ إِلَهًا﴾ مُحالە! ﴿لَقَدْ قُلْنَا إِذًا﴾ —مَعاذَ الله—. ﴿شَطَطًا﴾ قَوْلی دوور لە حەق، مُحال، عاقِلْ تَصَوّري ناکا! ﴿هَؤُلاَءِ قَوْمُنَا﴾ ئەوانە قَوْمي مەنە. ﴿اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ آلِهَةً﴾ بە عَمَل وکاري خۆیان ئەیتراشن، هەلي ئەکەنن، عِبادەتي ئەکەن، بە رَبّ و الاهی ئەزانن، لە تَمثیل و تَقَرُّب تێی ئەپەرێنن ﴿لَوْلاَ يَأْتُونَ عَلَيْهِمْ بِسُلْطَانٍ﴾ حُجَّة و دَلیل بُرهاني بە قووەت نایێنن لەسەر ألوهيّە یات ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾ عَمْداً وَقَصْداً، وە ئەزانیشن درۆیە، هەڵبەستەیە، خۆکردیە. ﴿وَإِذْ اعْتَزَلْتُمُوهُمْ﴾ أنَّهُ یەکێ لەوان پێ یان ئەڵێ. ﴿وَمَا يَعْبُدُونَ إِلاَّ اللَّهَ﴾ لە وانو لە إلاهیانتان لادا، دەستتان لە قَوْم و إلاهیان هەڵگرت، بەس خوا ئەپەرستن، لە ناو ئەوانە، حەوانەوەتان نابێ! ﴿فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ﴾ پەنا بەنە لای ئەو ئەشکەوتە. ﴿يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ رَحْمَتِهِ﴾ لە رَحمەتی خۆی شتێ بۆ ئێوە بڵاو ئەکا، یَعنی مَرْحَمەتێ شامِلي حاڵتان ئەبێ، ئاگادارتان ئەکا، مادام ئێوە دەست لە قَوم و ئایینی خۆتان هەڵگرن بۆ خوا، بێ شك خواش بە ضایعتان نادا. ﴿وَيُهَيِّئْ﴾ ئامادە ئەکا ﴿لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ﴾ لەو کارە کەتیی دان ﴿مِرفَقًا﴾ شتێ ببێتە موجبی رِفق و نەرمي، مُقابِلي ئەو ئێشە صَعْبە. عَرضم کردن زۆر ئەبێ بَعْضێ أشخاص لە مَقابلي يَأس و بۆس و شِدَّەت، ئەکەویتە قَلْبیان، نَجاة بوونیان لا مُحَقّقە، أحوالاتی راهِنە قووەت و جَزمیان بێ هێز

ناکا ! ﴿وَتَرَى الشَّمْسَ﴾ (أيها الرائي) ﴿إِذَا طَلَعَتْ﴾ کە هەلات ﴿تَتَزَاوَرُ عَنْ كَهْفِهِمْ﴾ (موقع)ی نا (مُعَين) (بیان) ئەفەرموێ: کە ڕۆژهەلات، لا ئەدا لە ئەشکەوتیان ﴿ذَاتَ الْيَمِينِ﴾ بۆ (جهەت)ی (یمین)ی ئەشکەوت ﴿وَإِذَا غَرَبَتْ تَقْرِضُهُمْ﴾ لەوان لائەدا لە (وقت)ی(غروب) ﴿ذَاتَ الشِّمَالِ﴾ بۆ (جهەت)ی (شمال)ی (کهف)، (ممکن)ە تیشکی ڕۆژی لە (غروب) بکەوێتە ناو ئەشکەوت، (أمّا) پێ یان ڕێك نەکەوێ ئەمەش لە (بعض)ي (أیّام)ی (سنه)، (نهایەت)ي بەهارو (أوّل)ی هاوین. لە (بروج)ی (جنوبي) (شمس) لێ یان دادەکشێ وەك (سوولی پاشا)ی ئێمە لە (چنارۆك) هەتاوی بەمبەرو بەو بەریش ناکەوێ ﴿وَهُمْ﴾ یارانی (کهف) ﴿فِي فَجْوَةٍ مِنْهُ﴾ لە جێ یە (واسع) دان لە ناوی ئەشکەوت ﴿ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللهِ﴾ (بعض)ي لایان وایە،(أیەت)هەر ئەبێ شتی سەیرۆکە بی، ئەلێن: "ئەوە بەس بە (إرادە)ی خوایە، (دخل)ی (وضعیەت)ي ئەشکەوتی تیا نیە، وە (إلا) نابێ بە (آیەت)" (أمّا) لای (أهل)ی (تحقیق) (أوضاع)ی (فلك) و (أرض) و (إختلافات)ی (بُقاعی) (نظر) بە (وضع)ی (شمس)ە هەمووی (أیەت)ە، بەڵکوو (ایات)ە (حتّی) (عِلم) بە (نسبەت)ی (كُرَتَيْنْ) (مفتاح)، بۆ (أرباب)ی (خیال)ی (صحیح)، بۆ (کشف)ی (أحوالات)ی (بُقاع) و (أقالیم)ی (ارض) لە (إستوا ) تا بن (قطب). دیارە (علم) بەو (وضعیەت)ە بۆ (رسالەت)پەناە (آیەت)ە. (آیەت)ێ (عجیب)، نابینی؟ ﴿مَنْ يَهْدِ اللّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِي﴾ (حتّی) بۆ (علم) بە (أمور)ی (خارجي)،بێ وەی بیبینی ﴿وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ وَلِيًّا مُرْشِدًا﴾ گەلێ کەس هەن، بە (درس) پێ یان ئەلێن، ناچێتە (خیال)یان، پێ یان (تصویر) ناکرێ، بەڵێ (أصل)ی (هدایەت) و (ضَلال)ي (فِطری) (عائد)ی (فاطِر)ە. ئەگەر (ضلال) (رسوخ)ي نەبەستێ (قابل) بە (تعلیم) و (إرشاد) (صاحب)ی بێتە سە ڕێ. (لکن) کە (راسخ) بوو چارە نامێنی ﴿وَتَحْسَبُهُمْ﴾ (أصحاب)ی (کهف) ﴿أَيْقَاظًا﴾ بە (خَبر) ن ﴿وَهُمْ رُقُودٌ﴾ نووستی ین – (في الحقیقة) گومڕاهەکانی ئێمەش وان، (إنسان) وا ئەزانێ بە(خَبر)ن، (أمّا) (حقیقةً) نووستوون، مردوون؛ (روح) و (حیات)ی تێ

گەیشتیان نەماوە ﴿وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَذَاتَ الشِّمَالِ﴾ تەنیشتیان دەگۆڕین لەسەر لای راستە وەریان ئەگێڕینە سەر لای چەپ لەسەر لای چەپ وەریان ئەگێڕینە سەر لای راست. ئەوانە نەمردوون، (غایەت) وەك (داء النَّوم) یا سڕبوونی، وەك (حیوانات) بێ بەرگ (ممكن) (بَین بَین)كە لە كەیان بگۆڕین ﴿وَكَلْبُهُمْ﴾ سەی وان، سەی ڕاو بووە، ئی باس بووە؟ ڕەنگی، ناوی، گەورەو گچكەیی لە (نَقّال)آن بپرسە. جا وەرە سەر (قرائەت)ی (مختلف)ە! پاشان بڕۆ بۆ بەهەشت، بزانە چەند دانە (حیوانات)ی (أنبیا)ی تیدایە. سەگی (أصحاب)ی (كهف)، (مَشهور)ە كەری (عُزیر)ی، (سَّید)ی (آلوسي) ئەڵێ: "كەری (بَلعم)، وە (ناقە)ی (صالح)، ئەمە قسەی تیانیە، (أیةُ الله)یە وە (كبش)ی (اسماعیل)ی"، سەگی (أصحاب)ی (محمد) (شیخ رضا)ی (طالبانی)ش (بِحَولِ الله تعالی) ئەچێتە بە هەشت!

ئەڵێ:

یارسولَ الله چ باشد؟ چون سەگی أصحاب كهف
داخلی جنەت شَومَ، دەر زُمرەیی أحبابی توو
تۆ رەوەد دەر جَنَّەت و من دەر جهە ننەم
كەی رەواست؟ تۆ سەگی أصحاب كهف و من سەگە أصحابی تۆ

﴿بَاسِطٌ ذِرَاعَيْهِ﴾ دوو دەستی درێژ كردیە ﴿بِالْوَصِيدِ﴾ لە دەرگای ئەشكەوت. (ممكن)ە نەڕزیبێ، یاخود (تَحَّجر)ی كرد بی! لە دەرەوەیە؟ لە ژوورەوەیە؟ نەی (معلوم)! (ممكن)ە (داخل)ی (كهف) لە (مدخل)ی وەركەوتبێ﴿لَوِ اطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ﴾ ئەو وەقتی ﴿لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا﴾ رووت لێ وەرئەگێڕان، هەڵ ئەهاتی! ﴿وَلَمُلِئْتَ﴾ پڕ ئەبووی، یەعنی دڵت ﴿مِنْهُمْ رُعْبًا﴾ ترس، دڵت پڕ بوو لەترسان، زۆر زۆریان لێ ئەترسای. دیارە لە زەمانی (رسالەت) پەناە، نە(أثر)یان مابوو، نە (خَبر). لە (بعض) (تواریخ) دەرئەكەوی (رَقیم) (حكومەت)ی بووە، (قدیم)، (موقع)یان بەشیوو دۆڵ و

(مغار) و ئەشکەوت بووە، (واسطە)ی (تجارەت) بوین، لە (بَین)، ئەو (بین)ە مان بۆ (معلوم) نەبوو.

لە هەندێ (نقلیّات) ئەڵێ: "ماون، ئەبنە (أعوان)ی (مَهدي) " بەڵێ لە (ئەسکەندەرنامە)ش ئەڵێ: " (فەیرون)ی (أطلس) پۆش کوڕی (ئەسکەندەر)ی کەوتە ناو (طلسم)، (نجات)ی (ممکن) نەبوو، لە (آخر)ی (زَمان)ی، دێتە دەر، خزمەتی (مهدی) دەکا!" تەماشای (قرآن) و (روح)ی کە، مەنوارە (نَقلات)ی بێ (حَیات)ی ﴿وَكَذَلِكَ﴾ کوو نواندمانن ﴿بَعَثْنَاهُمْ﴾ بە (خَبَر) مان هینان ﴿لِيَتَسَاءَلُوا بَيْنَهُمْ﴾ (سؤال) لێك بکەن ﴿قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ﴾ کێ یە؟ ئەوە نەی (معلوم) (ذاتاً) قرآن (أساساً) (إعتنا)ي بە ناویانی نەکرد، تا (إعتنا) بە (عَین)ی (قائل) بکرێ لێرە، (سؤال)ی لێ کردن ﴿كَمْ لَبِثْتُمْ؟﴾ چەند ڕوژ مانەوە، لەو نەومەدا؟ ﴿قَالُوا﴾ (جمع)ی لەوان ﴿لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ (ممکن)ە هەموویان (جواب)یان دا بێتەوە (قسم)ی بە (یوم) (قسم)ی بە (بعض)ي لە (یوم)، ئەوە (بادئ النظر)ە (بعد التأمل) ﴿قَالُوا رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ﴾ ئێوە ئاگاتان لە خەو نەبوە، (حیوانات)ی کە لە زستان سڕ ئەبن لە ناو خاك ئەمێنن، بە (قَدر) (ثُلث)ي کەم ئەکەن، بۆیە بەهاران، مار کە دێتە دەر لە کونی، کیفێ فرێ ئەدا، ئەوانە لەو (مدّد) ئەگەر کەمیان نەکردبێ، (خارقە)یەترە، وا (ظاهر) ئەوەندەیان کەم نەکردیە، (حِسّ)ی بکەن ﴿فَابْعَثُوا أَحَدَكُمْ﴾ یەکێ لە خۆتان بنێرنە شار ﴿بِوَرِقِكُمْ﴾ دراو ﴿هَذِهِ﴾ ئەمە بچێ ئەو پارەیە ببا ﴿إِلَى الْمَدِينَةِ﴾ بۆ لای شار، ئەمڕۆ (طرطوس) ئەوێ ڕوژی (ئەفسووس) خوا ئەی زانی ﴿فَلْيَنظُرْ أَيُّهَا أَزْكَى طَعَامًا﴾ کی هە باشترە، پاکترە، چاترە، خۆشترە؟ یەکێ ئەڵێ: "برنج" یەکی ئەڵێ: "قەسپ" یەکێ ئەڵێ: "مێوژ" هەر کەسە چی (میل) لێ بوە، بە (خاطر)ی داهاتیە ﴿فَلْيَأْتِكُمْ بِرِزْقٍ مِنْهُ﴾ لە (طعام)ە کەی (ازکی) ﴿وَلْيَتَلَطَّفْ﴾ ئاگاداری خۆی کا، لە چوو نە شارو لە (مُعامل) بە (مُجامل)ە بێ ﴿وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا﴾ هیچ کەس بە ئێوە ئاگادار نەکا ﴿إِنَّهُمْ﴾ ئەو (قوم)ە ﴿إِنْ يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ﴾ ئاگاداریان ببی

بەسەر ئێوە ﴿يَرْجُمُوكُمْ﴾ (بلا توقف) ﴿أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ﴾ يا ئەتان گێڕنەوە (دين)ی خۆيان ﴿وَلَنْ تُفْلِحُوا إِذًا﴾ (والعياذ بالله) ﴿أَبَدًا﴾ ئەگەر (داخل)ی (ملەت)يان ببنەوە، (نائل)ی (مرام) نابن (قط) ﴿وَكَذَلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ﴾ (أنَّهُ) به (وجه)ی تێ هەڵەنگفتن، (غير)ی وان (مُطّلع) بوون بەسەريان، ئەگەر چی (رفيق)يان (تَلَطق)ي كرد، كەس ئاگاداری بەسەريانا نەبێ ﴿لِيَعْلَمُوا﴾ تا (خلق) كە بزانن ﴿أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ السَّاعَةَ﴾ (قيامەت) (حشر)ی (اجساد) ﴿لاَ رَيْبَ فِيهَا﴾ (شك)ي تيانيه، دياره (خبر)يان درايەتی به (حشر) (مخالفه)يان بوه، (بعض)يێ (إنكار)يان كرديه، كە (إطلاع)يان بووه، (إنكار)يان نەمايه، بەدڵ (تصديق)يان كرديه. (أساساً) (إيمان) به (حشر)ی (إجاد) (بناء) به (تصديق)ی (رسول)ه؛ بۆ (خاطر)ي بێتە (صورەت)يكی (معقول) و نيزيك له (إدراك)، (مقدمات) و (أمارات) (ترتيب) ئەدەن.(حشر) (ممكن)ه، (صادق) (خبر)ی له (وقوع)ی دايه. ئەمه له (نظر) (نُظّار)آن باشە؛ (أمّا) له (نظر) (عوام) شتێ (بالفعل) (مُشابهه) و (مناسبه)ی هەبی، (علم)يان پێ ی (حاصل) ئەبێ؛ (بالطبع) ئەوانە كە ديتيان (جمع)ی ئەو (مُدّه) (طويل)ه (أجسام)يان نەگۆڕايە (حيات)يان (عَودت)ی كردۆتەوه، گەڕانەوه سەر (حال)ی پێشی، لە هۆش و (إدراك) و (سائر)ی (احوال)ی (حيوانيه) و (إنسانيه) لايان (عَيان) ئەبێ، بێ (إشتباه) كە (حشر)ی (أجساد) (ممكن)ه نيزيكه له (وقوع)؛ پەردەی (إستحاله) و (إستبعاد) نايەڵێ ﴿إِذْ يَتَنَازَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ﴾ (دائر) به (بعث) (لكن) (بَعد العُثور) (نزاع) نەما ﴿فَقَالُوا﴾ (قوم) ﴿ابْنُوا عَلَيْهِمْ﴾ لەسەر (أصحاب)ی (كهف) پاش (إطلاع) (رفع)ی (خلاف) ئەوجا (أصحاب)ی (كهف) به (قطع)ی (وفات)يان كرد ﴿بُنْيَانًا﴾ چ (نوع)؟ بۆ چی؟ به چی (فكر)؟ ﴿رَبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ﴾ (بما في قلوبهم) به (وجه)ی چاكە بووه، يا بۆ سەيری (دنيا) بوه؟ وەك (مُجاور)ەكانی (مراقد)ی (مَظهر)ي ئێمە ﴿قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ﴾ ئەوانەی (غالب) بوون لەسەر (قَولُ) و (قَرار)ی خۆيان

﴿لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِمْ مَسْجِدًا﴾ عبادی خوای بێنیٚ، عبادەتی خوای تیا بکەن، پارە و پوول لەکەس وەرنەگیریٚ، نەکرێتە شَبَکە! تەماشای سَیِّدی آلوسی کە لە مسألەی قُبّە و عبادەتي سەر قَبرو هەلنانی قَبْران چ ئەکا، بە تَفصیلي قَدَح و جَرح و تَعدیل و تَأویل، أنّە لە أهمّي مَسائله!! مَعَ أنّـهُ لەو وەقتی عمارَت و مَباني قەحپان تشیید ئەکرا، مەلایان شەڕیان نەبوو، خەریکي شەڕي سەر قَبْران بوون!! حالاً شەڕ نەبڕایەتەوە لە بەینی وَهابیان و مُنْتَسیبن تَصَوّف و مَشیخەت! بەلّام حَقَّ الأنصاف عَلامەتیٚ مُمْتاز بۆ زەواتی نَوابِغْ زۆر لازمە موجبی سَعي و تَرَقّیە، أمّا ئەوەش دەرەجەی مَعلوم بیٚ، هەرکەس بە هەوای خۆی، نا! جَمیل صدقی بۆ هەیکەلی بۆ بکریٚ؟ وکَذا مُحْسِنُ السَّعدون؟ گەر چی زۆرم خۆش دەویست، چی کرد؟ خۆی کوشت، خراپی کرد! فَیْصَل، باشە، هونەریاتی زۆرە!! قُبّەی مَراقِدي أوْلیایان بخرێتە سەر أبْطالان، إیوَ الله، حَیاة ئەداً!! لە ولاتی ئێمە عَلائِم بۆ شێت و گێژو وێژەکانە زۆر خراپە مردنە گەوچیە! (سَلیم بەگ)یەکیٚ بوو لو دوازدە سوارەی مەریوان کە بە شبەي خوونیٚ لە شکری ایران عبارەت لە دوازدە هەزار کەس، شکاندیان! بە (أحمد پاشاي) برازای فەرموو: ئێمە حەز ئەکەین بکوژرێین خوێنمان برژێنە سەر عەردی مەوتەن تاکو مُحَبَّتْمان لە دلّی حلّي خۆمان شین ببیٚ— وەی بیٚ مراد خۆت سَلیم بەگ! قَوْمت ئەو قَوْمەنیە! لەبەر دەروێش و صۆفیلکۆکان دامەن نەشۆران، ئاگایان لە توو نیە فِي الحَقیقَة کەسیٚ بە أمَلي خزمەتی کوردان بکا، رەنجەڕۆیە، دەست و ئەژنۆیە، بە امْدادی ناگەن!! ﴿سَيَقُولُونَ﴾ قوّال و نُقّال لە افْواه ﴿ثَلَاثَةٌ﴾ سیٚ کەسن﴿رَابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ ئەویش لەو مَقامە بە آیە حسابە، بۆیە بوویتە چارە مینیان! ﴿وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ پێنجن، شەشەمینیان سەگەکەیانە! ﴿رَجْمًا بِالْغَيْبِ﴾ أنّهُ قسەی فڕیٚ ئەدەن بیٚ علم و خَبَرْ. ﴿وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ لەو (واو)ە قسەیان زۆرە، ئەگەر دەسەلّاتم هەبا، ئەمکردە (واو)ی خاتمە بۆ أعْدادو مَعْدوداتی مُتَقابلە! لە قَوْلي (ابنُ عَبّاس) شتیٚ وا ئەفامرێتەوە. کە (واو) واقِع بوو، عِدَّة تەواو ئەبیٚ! زۆر

باشە! ﴿قُلْ رَبِّي أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِمْ﴾ مَعلومە علمي وي (قطعيە) قَطْعيە، ريي إحْتِمالي نيە. ﴿مَا يَعْلَمُهُمْ﴾ بَشَرْ. ﴿إِلاَّ قَلِيلٌ﴾مُمكنە ئەوانە هيچيان وا نەبن، با إنْقِطاعي عدَّە، بە إتباري مَشْهورە و مَذكورە بیّ، يَعْني لەوەندە أقوالە زياتر نيە! با عَدَد زۆرتر يا كمتر، لەم سيیانە بیّ! لەوأقوالانە مَعلومە قسە لە مَلائكەتان نيە! ﴿فَلاَ تُمَارِ فِيهِمْ﴾ مِنْ حَيْثُ العد، ئەوەندەيە ئەوەندە نيە، مُجادَلە بیّ لزومە! ﴿إِلاَّ مِرَاءً ظَاهِرًا﴾ تَعَمُّقي پیّ ناویّ! ئەگەر عُشَّاقي أموری تافهە نەبا، حاجَە بە (مراءْ) نەبوو، لەسەر سەری نە ليّكۆڵينەوە. ﴿وَلاَ تَسْتَفْتِ فِيهِمْ﴾ لە شأنيان بوَجْهٍ. ﴿مِنْهُمْ﴾ لە حكايەت خوانان ﴿أَحَدًا﴾ يەكیّ، يا كەس. ﴿وَلاَ تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَلِكَ﴾ ئەو شتە ئەكەم ﴿غَدًا﴾ سبەينیّ، ئەڵێن: " ئەو (آيەت) (نزول)ی كرديە. وەقتیّ (قرەيش) (سؤال)يان لە (پيّغەمبەر) كرد: لە (روح) لە (اصحاب)ی (كهف) لە (ذی القرنين) فەرمووی: سبەی (جواب) تان ئەدەمەوە." نەی فەرموو: "إنشا اللە" ئەنجا (وَحی) بۆ نەهات؛ (٣) رۆژ يان (١٥)يا (٤٠) رۆژ (تأخير) بوو؛ پيّغەمبەر لای گران بوو. ـ قرەيش ـ (تكذيب)يان كرد، (يەكی أعلا) (أمّا) بۆ ئەو (آيەت) لە پيّش (جواب)ی (أوّل) نەهات؟ كە لە (سورە)ی (إسراء) (ذكر) كرا؛ بۆ (تأخير) نەبوو؟ لە هەموو (أسئلە) ؛ بۆ (تأخير)ی نەبوو؟ لە تەواوی (قصّە) ؛ بۆ لە (روح) ئەڵیّ: (ويسألونَكَ عَن الرُوح)؟ ليّرە نالیّ: "(ويسألونكَ عَنْ أصحابِ الكهفِ) وە لە دوایّ ئەفەرمویّ: "(وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ ذی القرنين)" (تفريق)ی (في السُّوَر) (تفريق)ی (بالعنوان) بۆچی؟ لەو مەيانە بیّ (مُناسبە) بۆچی؟ چ (نكتە)يە، چ (نظم) بیّ (إيجاب) ئەكا؟ چونكی لە (أساس)ەوە نەهاتووە، لە (إستثناء) ی ﴿إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ﴾ زۆر (مُضطرب)ن، لە (توجيهات) و (تقديرات)ی بە (تكلّف). وە هەم (مادام) (أصولی) ئەڵێن: "(تأخير)ی (بَيان) لە (وقت) دروست نيە" (تأخير)ی ئەو (جَواب) آنە، (أبداً) (جوان)ی نيە. با (جناب)ی (حَق) (وَحی) بۆ ناردبا؛ دوای يە (إخطار)ی فەرمووبا. من (عرض)

ئەکەم: (نظـر) بـە (نظـم)ی (کتـاب)ی خـوا (جنـاب)ی (حـق) (أمـر) ئەکاتـە (رسول)ی (أکرم)؛بـە (سـعی) و (إهتمـام) بـە، بـە (أمـور)ی (نـافع)ە؛ (أصـلاً) (إشتغال) مەکە بە شتێ، بێ کەڵك و (خێر) و بێر،(سبب)، (سبب) چ (فـەرق)ی هەیە، چ (علم)ی تیایە؟) وە ئەفەرموێ: (هەر ئیش و کارێکی بووت، (دائـر) بـە (أمـور)ی (رسـالەت) (تـأخیر)ی مەکـە بـۆ سـبەی، (أنـاً)، (سـاعـةً)، (یَومـاً) (إشتغال)ی پـێ مەکـە، بـە جـێ ی بێنـە؛ (تَسویف) مەکـە، (إلا)، مەگـەر خـوا (إرادە)ی بـە (تـأخیر)ی بـێ؛ نەخۆشیە، سـەر ئێشی یـە، یـا (أنـواع)ی وایـە؛ (ظُهـور)ی (أمـر)ی (أهَـمّ)ە، یـا (نـسیان)ە؟ ﴿وَاذْكُرْ رَبَّكَ﴾ یـادی خـوای کـە، لەبەری بپارێ وە ﴿إِذَا نَسِيتَ﴾ ئیشەکت لە (فکـر) کـرد، وە بـە یـادت هاتـەوە بڵێ: " (رَبّ)ی (إعانە)م بدەی، (حافظة)یە، (قوّەت)ێ (أتَمّ) پێ (کَرم) کـەی شتم لە یاد نەڕوا" ﴿وَقُلْ عَسَى أَنْ يَهْدِيَنِي رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ هَذَا﴾ با (إشـارە) بـێ بۆ (خَبر)ی (أصحاب)ی (کهف) (فَضل) لە (عدد)یـان، لـە ناویـان، لـە ڕەنـگ و ناوو جێ ی نوستنی سەگیان ﴿رَشَدًا﴾ لەوە نێزیك ترە، بـۆ (إرشـاد)ی (عبـاد) (مـسئلە)ی وان(أمـر)ی رابـردووە، ئێـستا ئـەوەی بـە تـوو بـڕوا ئـەکا، (تـصدیق)ەکـەی (عائـد)ی (رسـالەت)ی خـۆت ئەبێتـەوە ئەگـەر (تـصدیق)ی (رسالەت) ت نەکا، ئەڵێ: "هەڵبەستەیە، (أصـل) و (أساسـی)ی نیـە"﴿وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ﴾ بەو (حال)ە ﴿ثَلَاثَ مِائَةٍ سِنِينَ﴾ سێ سەد ساڵ ﴿وَازْدَادُوا تِسْعًا﴾ بۆچی (عبارەت) وادادەنێ؟ (حَتَّى) ناڵێ (زاد تسعاً)" (بعض)ی ئـەڵێن: "ئەمـە لەبەر (إختلاف)ی (سنە)ی (شمـس) و (قمـری)یـە" (إمـام)ی (رازی) بـەو قـسە (راضـی) نیە؛ ئەڵێ:" (حساب) (غیر) (مُوافق)، وە لە (سیاق) چ(إشعار)ی نیـە؛ وە (مَقام) (مَقام)ی (تفاوت)ی (حـسابین) نیـە؛ (وَآزدادُوا) بـێ(وَجـە) ئـەمینی" هەندە ئەڵێم:"(لَبْث)یان سێ سەدو نۆ ساڵی(قمر)ی بووە؛ (لَـدی العَـرب) ئـەوە (ظاهر) و (معلوم)ە؛ وەك لە (إمام) وەرئەگیرێ (لە تەواوی سـێ سـەدە، (نَوعـاً ما) (إنتباە)یان بـووە؛ (مَیـل)یـان نـەکرد، هەڵـستن، خـەویان لێ کەوتـەوە؛ نـۆ

سالّی دیان بۆ (زیاد) بوو، وە (قَبول)ی ئەو(زیاد)ەیان كرد؛ بەو (زێدە)ی یەش نەگۆڕان. وەلای (حقیر) (إشارە) كی تیایە، بۆ (مُدّە)ی (غَلبە)ی (رسالەت) پەناه؛ (سێ) رۆژ (إختفا)ی لە(غار)ی (ثَور) (مُقابل)ی سێ سەد سالّی وانە؛ لە (ظرف)ی (٩) سالْ (بالعزّ وَالاقبال، وَالاجلال) (فتح)ی (مكە) تەواو ئەبێ ﴿قُلْ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا﴾ أحوالّیان، لُبثیان، بێ فَساد مانیان، هەمووی بەتَدبیرو تَدویری إلاهي بووە، ئەو لە هەموو كەس چاكتر ئەزانێ!.

لەزەمانی عُثماني شەڕێ بوو لە بەینی (پیران) و (مامەش)، (جاداو روو) كە عەسكەري رەسمی ئێران بوون، مُداخَلەیان كردبوو، مسألە ببوە مسألێ دەولّەتي، لەطَرَفَین تَحقیقات مَأموري هەناردرا. لە فَصلی بەهار، ئەو وەقتە أمیري جەنگ (بهادر حُسینی خان) لەگەلْ جَمْعیٚ هاتنە (بیتوین)، وای إیجاب كرد(إسماعیل بەگ) (أركانی حَرب) كە لە طَرَفِي عُثماني ناردرابوو، بابمی جَلب كرد بۆ بیتوین. بۆی نووسی بوو ئەگەر نەیەیی رۆژی قیامەت لە خزمەت خوداو رەسولی خودا شكاتت لێ ئەكەم. بابم چوو، منیش لە خزمەتی چووم. رۆژێ لە میانی صُحْبەت لەسەر نان خواردن، امیرخان عَرضي مەلای كرد: ئێوە دەرحەق صاحبُ الزّمان چ ئەڵێن؟ فەرمووی ئەوەی لە بیری (سامَرّا)ی مُخْتَفي بووە؟ گوتی: بەڵێ تَصدُّقَت شوَم! وای زانی تَصْدیقی ئەكا. فەرمووی ئێمەش أوَّل گومانەكمان بوو، أمّا ئێستا لامان مُحَقَّقە مردیە، لەناو بیر خنكایە! گوتی:آمان، چۆن؟ فەرمووی: مدُەی اخْتِفا وەك لە قرآن وەرئەگیرێ سێصەدو نۆ سالّە! ئەو مادام لە هەزار سالْ تێپەڕی، بێ شكە نەمایە! ئەوانی ئێرانی لە تاوان دەستیان راوەستا لوقمەیان پێ نەجوورا.

ئەگەر ئارەزوو ئەكەی بە مُناسَبەی حالي صَحابي كَهف بە طُول و تَفْصیل كرامەت و مُنازَعەی سُنّی و مُعْتَزلیان ببێی، مُراجعەیی (تَفسیري كبیر) بكە! من انكاری كَرامەت ناكەم، ئەگەر مَصلَحەتێكی دین و أُمتی تیابێ! (فاروق) بانگی كرد (یا ساریَةُ الْجَبَلَ الْجَبَلَ!) ئاگات لە چیایی بێ، لە (اصْطَخَر) بیستی، بەخۆ هاتنەوە نێزیك بوو دوشمن پشتیان لێ بستێنن، ئەگەر تَداركیان نەكردبا،

لەشکری إسلام مەحوو ئەبۆوە. باشە! أمّا نابیّ عَسکریّکی دی، بە تەمای (یاساریة) بیّ، ئەوجا إعْتماد داتە سەر کَرامەتی فاروقی،لە تَحَفظ بیّ مُبالات بیّ! بەڵکو ئەبیّ زیادە تَقَیُّد بکا، نەك تووشی غَلطة بیّ بە هیلاك بچیّ! وَمَعَ هذا مُسلمانان تەلفون و تەلفزیون و میکرۆفۆنیان إخْتراع کردبا، دەها چاتر بوو! بە رادیۆو بەزم و دیلانیّ مَشارِقِ أرض و مَغارِبي ئەبێن! ئەگەر (مَلِکی سعودي) لە کێوی عَرَفات میکرۆفۆنی بەدەستەوە گریّ نُطقیّ بدا بۆ دەریا دەریای حُجاج لە عَرَفات، هەمووی گوێی لیّ بیّ، چەند قازانجە بۆ إسْلامیّەت! کرامەت بۆ مُسلمانان، قووەتی باش و زەخیرەي تەنگانە بوو، أمّا فەوتا! عالەم إعْتمادیان دا سەر ئیش، تێك چوو! آیات و عِبَري عادیّە کَوْنیّە بۆ أُمَّةْ چاکترە لە کَرامات!! بَني إسرائیلي إعْتمادیان دا سەر مُعْجِزە، تَجاوزیان کرد لە حد، بە هیلاك چوون! وکَذا قِسميّ لەمە، مالّ وێران بوون!!. من رِسالەکەم هەیە لە باسی کَرامەت ئەڵێم: کَرامەت وەك زەهراویە، کەميّ دەرمانە شفایە، بۆ گەليّ أمْراض زۆری قاتلە! خصوصی رَقابەتی بەینی أولیایان، دونیای پر کردیە لە درۆ، بەناوی کَرامەت! تَبَعەم ئەویّ قووەت داتە درۆ، بۆ زێدە کَرامەتی شێخی! مَعَ الأسَف دیني إسلام أُمَّتي مُحَمَّدي لە کَرامەت زەرەری دیت زەرەر إسْتفادەی نەکرد. بە إعتقادیاتیّ هکَذایي، بیّ هێزو إرادەو عَزم و جَزم وصَبْر و ثُبات و اقْدام و عِلم و بیّ آثاري قُدرَتْ بوو! لەبەر عَداوَتي خۆ بە خۆیی، ئاگایان لە أعْدای خارِجي نەما. ئەڵێن (وَلي) مردي زیندی ئەکاتەوە! ئەوا ئەبینن أمّة مرد وەك کۆنە دیانان! شێخ بەهەوادا ئەفڕیّ، أُمَّة بە قوڕدا دەچێتە خواریّ! تەماشای لوح المحفوظ ئەکات، قرآن مەحوو بۆ وە، ئیّ چی تیائەبینیّ؟ ئەو هەموو مُخترعاتە مُمکن نەبوو فێری بیّ لە لَوْح وەری گریّ بە أُمَّتي بڵیّ، تا ئەمڕۆ لەبەر دەستی طَبیعیّونان رەزیل نەبین؟ طَیّارة، بۆمبا، مُدَمّرات إخْتراع کرا، لە لَوْحي غائبیات دیت؟یا لە لَوْحي کائنات؟ یا لە أحوالاتي طَبیعیّە وەرگیرا؟ أرضي (سمسمة) کَشف کرا، بۆ ئێمە چ کەڵکی بوو؟ أمریکا پشتی إسلامي شکاند، لە عالەمی حَقیقي مَحروم بووین، لەبەر عالەمی

خَیال و مِثال، خوا تَمَثُّلیان بۆ ئەکا؟ لەگەل (قادیاني) ألفەت ئەکا؟ ئەی وای تا بنووسم دەردەم زیاد ئەکا!!! ﴿لَهُ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ سَماوات و أرضي لای حَضرەتي شێخ مَکشوفە؟ پەف! لەو مَغیبانە ئەکا ولَوْ رووحی بەبەر دەی؟ عَهد لە عمومی کائنات بۆ قُطب وەرئەگیری؟ خوایە توو عالمي غَیبی سَماوات و أرضي، علمي عام خاصّی تووە، مُقْتَضای زات! شرکەت قبولّ ناکا! شِبهي عِلم و قُدْرەتي توو، بۆ کەس مُمْکن نیە! ﴿أَبْصِرْ بِهِ وَأَسْمِعْ﴾ ئەو (نوع)ە (صیغە)ی (تعّجب)ە لە کوردی دانیە. (ذاتا) لە گەلەك جیّ (مُعَطل)م لە (مفردات) و (ترکیب) زوبانی ئێمە (قاصر)ە؛ (سمع) و (بصر)ی (إلهی) وەکی (حیوان) و (إنسان) نیە، دیارە (فَوقَ الطّبیعي)یە؛ هەموو شت لای خوا (عَیان)ە؛ (جزئي) و (کُلّي) (حاضر)ە، (ذات) و (صفات)ی جای (تعّجب) و (تَحیّر)ە،ئەمە لەبەر (قدسیّەت)ی؛ نەك لەبەر (مقصور)ی (عقل)؛ وەکی گەلیّ کەس ئەی لێن. (عقلّ) ئەزانی خواو (صفات) و (فَوقَ الطبیعیّت)ن، (ماهیّەت)یات نازاندریّ (مُحال)ە، (لکن) (وَهْم) و (خیالّ) (تَحّمل)ي ئەوە ناکەن خەریکن (جناب)ی (أقدس) (مُتلبسّ) کەن بە (لباس)ی (ممکنات)ی (طبیعیّە)، (تمثیل) و (تصویر)ي ئەکەن، (خیالیوّن) بەناوی (ولایەت) و (کرامەت) دوای (خیالّ) ئەکەون؛ پێ یدا هەلّ ئەچن، سەرەو و نگوون ئەکەون، وە لە (إنسان)یش (مقصد) چاوو گویّ ی نیە(بصر) و(سمع)ە (أوّلیّات) (مشترك)ە لە (بین)ی (حیوانات)؛ (مراتب)ی (ثانی)و(ثالث)بۆ (إنسان) (مقصود)ە ﴿مَا لَهُمْ﴾ بۆ (کائنات) و، (عُلوی) و (سُفلی) ﴿مِنْ دُونِهِ مِنْ وَلِيٍّ﴾ هەر ئەوە (مُدبّر الأمور) ﴿وَلاَ يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ﴾ (فَضل) لە (شأن) ﴿أَحَدً﴾ خوا نای کا، نابی، (ممکن) نیە؛ مەلّیّ (دلالەت)ی لە (إمتناع نیە) کەس نابێتە (عالم)ی (بالغیب)، کەس نابێتە (قائل)ی (کُنْ فیکونُ)؛ (إدارە)ی (أرض) و ئاسمان (حوالە)ی کەس ناکا، (حاشی) (ثم حاشی) (غیر) و (قابل)ە؛ (إنسان)ی لا هەلّپچرا هەر ناویّ

لىٚ ی ئەنىٚ ی، چۆن ئەگاتـە (مَرتـب)ەی (عِلـم)یٚ (قُـدرەت)یٚ وەکـی (علـم) و (قدرەت)ی خوای؛ بەخوا نا بەخشریٚ.

(واللّـهُ) (أُمّـەت) چـی بەسـەر هـات! بـە (هَـذيان)ي ئـەوو ئـەم؛ كـوو خانـە خوشتوور بوون.(غیر)ی خـوا بـە (مليـون) (وَلى)يـان پـەيا كـرد؛ (أمـر)ی (كُـن) (فَكانَ)يان دانی؛ (تفويض)ی (إدراة)ي (كائنات)يان كردن؛ (أمّا) چ سوود نابـیٚ (ممنوع)ە. (قُدرەت)ي (إلهي) ئەو (شمول)ی نيە (حقا) بە (شمول)ي (قدرەت) گەلیٚ (كفريات)يـان هاويشتە (أدْمِـغَ)ەی (ضـعيف) كـان! ﴿وَاتْـلُ﴾ بـۆ خـۆت بەسەريان ﴿مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنْ كِتَابِ رَبِّكَ﴾ (مُحقّق) لـە (مَقـام)ی (سـؤال)، خـوا (وحی) ت بۆ ئەنێریٚ؛ دلّت سـەغلّەت ناكـا، نـابیٚ دوژمنـت پـیٚ خوشـكا. ديـارە (رسول)ی خوای (سؤال)ی لـیٚ بكریٚ، بفـەرمویٚ (خـبر) تـان ئـەدەمیٚ سـبەی، (مثلا)،نشلّی (إنشاءالله) (قلباً)هەر بە ئومێدی خوايە، لەوانەی خـۆی ئـەزانیٚ يـا خۆی نايان زانی.

بـۆ (خـاطر)ي خـوا بـە (تأمّـل) بـە (تـدبّر) بـە (محاكمـە) قـورآن بخـوێنن؛ تەماشای (تفاسير) كەن، بەدوای قسەلۆكان مەكەون، ئەمرۆ گەلیٚ شت (ظـاهر) بوە، درۆيە زۆريان دەرخستوە ﴿لاَ مُبَـدِّلَ لِكَلِمَاتِـهِ﴾ (مُبَـدّل) بـو (كلمـە)ی وی نيە، ئەگەر (شريك)ی هەبیٚ– وَلَوْ بە (تشريك)ی بیٚ– ئـەبیٚ بتـوانی (تبـديل)ی (حكم)ی خوا بكا؛ ديارە (حُكـم)ي (قـضائي) (مُـراد)ە و (تـشريع)ی نـا – (مَـعَ أنَّهُ) (حُكم)ی (خوا (قائل)ی (نسخ) نيـە (إلا) (حُكـم)ی كـە لەبـەر (جهالـەت)ی (قوم) بە (شدەت) دانرا بیٚ، بەسەرت ئەخا، ناگۆڕیٚ ﴿وَلَنْ تَجِدَ مِنْ دُونِـهِ﴾ بـە (إختيـار) و بـیٚ (إختيـار) ﴿مُلْتَحَـدًا﴾ پـشت و پـەنا هـو (مَلجـأ)، (يَعنـی) نيـە ﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ﴾ (حبس)ی (نفس)ی خۆت كە، ڕای گـرە ﴿مَـعَ الَّـذِينَ﴾ لەگـەلّ ئەوانـەی (يعـنی) لـە (مُـصاحبە)يـان ﴿يَـدْعُونَ رَبَّهُـمْ﴾ (عبـادەت) ئەكـەن ئەپارێنـەوە؛ (ذاتـاً) (دوعـا) ش (عبـادەت)ە ﴿بِالْغَـدَاةِ وَالْعَـشِيِّ﴾ سـبەينیٚ و ئێوارە، يا (دائماً) (عبادەت) كە هەر چی بیٚ، (تعيين) (مقصود) نيـە ﴿يُرِيـدُونَ

﴿وَجْهَهُ﴾ (مراد)یان بەس (رضا)ي خوایه، چ (أمل) تریـان نیـه ﴿وَلاَ تَعْدُ عَيْنَـاكَ عَنْهُمْ﴾ چاوتیان لێ وەرمەگێڕە بیانکه (متطور)ي (نظر)ي (عنایـەت) گـەر چـی ئەمڕۆ کەڵکیان نیه، لەو (مضایقه) و (شدّەت) بەکار نایەن، (بـلال) و (سُـهیب) و (أمثال)ی وانه چیان پـی ئـەکریّ؟ ﴿تُرِيـدُ زِينَـةَ الْحَيَـاةِ﴾ تەماشـای (أنبـا)ی (دنیا) ئەکەی، هەم (مجلس) ت بن؟ بۆ ئارایش و زیباو ژیـن (الـدّنیا) (مُحقّـر) و (دَنـي)، (حاشـی) (جنـاب)ی (رسـالـەت) (مقـصد)ی نـەی ڕەنگـی (دنیـا) نەبوە.دیاره ئەگەر گەورە گەورەکان (مسلمان) بوویان (جنـاب)ی (هجـرەت)ی نەدەکرد، له (غار) خۆی نەدەشاردەوە، ئەو (ضعفا)یانەش هەنـده (عـذاب) نـه ئەدران؛ (لکن) (قاعده)یـه بـوه، بـۆ (پێغەمبـەر)آن دامـەزراوه تـا (خـاتَم)، کـه گەورە (صـنادید)ی (قـوم) (إیمـان)یـان نـەدەهێنا، (ضـعفا)یـەکان (سـبق)یـان ئەکرد، وه (عاقبەت) بۆ وان دەبیّ، بـەڵێ (قابـل) نیـه (أبـو جهـل) (إیمـان) بـه (محمد) بینی ﴿وَلاَ تُطعْ﴾ مُطْلَقاً، خاصةً له دوور کردنـی فُقَرایـان. ﴿مَـنْ أَغْفَلْنَـا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنَا﴾ کەسیّ اَدْنی خێرەکی تیـابیّ، خـوا دڵـی غافـل ناکـا لـه ذِکـري خۆی ﴿وَاتَّبَعَ هَوَاهُ﴾ گەلیّ کەس هەن، شتەکیان بەدڵی داهـات، دەرحـالّ دوای ئەکەون، تَأَمَّل ناکەن! له أوّلەوه قابله إصلاح بکرێن، که رسُـوخي تیـا بەسـتن وه بووه خوو له ناو قَلْبیان، قابِلي اِصْلاح نین! ﴿وَكَانَ أَمْرُهُ﴾ شأني له تَکَبُّـرو مُتابَعەی هەوا ﴿فُرُطًا﴾ مُتَجاوِز بووه، بۆیه خوا قَلْبي اِغْفال ئەکا.

﴿وَقُـلْ﴾ بەوانـه بلّـێ ﴿الْحَـقُّ مِـنْ رَبِّكُـمْ﴾ حـەق لـه طَـرَف خـوای ئێـوه بـۆ منه،وَحیاً حەقّي ناردووه، من تابِعي حـەقم، مُداهَنـه ناکـەم داخـوا ئێـوه إیمـان دێنن ﴿فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ مُختارن، وەکي بەوِ وجدان ئـەبینن ظاهِر و باطِن، جَبر و تضییقتان لەسەر نیه. حَتا (غَزالـي) اعْتِـراف بـەوِ وجدانـه ئەکا! خوا مَشیِّتي کردیـه، کـه إنسان بـه مَـشیِّئةْ ئـیش بکـا! تکلیفـی شَـرعي لەسەر عَقل و إختیاره، وه کەس ناڵێ إنسان بِالکُلّیه غَنیـه لـه خـوای! حاشـا! مُرادی مُعْتَزِلي له اِسْتقلال ئەمه یه (إنسان) لـەو (نَـوع) و (أفعـال)ە (إحتیـاج)ی نیه به (تَوجیه)ی (إراده)ی (کِبریـائی) بـۆ (خـصوص)ی ئـەو (فِعـل)، وه (إلاّ)

منداڵ ئەزانێ گەلێ (أفعال)ی (إختيار)هەيە، بەتەنێ پێ ی ناكرێ، لە (عَمرو) و (زَيد) (مُعاوَنە) (طلب)كا چۆن (مُؤمِن) ئەڵێ: "(عَبْد) لە (أعمال)ی خۆی (بالكليه) (مُستغنی)يە لە خوا" وە ياخود (مؤمن)ی (بالله) بێ وەبلێ: "خوا (إرادة)ي (إيمان) ئەكا بە (إرادة) بە (تكوينی)و (خَلق) و (إيجاد)، (شخص)ی (مُخالِف)ی ئەو (إرادە) (كُفر) لە خۆی پەيا ئەكا " (يَعني) (إرادە)ی (تكوين)ی (غَلَب)ە ئەكا بەسەر (إرادە)ی (تكوين)ی (إلە) (حاشی ثُمّ حاشی)، ئەمە (جَهل)ە (كُفر)ە، بەڵكو (أمر) (أمر)ی (تكليفی)يە، (إرادە) (إرادە)ی (تكليفی)يە، نە (تكوينی)؛(إرادە)ی (طلبی) (مُؤثِر) نيە، (خلق) و (إيجاد)ی پێ ناكرێ، ئەگەر كەسێ (مُخالَف)ەی بكا (عجز) نيە؛ لە (قَبضە)ی (قُدرەت)ی (إلهي) قورتار نابێ (جزا)ی ئەبينێ ﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ﴾ ئەوەی بە (إختيار)ی خۆی شتی بەد ئەكا، روو لە چاكە ناكا دوای (ميل) و هەوای (نفس) ئەكەوێ ﴿نَارًا﴾ ئاگرێ (أمّا) ئاگر؛ ئەوان (ذليل) و (عاجز)ن، خودا(قوی) و (قاهر)ە، ئاگری ﴿أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا﴾ (طبيعي) ئەوانە (ذَوات)ێ (كِرام) بە (كِبر) و (أنانيەت) و بەجاهو (جَلال) ئەبێ (خُيوم) و بارەگا هو سەرا پەردەيان، لە ئاگر بۆ هەڵدرێ؛ پەردەيی ئاگری (دەورە)يان بدات؛ ئەوجا ئەو جێ يە خۆشە، بە (صَفا)يە، دڵ گوشايە، روناكە، لەسەر ئايشك پاڵ ئەدەنەوە سەر باليفی (ناری)! ﴿وَإِنْ يَسْتَغِيثُوا﴾ بەدەها هاوار كەن ﴿يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ﴾ وەك قورقوشمی تاواوە ﴿يَشْوِي الْوُجُوهَ﴾ كە بۆ زاريان ئەبەن، لە هالاوی گەرمی روويان بەبرژێنی! ﴿بِئْسَ الشَّرَابُ﴾ ئەو ئاوە ﴿وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا﴾ ئاگرەكە باليفی خراپە، كە ئانيشكی ئەخەنە سەر ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ بە (إختيار) ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ (حَسْب الوقت وَالمقام) (نائل)ی (أجر)ی خۆيان ئەبن ﴿إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا﴾ (إهتدی) بە (قرآن) كەن، (عمل)ی (صالح) زۆر بە (قيمەت)ە، جەوهەری (إيمان)ە، ئەگەر (عمل)ی (صالح) نەبێ (إيمان) (فائدە)ی چيە؟ ﴿أُولَئِكَ لَهُمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ﴾ جێ ی (قرار) و ئارام و

(راحەت)ی ﴿تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمُ الأَنْهَارُ﴾ ئـاوێ خـۆش و (صـاف)و (خفیـف) و (لطیف)؛ (بَرّاق) و بەلوورى، بێ (خلط) و (میکروب) و (خَبیثی) ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِنْ ذَهَبٍ﴾ (علامەت)ێ شاهی، بازنی، زێڕیان لە قولّی ئەکەن؛ ئـەوە بـۆ (فقـیرو) بـێ (حُـرمـەت)ە کـانی سـووك وبـی (حُـرمـەت) لای (صـنادید)ی (قریش)ە ﴿وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا﴾ سەبز ﴿مِنْ سُنْدُسٍ﴾ وەك (خـز) و (خـارا) تەنك و (لطیف) و (خفیف) ﴿وَإِسْتَبْرَقٍ﴾ ئی ئەستوور وەك: (مخمر) و (أطلـس) و گەرمەسووت. کەسێك بازنی زێڕ لەسەر (لباس)ی سـەبز؛ بـەجوانی دی (لازم) نیە (عَلی الدّوام) (لباس)یان هەر سەبز بـێ؛ (دوام)ی (میـل) لەسـەر (لبـاس)ی سەبز (علی العموم). (الی الأبد) (مُحال) نیە چیە؟ ﴿مُتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الأَرَائِكِ﴾ شـاهانە وەك آورنگـی (حکمـداری) لەسـەری پـالّ ئەدەنـەوە ﴿نِعْمَ الثَّـوَابُ﴾: (حُلی) و (ثیـات) و (شـراب) ﴿وَحَسُنَتْ﴾ (أریکـە) کـان ﴿مُرْتَفَقًا﴾ (مقابـل)ی (مُرتفق)ی (أهل)ی (نار) ﴿وَاضْرِبْ لَهُمْ﴾ (أقویـا)ی (مُلحـد) (ضُعفا)ی (مُوحّـد) ﴿مَثَلاً رَجُلَيْنِ﴾ دوو پیاو: یەکی دەولّەمەند،یەکی لەو نزمتر؛ (ممکن) (فقیر)یش بووبی؛(مـسئلە)ی (أفعـل التّفـضیل)ی (آتـی) (سـهل)ە، (لـسان)ی (عربـی) بـە (تَفنّن)ە؛ ئەو دوو (رجل)ە بووین، نەبووین و (تفصیلات)ی مالّیان بێ (لـزوم)ە ﴿جَعَلْنَـا لأَحَـدِهِمَا جَنَّتَـيْنِ﴾ دوو بـاغ؛ وەك لـە بەهەشـت ئـەبی ﴿مِـنْ أَعْنَـابٍ﴾ (ممکن)ە یەکێ کولّك بووبی، یەکێك ئی سەرداران ﴿وَحَفَفْنَاهُمَا بِنَخْلٍ﴾ (دورە) مـان داون بـە دارخورمـا ﴿وَجَعَلْنَـا بَيْنَهُمَـا زَرْعًـا﴾ لـە ناوەنـدی دووباغەکـە؛ (ممکن)ە لە مەیانی داری باغەکان (بعض)ە جێ یە (واسـع) بـووبی، کرابـێ بـە (حُبوبات): لوبیا، پاقلە، فاصولیا... (ممکن)ە (بامیە) و (باینجان)یـش ﴿كِلْتَـا الْجَنَّتَيْنِ﴾ هەردووکیان ﴿آتَتْ أُكُلَهَـا﴾ بـەریان داوە ﴿وَلَـمْ تَظْلِـمْ مِنْـهُ﴾ لەبـەری ﴿شَـيْئًا﴾ (نقـص)ی، هـەمووی گەیانـدە جـێ، بـێ (افـات) و بـێ (غـش) وەك (فواکە)ی (أمریکا)ی. ئێستا بنوارە سێوی، بێ (غش) چـاوی پـێ گـەش ئـەبێ ﴿وَفَجَّرْنَا خِلاَلَهُمَا نَهَرًا﴾ لە (بَین)ی ئـەو دوو (جنّـەت)، جۆگـەیی ئـاوی هـەلّمان

قولاّند ﴿وَكَانَ لَهُ﴾ بۆ ئەو (شخص)ە، لەبەر ئەو (نهر)ە (غَیر)ی (إسقا)ی باغ و (زرع) ﴿ثَمَرٌ﴾ (فواکه) و (محصولات)یاخود (غیر)ی ئەو ئاوو بەراوە، (مال)ی تری زۆر بوو ﴿فَقَالَ﴾ رۆژێ لە رۆژان ﴿لِصَاحِبِهِ﴾ بە (رفیق)ی خۆی (أحدُ الرَّجُلَيْنِ) ﴿وَهُوَ يُحَاوِرُهُ﴾ ئەو (جُمل)آنه (دلالەت) لە بوونیان دەکەن ﴿أَنَا أَكْثَرُ مِنْكَ﴾ ئەمن لە تۆو زۆر نرم ﴿مَالًا﴾ لە (جهەت) (مال) و (دەولەت) ﴿وَأَعَزُّ نَفَرًا﴾ لە (جهەت) (قوم) و خۆیش و (عشیرەت) و (خَدم)و (حَشم) بە (قوەت) نزم؛ (ممکن)ە ئەو (ذات)ە (مال) و (قوم)ی زۆر کەم بووبێ؛ بە (تَهکُّم) وای دانایە. (خلاصە)ی بە (دولەت)و (ثروەت) و سامان (إفتخار) و شۆگایی بەسەر برادەرەکەی دا دەکرد ﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُ﴾ باغی خۆی لەوەختی بەر ﴿وَهُوَ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ﴾ بە (غرور) ﴿قَالَ مَا أَظُنُّ أَنْ تَبِيدَ هَذِهِ﴾ ئەو باغە بە (فَناء) بچێ ﴿أَبَدًا﴾ ئەوەندە بە (شوق) و (نظارەت) و (قوەت) و بەر بووە، لای وابووە (قط) نا (فەوت)ی دیارە (مقصود)ی وا نەبووە، ئەو باغە تا (قیام)ی (قیامەت) ئەبێ (دَهر الدّاهرین) ئەمێنێ هەر چەند کەریش ئەو گومانە نابا، ئەو باغە لە سایەی وی لەسەر شەنگ و (قوّەت) و (خُضرەت) (دوام) ئەکا. بێ(آفەت). ﴿وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً﴾ (ظَنّ)ی (حشر)ی نەبووە ﴿وَلَئِنْ رُدِدْتُ إِلَى رَبِّي﴾ وەکی تۆو (تَوَهم) ئەکەی ﴿لَأَجِدَنَّ﴾ ئەو (وقت)ی بێ (شك) (جنّەت)ێ ﴿خَيْرًا مِنْهَا﴾ لەو (جنّەت) لەبەر ﴿دَخَلَ جَنَّتَهُ﴾ (إفراد) جوانترە لە (تثنیە) ﴿مُنقَلَبًا﴾ کە بە (دوام) و (ثبات) (أَلْبَتّ)ە باغی (جنان) (دائماً) لە (ترقّی)یە بێ (آفات) ﴿قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ﴾ ئەوی نرم ﴿وَهُوَ يُحَاوِرُهُ﴾ (رفیق)ی دەئاخافت ﴿أَكَفَرْتَ بِالَّذِي﴾؟ ئەو خوایەی ﴿خَلَقَكَ مِنْ تُرَابٍ﴾ (الآن) چونکە ئەو (مادە) (مُکوّن) لە (أطعمە)یە لە خۆڵ پەیا ئەبێ؛ یابە (إعتبار)ی (أبو البشر) (أمّا) ﴿ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ﴾ لە گەڵ (أوّل) جوانترە ﴿ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلًا﴾ تەماشای (بَین)ی (ثُمّ) أن کە، (حقًا) دوورە؛ (علم) و (قُدرەت)ی (إلهی) لێکی نزیك کردینە (العِلْمُ عند الله) (إشارە)شە، بۆ (کیفیّەت)ی (أدا) ی ئەو (کلام)ە، بە چ (صورەت) و (مُدّە)یەکی (مُناسب)ی (حال) ئەو (أحوال)ی (طبیعیّە) بە

(عبارەت) نانووسرێ: (دقّەت) لە نووزەی (مندالّ) و بزاتی کە، بە (مقام) ئەوی گۆڕێ؛ (أهل)ی (لُغەت) ئەم (فلسفه)یان پێ (تحلیل) ناکرێ؛ گەورەیی (أعضا) و (قد) و بالاّ، لە (مقام)ی خۆیەتی، یان کەمێ بلّندو نەوی و قەبەو باریکە، بەچی (توافت=تفاوت) ئەکا؟ ﴿لَكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي﴾ ئەوەی (خلق)ی تووی کردیە لە (تراب) (الله)؛ (جَلَّ جَلالُهُ) (رَبّ)ی منە؛ جوانە ﴿وَلاَ أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَدًا﴾ توو هەر چی بی، من (مُوحّد) م ﴿وَلَوْلاَ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ﴾ (إحتمال)ی هەیە، یەکی لە (جَنّتين) (خصوص)ی (نزهەت) گاهی بووبی ﴿قُلْتَ مَا شَاءَ اللَّهُ﴾ ئەبێ بلّێ ی: " ئەو باغە بەو (حالّ)ە لە (مشيەت)ی (إلهی) ئەوەشێتەوە (إنشا)ی بکا ﴿لاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ﴾ ئەو داروبارو (ثِمار)ی من بەس لە (طرف) خوایە، بە (إدارە) و (إرادە)ی ویە؛ (طبیعی) ش بێ، لە ژێر (قوەت) و (قدرەت)ی ئەوە، هەرگاە، حەزکا هێزی نایەلّێ؛(مقام) (مقام)ی تەماشای (مُکوّنات)ە، (دخل)ی (أعمال)ی (عبد)ی تیانیە؛ ئایا بە (خلق)ی خوایە، یا بە (صُنع)ی (بشر)ە؟ (أمّا) (سُنّی) و (معتزل)ی (دائماً) ئەنوڕنە (عقید)ەی خۆیان، دەست ئەکەن بە (إستدلال) و (جواب) و (منع) و (مُعارض)ە ﴿إِنْ تَرَنِي﴾ ئەمبینی ئەزانی. ﴿أَنَا أَقَلَّ مِنْكَ مَالاً وَوَلَدًا﴾ لە جێی (نَفَراً)ە! یا لەوێش بە مَعْنا (أولاد) بێ چ قەیدییە؟ باوابێ! ئەوە وایە ﴿فَعَسَى رَبِّي أَنْ يُؤْتِيَنِي خَيْرًا مِنْ جَنَّتِكَ﴾ لە دونیاو لە عُقْبا. ﴿وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا﴾ جَنّتي توو! ﴿حُسْبَانًا﴾ بروسکەیێ، صاعقەیێ لێی بدا بیکاتە زەنەکاو، قابلیەتی داروبارو زَراعەتی نەمێنێ.﴿أَوْ يُصْبِحَ مَاؤُهَا﴾ ئاوی جَنّتەکە. ﴿غَوْرًا﴾ رووبچێ بە أرضا، بڕواتە خوار بۆ لای مَرْکَزْ. ئاگات لەناو أرضي هەیە؟ ألغام و يَنابيعي جَوْفي أرضي وەهایە، قابلِي تَبديلي مَجْراي نیە بۆ لای مَجْراي ئەو سَمْتە. ﴿فَلَنْ تَسْتَطِيعَ لَهُ﴾ بۆ ئاو﴿طَلَبًا﴾ چت پێ ناکرێ بۆ سەرخستنەوەی، ئەوجا باغەکەت هیشك ئەبێ، ئەو زَراعەتت پێ ناکرێ! حاصِلي حَوادثات ئەوەندە زۆرە کەسێ نَوْعاًما تَفَكرێكی هەبێ، بە دونیا مَغرور نابێ، وە بە هیچ وَجْهي لە قَبْضە ی قُدْرَتي

إلاهی نَجاة بوون تَصَوّر ناكریٚ! بەإیمان و كُفْري عَمرو زَیْد، ناگوٚڕیٚ! ﴿وَأُحِیطَ بِثَمَرِهِ﴾ قسەی صاحیٚبی نَوْعاً ما، بەجیٚ هات، أَمْوالي بە هیلاك چوو، مُمْكنە ثَمرەی جَنَّتەكەی مُرادبیٚ إضافەیی كراوە بوٚ صاحبي! بەری هاتبوە ئەو حالّە كە بِالفعل إسْتِفادەي لیٚ بكا. دەورەی درا ئافات بوٚی هات، هورره، ژەنگ، زەنگە سووره، وەك لەو سالّانە دوو سالآن ئەوەندە زوٚر بوو بەری باغانیان بوٚ خوٚ خوارد، صاحبیان مَحروم مانەوە. ﴿فَأَصْبَحَ﴾ ئەوجاكەدی چی بەسەر هاتووه ﴿یُقَلِّبُ كَفَّیْهِ﴾ بە كَمالي تَأَسُّف دەستی بەسەریٚكا دیٚنیٚ. گەلیٚ كەس لەوەقتی حیرەت و نَدامَت ئەو نَوْعە تَحریكاتە بەدەستی خوٚی ئەكا، هەناسەي ساردی لەگەلّ هەلّ ئەكیٚشیٚ، بەپەنجەی خوٚیدا ئەنوسیٚو ئەلّیٚ: واحَسْرەتا ﴿عَلَى مَا أَنفَقَ فِیهَا﴾ ئەبیٚ زوٚری لیٚ صَرف كردبیٚ، یاخود نَوْعاً ما گەوج بووه، لەسەر مَصْرَفي تَأَسُّف ئەكا، لەسەر ئەو ضَرَرە عَظیمە تَأَسُّف ناكا، وەهەم ئەلّیٚن: نَدم لەسەر أُموري إختیاریّە ئەبیٚ، إتْفاقەكە سەر بە إختیاري وی بووه، بوٚیە حَسْرەتي لەسەر ئەو خواردیە پەشیمان بوویتەوە!. بەلاّم ئەوەش لە جَهْله! ئەو وەقتی مَصْرَفي لیٚ كرد بە أَمَلْ بوو باغی مُتَوالی بەری ئەدا. پیاویٚ ڕووت كرابوو لە طَرَفْ (هەمەوەندان) ماینەكي بوٚرەي باشي هەبوو بردبوویان ئەیگوت: من غەمي ماینەكەم نییە چووه، أَمّا ئەوەم غەمە سەرو جلەوي تیٚك ئەچیٚ یَعني ولاّغی تَعلیم باش بوو ئەو تَعلیمەی نامیٚنیٚ! ﴿وَهِيَ﴾ جَنَّتەكەي ﴿خَاوِیَةٌ﴾ دیارە میٚوی سەردار ئەبیٚ ﴿عَلَى عُرُوشِهَا﴾ گیٚرو خوارو بیٚ بەر، وەك زگی برسی چوٚلّ، لەسەرداراني شوٚڕ بوو بوونەوە، وە مُمْكنە ئافەتی وابوویٚ دارەكانیشی بردبیٚ ﴿وَیَقُولُ﴾ دەستي بەسەر دەستی دا دەهیٚنا، ڕاست بەسەر چەپ، چەپ بەسەر ڕاست، وە ئەیووت ﴿یَالَیْتَنِي﴾ خوٚزیا ﴿لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّي أَحَدًا﴾ لە كائنات ﴿وَلَمْ تَكُنْ لَهُ﴾ بوٚ صاحِبُ الدَّولَة و النَّفیر. ﴿فِئَةٌ﴾ جَمْعي ﴿یَنصُرُونَهُ﴾ لە تَأنیث و افْراد گەریٚ، بنوٚڕە مَعْنا ﴿مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ كەس نەبوو یاردەمی بدا لە دَفْعي ئافەت یا لە جیٚی خَسارە مُعاوَنَتي مالیّەی بكا. ﴿وَمَا كَانَ﴾ خوٚی ﴿مُنتَصِرًا﴾ بە قووت و مُكْنَتي خوٚی. نگبەت شاني گرت، نەكەسي

مـا، نـەماڵی نـەقووەتی! ﴿هُنَالِكَ﴾ لـەو مَقـام وحالـە﴿الْوَلَايَـةُ﴾ نَـصْرەت و یاردەمی و مُدافَعە﴿لِلَّهِ الْحَقِّ﴾ بۆ کەسي تر نیە، بەس بۆ خووا ثابـت و مقُـررە، أما لازِم نیە بِالْفعل بیكا خصوص كە خۆی إرادە بكا، تا نەگاتە حَـدّي وُجـوب، نابیّ! ولَوْ حَدّەش ناگەڕێتەوە، أمّا بۆ أهْلي إیمان و صَبْر و شُـكر، أجْـري فـایق دادەنیّ! ﴿هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا﴾ بۆ مُؤْمِنْ. ئێمە چـەند سـاڵە مُبْـتلاین بـە أنواعي ئافەتي رەزوباغ. (إنسان)ی (فقیر) (موسلْمان)باغەكی هەیـە، لـە(أوّل)ی (شُباط)ەوە (خدمەت)ی ئەكا؛ ئەی بڕیّ، ئەی كێڵـیّ، پێمـەڕەو قـونێری ئـەكا، ئەگـەر بـەرئاو بـی، هەفتـە، هەفتـە ئـاوی ئـەدا؛ لـە (وقـت)ی پـیّ گەیـشتن، (آفەت)كی بـۆ دیّ، یـا (مَحـو)ی ئـەكا، یـابیّ(فائـدە) ئـەبیّ؛ (أولاً) كلـۆ زەردی (نَجـدي)، باغـاتی نەهێـشت، چ جایـە بـەر! پێـستی ئـەخوا، دوایـیّ ئەوچـوو، بە(نوع)یّ (خسارات)ی (حیوانات) لە (خسارات)ی وی زێتر بوو، لە (قەرەچوغ) گەرای ناوە، باران وانەبوو، (دنیا)ی شـین كـا؛ ژیـاوە، (چ) نـەبوو بخـوا، مـەڕو (مَواشی) بیّ (حَد) فەوتا، لەبەر بیّ لـەوەڕی، ئـەوجا زەنگەسـوورە، دەردەكـی داینی، نێوی خۆمـانی لـە (فكـر) بردینـەوە، دوایّ ژەنـگ و هـورە؛ گـەرما لێـی ئەدا، بیّ. كەڵك ئەبی، ژەنگ ئەی كاتـە رەژوو، ئـەو سـاڵ زسـتانی خـوش بـوو دارو بار بُرووت، باوی پشكووت، لە (شباط) كردیـە سـەرما، ئـەمڕۆ كـە (٢٥)ی (مارت)، باغ ڕووتە، تازە گڕ ئەبی، پۆقژەی ئەدا، بارانیش (مُتوالی)یە، نـازانین (عاقبەت) چۆن ئەبی؟ (ماشط الله، لا قوّة إلاّ بالله!) جـا ئـەی (كفّـار)ی (قـریش) بەو نەختە (ثروة) (مغـرور) بـووین ئـەو (فقـرا)یانـەتان لاسـووكن، نێزیكـە خـوا (دَور) بگـوڕی؛ ماڵتـان بـە (آفـەت) بـچیّ، ئـەوان ببنـە(صـاحب) (ثـروة)، ئێـوە (فقیر) ببن، چ دەسەلاّتتان هەیە؟ ﴿وَاضْرِبْ لَهُمْ مَثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ تا بكەوێتـە بەر (حِسْ)یان، تەماشاكەن، تا بزانن (دنیا) ئەو (قیمەت)ەی نیە، (إنسان) پـیّ ی (مغرور) بی و (إسـتحقار)ی كەسـیّ (مِثـل)ي خـۆی بكـا ﴿كَمَـاءٍ أَنزَلْنَـاهُ مِـنْ السَّمَاءِ﴾ (مَـدار)ی (حیـات)ە، زۆر (لطیـف)ە، بـیّ دەردە ﴿فَـاخْتَلَطَ بِـهِ﴾ بـە

ئاوەکە؛ (وَلَوْ أشاعِره) ش پێ یان ناخۆش بی ﴿نَبَاتُ الأَرْضِ﴾ شین بوو و بە (قوەت) و بڵندو بە هەڵەشك و تێکەڵاو بوویێ، چوو بێتە باڵ یەك؛(غایەت) (قوەت) و (نشأ) و (نما)ی بوویی. پاش ئەوە هەندەی پێناچێ، زەرد هەڵ ئەگەڕێ، هیشك ئەبی ﴿فَأَصْبَحَ هَشِيمًا﴾ (طبعاً) بە (آفات) تا؛ پارەی هەبێ پارە پارە ئەبێ، لە باڵ یەك دێتەدەر ﴿تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ﴾ با بەولا بەولادا دەی با، بڵاوی ئەکاتەوە، هەر (ذَرِه)ی ئەگەیەنێتە ولاتێ، (مَحو) و نابووت ئەبێ. (إنسان) بە (ثروەت) و سامان بەهەر (درجە)یەك بگا، (آخر)ی (تفرقە)یە، (محو) و پەریشانیە ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ﴾ لە (أمور)ی (تدبیر) و (تصرف)ی مەڵێ:" (مُعتزلی)" (مقام) ئەی گەیەنێ: هێشتا (شرع) دانەمەزرایە، بڵێین:" (مُراد) (عامّ)ە لە (أفعال)ی (إختیار)ی (إنسان)یش" ﴿مُقْتَدِرًا﴾ (نظر) بە (قُدرەت)ی (إلهی). (فرق)ی (فقیر) و دەوڵەمەندی ﴿الْمَالُ وَالْبَنُونَ﴾ بێ ینە (تصریح) بە (مرام) ﴿زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ (أولاد)یش لە گەڵ (مال)ی (دنیا) (زینەت) و ئارایش و (نقیش) نیگاری (حیات)ە؛ ئەگەر لە چاکە (صرف)بکرێ ئەبێتە مایەی (سعادەت)ی هەر دوو جهان ﴿وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ﴾ (تفسیر)بە ژن جێ ی نیە، گەرچی ژنی چاك، شیرینی (حیاة)ە (مَقام) (مَقام)ی (مُباهات)ە، ئەمان بیستیە (عرب) و (کورد) و (سائر)ي (أقوام)ی (غیور) بە ژن (إفتخار) بکەن. (تکبیر) و (تهلیل) و (تسبیح) و (تحمید) و (لا قوّة إلاّ بالله) (باقیات)ی (صالحات)ە بۆ (فقیر) آن و (حصر)ی باش نیە. لام وایە (رسول)ی (کبریا)ش پێ ی (راضي)یە؛ چاکی بە (ثمر) و (أثر) و (باقی) و (مُستمرّ) و (خێر) وەدەر، بۆ (دین) و (دنیا) (مُراد)ە؛ هەر (صنف) بە گوێرەی خۆی. بۆ من (تدریس) و (تحریر) و (تفسیر)، بۆ دەوڵەمەندان (کُتبخانە) دانان، (إدامە)ی (علم) و (عُلما ). ئەوانە ﴿خَيْرٌ عِنْدَ رَبِّكَ ثَوَابًا﴾ لەهەردوو جهان (ثواب)ن؛ (نفع)ی بۆ (دنیا) ﴿وَخَيْرٌ أَمَلًا﴾ بۆ (آخرەت) (حاجی عثمان) و (حەمشین) (قریب)ی صەدساڵ پێش ئەمڕۆ

(أوقاف)ی (عمومی)یان دانا، بو (طلبە)ی (کویە) ئەمڕۆش (دین) و (علم) (إستفادە)ی لێ ئەکا! (خیرات)یان (ثواب)یان لە (زیادی)یە. ﴿وَيَوْمَ نُسَيِّرُ الْجِبَالَ﴾ بۆیان ذکر بکا. ئەو ڕۆژە کە چیایان بە حەرکە دێخی، سەر عاردیان وەك هَبا، بە هەوا ئەخرێن. خۆ ئێوەش لە چیایان بە صَلاَبَة ترنین! بَشَري ئەمڕۆ ئەوا گەمەیی بە چیایان ئەکەن، ئەیان کۆڵن رێی شەمەندوفەریان بە ناودا ئەبەن. ﴿وَتَرَى الأَرْضَ بَارِزَةً﴾ بێ گیاو باغ و راغ و أشجار و أزهار، میوەی چی؟! دارو ثَرْوَة و مائي چی؟ ماڵ و مناڵ و زێباو زینەتی چی؟! ﴿وَحَشَرْنَاهُمْ﴾ گشتیان. ﴿فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا﴾ کەس تَرك ناکەین، هەموو دێنە مەیدانی عَرَفات. ﴿وَعُرِضُوا عَلَى رَبِّكَ صَفًا﴾ ئەگەر چی هەموو کەس تەك و تەنها دێتە مەیدانی حَشْر، أمَّا قابلە ئەوانەی بە قَوْم و عَشیرەت و أولاد و نَفیر مَغرور بووبن، بکرێنە صَفْ راگیرێن! جا ئەزانن ئەوانە بە هەوەس بەمَغروریی جاهلانە خۆیان هیلاك کرد، حَسرەت و ئەندۆهیان زیاد ئەکا.﴿لَقَدْ جِئْتُمُونَا﴾ ئەوڕۆ بێ دەسەڵات ﴿كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ لە دونیایێ. (سوورەیی ساقطە=زورنا سەقەتە=زەرنەقووتە=سوورەسەقەتە)، لە جووجەڵەی مریشك ناتەواوتر! ﴿بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّنْ نَجْعَلَ لَكُمْ مَوْعِدًا﴾ بۆیە لە هیچ نەدەگەڕانەوە، تَکَبُّرتان ئەکرد، عالەمتان لا سووك بوو! حَقاً مَداري هەموو گوناهان اِنْکاري حَشْرە! نازانم ئەوەی حَشْرەی أجْسادي لا نیە، کوو ئەڵێ من رَسولي خودام؟! ﴿وَوُضِعَ الْكِتَابُ﴾ دەفتەری أعْمالیان. ﴿فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ﴾ ئەبیني أیُّها النَاظِرْ! ﴿مُشْفِقِينَ﴾ ئەترسن. ترسانیان ﴿مِمَّا فِيهِ﴾ لە گوناهیانە.﴿وَيَقُولُونَ يَاوَيْلَتَنَا﴾ هاوار ئەکەن: هیلاك بۆ خۆمان! ئەی ماڵ وێران و خانە کوشتوي خۆیان!﴿مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لاَ يُغَادِرُ﴾ ترك ناکا، لێی ناگەڕێ، ﴿صَغِيرَةً﴾ گوناهی گچکە. ﴿وَلاَ كَبِيرَةً﴾ گوناهی گەورە.﴿إِلاَّ أَحْصَاهَا﴾ ژماردیتی، تیای ثَبْت کرایە، هیچی لا نەدرایە، نەشاردرایەتەوە﴿وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا﴾ سَیِّئاتي دونیا.﴿حَاضِرًا﴾ لەبەر چاویان، بەتەواوي ئەهاتەوە خَیال و خاطریان ئەوەمان کرد ئەوەمان کرد، پێ یان ناکرێ اِنْکاري هیچی بکەن! ﴿وَلاَ يَظْلِمُ رَبُّكَ﴾

سُبْحانَهُ! ﴿أحَدًا﴾ کەسێ لەوان و لە غَیْري. ﴿وَإِذْ قُلْنَا﴾ ئەو وەقتـەش یادکـە! بەسەریاندا بخوێنەوە! ﴿لِلْمَلَائِکَةِ﴾ مَعلومێ مَجْهولن! لای ئێوە زۆر گـەورەو لـە حَدْ بەدەرن. ﴿اسْجُدُوا لِآدَمَ﴾ سَجدەي حَقیقـي راسـتی، بَیانمـان کردیـە سـابقاً، ئەبێ وابێ، سَجْدەیان بۆ خوا عَلی الرَّأْسِ وَالعَیْنە، وکَذا (ابْلیس) مَمْنـون ئـەبێ سَجْدەی شُکُرْ ئەبا. ﴿فَسَجَدُوا﴾ حَسْبَ الأمـر، هـەموویان ﴿إِلاَّ إِبْلِیسَ﴾ لـەوان بوو، یا لە مەیاندابوو، ئەو اباي کرد لەبەر کِبرْ وەك ئێوە ئادەمی بە حَقیر زانـی خۆی لەوگەورەتر حِساب کرد. ﴿کَانَ مِنْ الْجِنِّ﴾ خۆی ئەگۆڕی لە مَلَكْ، بە مَلَـكْ خـۆی ئەنوانـد، أمَّا بـاطـني وا نـەبوو. مَلَـكْ مَعْـصومن، یـان نـا؟ دیـسان نِـزاعْ بەرپابوو، خۆزي تَحریریان کردبا! ئەگەر مَعصوم نـەبن، گوناهیـان چیـە؟ ئـەوا بە وَحي زانیمان عِصْیاني (ابلیس) با مَلَـكْ بـێ، مُخالَفـەی اَمْـري إلاهـي کـرد لـە سَجْدە بۆ ئادەم، مَلَكْ دیارنین لە عالـەمی غَـیْبن، گوناهیـان ئـەبێ بـە أثـر بـێ، مخالفـەی امـری شـرعی نیـە! ئـەبێ مُخالَفـەی تَکْـویني بـێ! ئەمـەش نـابێ! لەبەرخۆیان نا! لەبەر خووا، ئـەبن بـە مُعارِضـي إلاهـي، دزي و مـزي و قومـارو شَراب ئیشی وان نیە! بِناً عَلَیْه، إطاعـەیـان مجبوریـە، ئایـەت بیـانی إطـاعـە و فەرمان بەرداریان ئەکا، بۆ مَدْحیان نیە، رَغْمَ أنْفي عبایانە! وە ئەوانـەی ئـەڵێن مَلَكْ بَناتُ الله ن ﴿فَفَسَقَ عَنْ أمْرِ رَبِّهِ﴾ دەرچـوو لـە طاعَـةْ، سَجْدەی ببردبـا بـۆ آدەم، عیني إطاعەی بـاری بـوو لـەو مَقـامـە! ﴿أفَتَتَّخِذُونَـهُ وَذُرِّیَّتَـهُ أوْلِیَـاءَ مِـنْ دُونِي﴾ أولادو أتْباع و مَنْ عَلی شاکلَتە، لەسەر ئێوە طَرد کراین، ئێوە إطـاعـەي ئەکەن؟ ئەیپەرستن؟ اصْعادي ئەکەنە مَقامي الوهیّەت، لە عِلم و قُدْرَتْ! ﴿وَهُـمْ لَکُمْ عَدُوٌّ﴾ ئێوە بشیان پەرستن، ئەوان هەر دوشمنی ئێوەن! ﴿بِئْسَ لِلظَّـالِمِینَ بَـدَلاً﴾ (أنّـهُ) لـەباتی خوایـان (قبـول) کردیـە؛ (أولاد) و (ذُریـەت)ی هەیـە؟ چ (قَید)ی یـە؟ کـوو ئـەڵێن: "ملائکـەتی گـەورە، خـۆی ئەهاوێتـە نـاو ئـاو؟ خـوا ئەزانی چ (نوع) ئاوێکە! خۆی ڕادەوەشێنێ، لەهەر (قطر) (ملائکـە)یـە (خلـق) ئەکرێ" ئی (إبلیس)یش شتێ وابێ، خۆی لـە ئـاوی (خبیـث)هـەڵ کێشێ بێتـە دەر، لەهەر (قطرە)یە لێی بەر بێتەوە، (إبلیس)یکی لێ (خلق) کرێ. (بعض)ی

لە (نُقّال)آن ئەلێن:" (أولاد)ى (إبليس) لە (صُلب)ى نا (مبارك)ى، (پێنج)ە يا(چوار)ە. لە (مُجاهد) (نقل) ئەكەن (أعْوَر) و (داسم)؛ ئەڵێ: "نازانم ئيشيان چيە؟" وە (مصوط) ئەڵێ:" (وَهُوَ صاحب الصّخر" (زَنْبُور) (تفرقە) ئەخاتە (بَين)ى (خەڵك)، (عُيوب)ى ماڵی نيشانی (إنسان) ئەدات؛ (ثَبر) ئەڵێ: "(صاحب المصائب) (بعض)ى ئەڵێن: (شرط)ە بە يەكێك لەو چوارانە: (مُختلف)ن" گوى يا ئەوانە لە (پێنج) هێلكەى (شيطان) پەيا بووين، لە بێ گويى ديارە هيلكە ئەكا، نالێى:" ژنى هەيە" نەيان بيستيە: (سَيِّد)ى (آلووسى) ئەفەرموێ: والله أعلم بصحه هذه الأخبار" من (كيف)م بەو (نقل)آنە نايە. خوا ئەزانێ ئەگەر (مُفسّرى) (مُعتزلى)يان نەبان، (تفسير)ى (نقال)آن، لە (نُقّال)آنى (بَنى إسرائيل)ى چاكتر نەدەبوون. (إبليس)و (ذُرّيەت)ى (إبليس) ئەو (قيمەت)ەيان نيە، (إتخاذ) بكرێن بە (أوليا)ى (أمور) تان ﴿مَا أَشْهَدْتُهُمْ خَلْقَ السَّمَاوَاتِ﴾ ئاگايان لێ نەبووە، ئاگاداريمان نەكردينە، هەر (وجود)يشيان نەبووە، يەعنى (شركەت)ى (خلق)ى ئاسمان ﴿وَالأَرْضِ﴾ يان، نيە ﴿وَلاَ خَلْقَ أَنفُسِهِمْ﴾ وەكى ئێوە ئاگايان لە (تكوّن)ى خۆيان و يەكترى يان نيە؛ چۆن ئەبنە (أوليا) تان ﴿وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ الْمُضِلِّينَ﴾ (شيطان) و (ذُريەت) و (أمثال)يان ﴿عَضُدًا﴾ (مُعين) و (مُقوىّ) خوا (أقوى الأقويا)يە، هيچ كارى بەوانە نيە؛ (أمور)ى (أُلوهيەت) و (ربوبيەت) بێ (مُداخلە)ى وانە. (حاصل)ى (أدنى) (شائبە)يان لەگەڵ (مقام)ى (ولايەت) نيە وەكى ئەوانى ئێمە؛ (ممكن) (ضمائر) بۆ (مُعاند)كانى (مُتكبر) بێ؛ ئەوان ئەوەندە (بصيرەت)يان نيە، تەماشاى (أيات)ى (سماوات) و (أرض) كەن؛ (دقەت) لە (خلق)ى خۆيان كەن، بێ چاوو گوێ و دڵن. ئەوانە كە (مُضِلّ)ن بە (مُعين) (إتخاذ) نەكراون، كە (نصرەت)ى (حق) بدەن، (عباد)ى خوا بۆ (صَلاح) (دعوەت) بكەن. (أمّا) (عَود)ى (ضمائر) بۆ (ملائكەت) لام زۆر جوان نيە. (عُلما) و (حُكما) گفت و گۆيان لە (بَدْأ)ى (خلق) كرديە؛ چۆن؟ چى؟ (أوّل) (خلق) كرايە؟ (طبيَعيّون)ى

(عصر) قسەیان سەیرە؛ (مَع أنّهُ) ئەگەر نەڵێم هەموو؛ (أكثر)ی (طلبه)ی (علم) (قبول)یان کردیە. (شموس) چۆن لە (أثیر) (ظاهر) ئەبێ؟ وە (سیّارات) لە (شموس)، وە (أقمار) لە (سیّارات) چۆن (إنفصال) ئەکەن؟ (کَأنَّهُ) (نار)، (نار)ە؛ بە (درجات) (تَبَرُّد) ئەکا. (مُحقّق) (رسول)یان (بیان)ی فەرمووبا(إیمان)یان پێ نەدەینا؛ بە (تعیین)کەس نایزانی؛ نازانم لە (بَدأ)ی (خَلق) شوو ڕۆژ، شەموویەك شەموو کوو (تقرّر) ئەکات؟ (أمّا) (نُقّال) گومراهەکان، بێ(محاکمه) (قبول)ی ئەکەن! (خَیّام) ئەڵێ:

این بحری وجود آمده بیرون زنهفت
کس نیست کی این جوهر بتحقیق بسفت
هرکس سوخەنی أزسری سودا گفتند
زُ أمری وَی کی هَست کس نمیداند گفت

نازانم ئەو هەموو (قرائەت)ی (مختلف)، لە (عَضُد) بۆ؟ بە دوو (ضَمّ) چ (نزاکەت)ی هەیە؟ ﴿وَیَوْمَ یَقُولُ﴾ (جناب)ی (کبریائی)بۆ ئەو (مشرك)و (مُضِلّ)انە ﴿نَادُوا شُرَكَائِي الَّذِينَ زَعَمْتُمْ﴾ هاواریان کەنی، تکاتان بۆ بکەن (نجات) دان بدەن ﴿فَدَعَوْهُمْ﴾ هاوار ڕۆژتان هەر ئەوڕۆیە ﴿فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُمْ﴾ (عاقل)کان، (أحیا)یەکان ﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ﴾ (مُغیث) و(مُستغیث)؛ (داعی) و (مدعو) ﴿مَوْبِقًا﴾ (وادی)یە جێ ی بە (هلاك) چوون، ئەگەر پێ یدابین (هلاك) ئەبن. (تفسیر)ی بە (عدواەت) (وَلَوْ) (مجازی) بی جوانە؛ هەندی قسەی تریان فەرمووە، (کیف)م پێ یان نایە ﴿وَرَأَى الْمُجْرِمُونَ النَّارَ﴾ دیتیان، بڕوایان کرد، هەیە ﴿فَظَنُّوا﴾ (أنَّهُ) نەدەکەوتە دڵیان بە (جَزم) کە ئەکەونە ناو ئاگر؛ گومانیان ئەبرد﴿أَنَّهُمْ مُوَاقِعُوهَا﴾ ئەی کەونێ، تێکەڵاوی ئەبن، دوای یە بۆیان (معلوم) بوو ﴿وَلَمْ يَجِدُوا عَنْهَا مَصْرِفًا﴾ جێگایە تیای لە ئاگری بگەڕێنەوە، نەی کەونێ، چ جێ ی وانە بوو﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا﴾ (تکرار) مان کردیە، مەعنای بە (فائدە) بە (صُور)ی (مختلفه) بە (تمثیل) بۆمان (إیراد) کردینە ﴿فِي هَذَا

﴿الْقُرْآنِ﴾ (كـريم)ى (هـادى) ﴿لِلنَّـاسِ مِـنْ كُـلِّ مَثَـلٍ﴾ (خاصـةً) ئەوانـەى بـە (رُعونەت)ى (نفس) و كەم (فَهم) و بـە (كِبر) و بـىٚ (مَيـل) بـن لەگـەڵ (علـم) و زانين ﴿وَكَانَ﴾ (أساساً) (جِبِلّةً) ﴿الإِنسَانُ﴾ به (أغلب)ى ﴿أَكْثَـرَ شَـيْءٍ جَـدَلاً﴾ (مُخاصَمه) و (مجادلات) و ڕەنگاندنەوەى به (باطل) و بىٚ هـوودەيى لـه هـەموو شتى زۆرتره. (توغّل)ئەكا، ئەكۆڵێتەوە، بىٚ جىٚ. قرآن خـۆى (إعـتراف)ى كـرد به (تكرار)؛ (حاجەت) به (إعتراظ) و (إعتذار)ى ئەو و ئەم نـامێنى. وه (مُحقّـق) (تكـرار) زۆر بـه (فائـده)يـه، لـه (كتـاب)ىٚ وەك (قـرآن) (لازم) هـەموو كـەس (إحاطة)ى پـىٚ نـادا؛ باسـىٚ (نَفـيس)ەيـه لـەم (سـورەت)ه نـا، لـەو (سـورەت) تووشى ئەبن، (إستفاده)ى لىٚ ئەكەن؛ ئەو (نوع)ه (مُجادله) له (مسلمان)آنيش هەن قسەيه، شتىٚ ئەكـەى، شـتىٚ ئێنێتـه نـاو، لـەوىٚ ئەچـىٚ بـۆ جـىٚ يـەتر بـه لاسارى. (حديث)ىٚ (نقل) ئەكا (سيدى آلوسى) به (إشكال)ى (ئـەزانى)، (لكـن) (حقيقةً) (إشكال)ى تيا نيه، (مُوافق)ى (حَق)ه. (حاصـل)ى شـەوىٚ (جنـاب)ى (رسالەت) لەدەركەى (إمام)ى (على) ئـەدا، ئەفـەرموىٚ:" بـۆ نوێـژ ناكـەن؟"— (يَعني تَهجُّد) — (إمام)ى (علـى) ئەفـەرموىٚ: "ووتم: (يـا رسـول) (روح)مـان بـه دەسـت خوايـه، ئەگـەر حـەزكا بـه (خَـبر) مـان بـێنىٚ، بـه (خـبر)مـان دێـنىٚ؛ (حضرەت)ى (رسول) گەڕاوه، چى نەفـەرموو؛ دوايـه گـوێم لـىٚ بـوو، لـه ڕانـى خۆى ئەدا، وه ئەو (جُمله)ى ئەخويندەوه"

(أوّلاً) بنـواڕه (مُجادلـه)ى (عُلمـا)يـان، لـه (شمـول)ى (علـم) و (قـدرەت)ى (إلهى) چ دەڵێن؟ خوا (علم)ى به هـەموو شـت هەيه؛ كـه وابـى ئـەوەى بزانـى دەبـىٚ؛ (بالـضرورةت) ئـەبىٚ، ئـەوەى بزانـىٚ نـابىٚ؛ (مُمتنـع) نـابىٚ، (قُـدرەت)و (قُوەت) بۆ كەس نيه، هەمووى به (خلق)ى خوايه؛ (تأثير)ى بۆ كەسى تر نيه؛ (لاشَك) ئەوه(مُخالِف)ي (مُـشاهده)يـه؛ (مُخـالف)ى (كائنـات)ه. (هُـشامى بنـى حكـم) ئـەڵىٚ: ((خـوا (جزئيّـان) نـازانى، وه (إلّا) (لازم) دىٚ، خـوا (فاعـل)ى (بالإيجاب) بىٚ، وه (كذا) (لازم)دىٚ (إنسان) (إختيار)ى نەبى؛ خۆ به (مشاهده)

دیارە (مُختـار)ە، (قـدرەت)ی هەیـە (مُـؤَثِّر)ە." دیـارە لای (إمـام) و (هـشام) (علم)ی خوا بە (جزئیات) لەگەڵ (إختیار) و (قدرەت)ی (إنسان)خـڕ نابێتـەوە. (إمام) ئـەڵێ: "(إنسان) (غـیر)ە مختـارە "(هـشام) ئـەڵێ: " خـوا (علـم)ی بـە (جزئیـات) نیـە" كـە (عـلاوە)ی (كرامـەت)یـش بـوو، ئـەوجا مەپرسـە! بـە (كرامـەت)ی (شـێخ)ی حوشـتر لەسـەر (منـارە) (حـەیران)ی ئـەگوت! (تَمـام) (كرامةُ الأولیاء حَقٌ والله قادرٌ عَلی كُلِّ شيءٍ). وەرە خوار، كەسێ ئیشێ (غایەت) ناشیرین ئەكا، نـاتوانێ بڵـێ: "مـن كـردم" ئەوەنـدەی پـێ (عـار)ە؛ ئـەڵێ: "چ بكەم، (إرادە)ی خوای بوو، خوا پێ ی كردم" جوتیار شكارتەی خۆی زۆر چاك دی، وە بە بڕیـار؛ ئـی (صاحب)ی وانایـە، بـۆ؟ ئـەوە كـاری خوایـە! نیوەكـار گارجووتی توو هەموو ساڵێ ئەمرێ؟ ئەی نـامرێ؟ بـۆ؟ (إرادە)ی خوایـە؛ چـما بەدەست منە؟ وەرە خوار منداڵێ (فەڕاقە) سبەینان درەنگ هەڵدەستی، بـەلام ووتیان: "سـبەی زوو ئـەڕۆین بـۆ سـەیران، بـۆ (چـنارۆك) " پـێش ئـەوانی دی بەخەبەر دێ! (بعض)ێ (أَنَّهُ) (إدّعا)ی (حضور) ئەكـەن؛ ئـەمڕۆ ئـەڕۆی؟ خـوا ئەزانێ كەی (تشریف)ت دێتەوە؟ خوا ئـەیزانێ. هەرچـی بیڵـێ ی (ئەگـەر خـوا حەزكا، ئەبێ). یەكێ لەوانە زۆرم خۆش دەویـست، پیـاوێ بـاش بـوو؛ (دَفـع)ە یە، كاریكی هەبوو لە (حكومەت) (مستعجل) و (مُهم)، ئەهاتـە لای مـن (سـعی) بۆ بەكەم؛ ئەم ووت: "ئەگەر خوا حـەزكا، ئـەبێ؛ ئەگـەر خـوا حـەزكا، دەچـمە سەرای؛ تاڵووكەی چ پـێ دەوێ؟ ئەگـەر خـوا حـەزكا، ڕێـك ئەكـەوێ" ئـەویش سەغڵەت بوو، ئاگای لە (خوا حەز كا)ی نەمابوو. " (فاسـق) و (فـاجِر) ئـەوەی ئەیكەن، بە (إرادە)ی خوایـە، خـوا ئـەزانێ (قبـل الوقـوع) ئـەوەی ئـەی كـەن؛ (علم)ی خوای نابێتە (جَهل)؛ (خصوص) (وَلِی) كە لە(لـوح)ی دیـت، ئـەو كـارە ئـەكا؛ (حتمـاً) ئـەی كـا؛ ئەگـەر گونـاهی (كـبیرە)ش بـێ، (خێـر)ی ئـەگاتێ (إمتثال)ی (أمر)ی (تكوینی) كردیە، (عَنْ عَیان) دیویەتی. (حتیّ) لـە (بعـض)ە (كتیب) دیومە (شخص)ی (مـسیحی) ئـەڵێ: "(تطـوّر)ی خـوا لـەزگی (مـریم)ە

(شيء)ە، وەخوا لەسەر هەموو شتێ (إقتدار)ی هەیە "بنواڕە (جِدال)یان! (إنسان) با(وجود)ی (مكلّف) و (مأمور)ە (إختيار)و (قدرەت)ی (مُؤثّري) نيە؛ (أمّا) (جنوكە) (مُقتدر)ن خۆيان (مُتشكِّل) بكەن بە (أشكال)ی (مختلفە). (فائدە)ی نيە، خوا (إرادە)ی وايە، ئەبێ ئێمە لە ژێرەوە بين، وە (إلاّ) ئەيتواني وا بكا، ئەوانە لە كۆڵ كاتەوە. بنۆڕە (رسول)ی خوای (أصحاب)ی (كرام)ی، بە (عموم)ی (قدرەت) و (علم)ی خوای (سعی)یان (زياد) بوە، بۆ (نشر)ی (دين) (روح)يان بەخت ئەكرد؛ (كفر)يان (إزالە) ئەكرد (مع أنّهُ) (شامل)ی (أنام) بوو، (مُراد)ي (إلە) بوو. ئيتر دیارە فەرموودەی (إمامی علي) لەو (نوع)ە (مَقول)يە؛ (رسول)ی خوای پێ ی (راضي) نەبوە. تۆ (أهميّەت)ی بدەرێ، بيكە بە مەراق؛ بزانە شەو هەڵ ئەستی لەخەو يان نا؟ (علی كل حال) (نفس)ت (روح)ت بەدەستی خوايە؛ ئەگەر بە هۆش تەماشاكەی.

لەپەنای ئەو (آيەت)ە ئەفەرموی﴿وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَنْ يُؤْمِنُوا إِذْ جَاءَهُمُ الْهُدَى﴾ (يعنی) (جِدال)ی (بالباطل) چيان پێ ئەكا، (حتّی) (أصحاب)ی (إمامی) لە (جواب)ي (مُعتزلي)يان ئەڵێن: "(مُراد) (مانع)ی (حِسّي)يە" (يعنی) ئەوان (حسبَ الظاهر) چ (مانِع) نابينن، بۆيە خوا وا ئەفەرموێ: وە (إلاّ) (مانِع)ی (معنوي)هەيە؛(علم)ی (باري) بە (عدم)ي (إيمان)يان وە (داعي) بۆ (كفر)يان (مانع)ن لە (إيمان). ئەوا لە سايەی (كشف)ی (إمام) ويارانی، ئەو (سِرّ)يان (كشف) بوو، ئەگەر بڵێن: "(مانع) (علم)ی تووە بە (كفر)ی ئێمە، ئەو (داعی)يەكە لە (طرف) تووە، نايەلێ (إيمان) بينين، ئەڵێن: "چی؟! " لاشَكْ ئەگەر حَضرەتی رَسُول ئەو قسانەی لەو مەلايانە ببيستبا، لە هەردوو ڕانی خۆی ئەدا! حَقاهيچ مانِعْ نيە كە إزالە نەكرێ!. عِلْمي كبريائي، عِلم عَلي الإطلاق وَظيفەی وي كُشفە تَجَلايە، عَلی ماهُوَ عَلَيْە. مَعلوم لە عِلم أوصاف وەرناگيرێ، وَكَذا عِلم لە مَعلوُم. شمولی قُدرەتی كِبريائي ديارە! بۆ عالەمي تِكَوْنيە! بۆ أمورێكە عائِدي تَدبيرو تَدويري مَلك بێ! قاعِدە دانان ڕآساً بۆ

وییە، دوایێ جُزئیان لە تَحْتي قَواعدْ وَظیفەی خۆی ئەبینێ، بە گوێرەی أصلي مَشیئَةْ دَوَران ئەکا!. حَسدْ، کِبْر، حُبّي رِئاسەت، مَیلْ، عَلاجیان ئەبێ! خاصَّة نَظَر بە لُطفي خواو پاکی رَسول!. (بَني أُمَیةً) مُسلمان بوون، چ زەرەریان کرد؟ مُلك و رئاسەتیان لە قیس چوو؟ یا لە سایەی دین، بوونە خلیفە و مَلِك الملوك! هیچ شت ئەوانی مَنع نەکردیە لە إیمان﴿وَیَسْتَغْفِرُوا رَبَّهُمْ﴾ طَلَبي عَفو و لێ خۆشبوون بە تَوبە. ﴿إِلاَّ أَنْ تَأْتِیَهُمْ سُنَّةُ الأَوَّلِینَ﴾ قاعِدەي إلاهي دائرْ بە أُمَمي سالِفە، بَعْدَ الفساد، إسْتئْصالیانە! ئەوانە إنْتِظاري هاتنی هلاك و مەحوِي خۆیان ئەکەن، إیمان نایەنن، تا مەحو ببنەوە! ﴿أَوْ یَأْتِیَهُمُ الْعَذَابُ قُبُلاً﴾ بەرانبەر عَیانْ، ظاهِر هووەیدا! ئەگەر لە دونیا نەبوو، لە قِیامەت، کە وابێ دیارە مانِعْ نیە، ئەوەندەیە ئەوانە بە ئارەزووی خۆیان، خۆیان دووچاري عَذابي إلاهي ئەکەن!! لەهەموو أنام بێ حیاتر، ئەگەر بزانێ منداڵێ ئاگادارە، بَعضە نیش هەیە نایکا! کێهە کەسی مل و مەیلی قَوییە، بە زیللەی ئەنیشێتەوە، نایمێنێ!. قرائەتي (قَبِیلا) لام خۆش نیە! مَقامي (قَبیل) و (قُبَلْ) جوایەزە! ﴿وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِینَ﴾ أولاً وَ آخِراً بە هیچ شت. ﴿إِلاَّ مُبَشِّرِینَ﴾ بۆ مُؤمِن. ﴿وَمُنذِرِینَ﴾ بۆ مُنْکِرْ. ﴿وَیُجَادِلُ الَّذِینَ کَفَرُوا بِالْبَاطِلِ﴾ لە صاحیب دەوڵەت و قووەت و مُکْنَتو حَشْمَة و رِئاسەت، بە واسِطەی ئەو أموري زائِلە، طُغیانیان کردیە، مُجادلەي باطِلي بِالْباطِلْ، بە إقْتِراحي أموري نا بەجا ئەکەن! ﴿لِیُدْحِضُوا﴾إبْطال ئەکەن﴿بِهِ﴾ بە باطِلْ. ﴿الْحَقَّ﴾جِدالي کافِري بِالباطِلْ، بِالْباطِلە! بەو جۆرە جِدالە ئارەزوویانە حەقێ پێ بزە لەقێنن، وە إلا حەق بە باطِل إبطالْ ناکري! امَّا بە تَلْبیس ئەتوانن صورەت بگۆڕن، باطِلْ تَصویر ئەکەن بە حەق، لکنْ ئەوەی تَأْویلي مُتَشابهات بزانێ مُتَوَسِّمْ بێ، بۆفیان دەرئەخا!! ﴿وَاتَّخَذُوا آیَاتِي﴾ قَوْلي، فِعْلي، تکویني، تَکْلیفي. ﴿وَمَا أُنْذِرُوا﴾ عَذاب و جزا. ﴿هُزُوًا﴾ أنَّهُ کردیتیانە عَیْني قەشمەري. ئەوان، وان! رُسُلي کِرامیش لە مُقابَلەیان صَبر ئەکەن بێ فتور تَبْلیغي رِسالاتي خواي ئەکەن. ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذُکِّرَ بِآیَاتِ رَبِّهِ﴾ عام، ئي توو سائِري رُسُل، هەر قَوْمە لە

زەمانی خۆی! ﴿فَأَعْرَضَ عَنْهَا﴾ي لە آيات! گوێی ناداتیێ، پێی مُتَذَكِّر و مـتَّعظ نابیێ! ﴿وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ﴾ أَنَّهُ لە یادي نەمایە، بە دڵی دانـایـیێ چـی کردیـە ئەوەي کردیتي چەند بدە! ئەمە بۆ؟ ﴿إِنَّا جَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ﴾ لەسـەر دڵیـان. ﴿أَكِنَّةً﴾ غطاءً، پەردە، حجابیێ غَلیظ، زۆر مَذوماتي نَفسیّە﴿أَنْ يَفْقَهُوهُ﴾ نـەك فَهمـي کـەن، تێـی بگـەن، لـە قـرآن لـە کتـاب، بـە تـەواوي! ﴿وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا﴾گراني. بیێ دڵن بیێ گوێن، نابێن تـیێ ناگـەن! ﴿وَإِنْ تَدْعُهُمْ﴾تـوو ئەوانـە! ﴿إِلَى الْهُدَى فَلَنْ يَهْتَدُوا إِذًا﴾ لەبەر خصوصی توو﴿أَبَدًا﴾ بە زیللەتي ئەزانن بـە فەرمایشي توو إِهْتدا بکەن، ئەڵێن: مَقْصدي تَرَاسـە وَسَبْقە لـە ئێمـە! ئـەوەش نابیێ!﴿وَرَبُّكَ الْغَفُورُ ذُو الرَّحْمَةِ﴾ و إلاّ ئـەبا آنـاً پارچـە پارچـە مـەحوو نـابووت بان. ﴿لَوْ يُؤَاخِذُهُمْ بِمَا كَسَبُوا﴾ لـە سَيِّئات و قَبـایح و جِدالي بِالباطـل و قَلْبي حَقایق. (سَيِّدي آلوسي) ئەڵێ: كَسْبي أَشْعَري، عـەرەب فَهْمـي ناکـا!. مـەلایان تَحْريريان نەکردیە، ئەوان چۆني تیێ ئەگەن؟ بەڵکو لە مَعْناي حَقيقي لابيانـداوە کردیتیانە قَصْد کە مُقَدّمـەي أفعـالي كَسْبیە. ئەگـەر جـەنابی حـەق بیگرتبـان ﴿لَعَجَّلَ لَهُمُ الْعَذَابَ﴾ لەبەر شِدّەتی مُقْتَضـی ﴿بَلْ لَهُمْ مَوْعِدٌ﴾ لاي خوا، دانراوە. ﴿لَنْ يَجِدُوا مِنْ دُونِهِ﴾ ئەویێ ڕۆژیێ بۆ مُتَجاوِزْ لە خوا، یا ڕۆژ، یا عَذاب ﴿مَوْئِلًا﴾ مَـلاذو مَلْجـأو مَحْـرَر و مَخْلَـصْ، نیـە! ﴿وَتِلْكَ الْقُرَى﴾ ڕابـردوو﴿أَهْلَكْنَاهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا﴾ وەك أهلي (مَكّـە) کـە ظُلْمیـان بـە حَدْ گەیـشت، خـوا هیلاکـی کـردن. ﴿وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِمْ مَوْعِدًا﴾ کە رَجاي بە إیمانیان نـەما، كُفْـرو جَحْـود و عنادیـان بیَ إشْتِباه عَیان بوو، ئێوەش کـە وَعـدەي هـات، مَوعـود ئـەبینن!. ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى﴾ كَليم الله رَسولي عَظيمُ الشَّأن، لە سەرامداني أولو العَزم لـە ڕِسـالەتدا، وەکي (جَلال نوري) ئەڵێ: حَضرەتی مُحَمدًن كُچك برادەري!. أمّـا (موسـی بـنِ میشا)یا (بن مَریم بنِ یوسف يَعقوبْ) لە قُرْانْ باسي نیە! تَبـادُرْ بـۆ كَلمـە! ئـەو ماجَرایە یادەکە ذکرکە، تا بـزانن قیمـەتی عِلـم چـەند زۆرە! زاتـیێ وا صـاحِبـی (تَوْراة) و (يَدي بَيْضا) بۆ تَحْصیلي عِلم، مَشاقي سَفَري ئەچێژیێ، وە هەم بـزانن جەنابي حـەق، عِبـادي وي، چ إعْتِنـاي بـە ضُـعَفاء ئەکـەن! بـەڵکو ئـەو پیـاوە

ماقولانەش دێنە هۆش، علمێ پەیا ئەکەن، نَفْعیان بۆ بێ دەسەڵاتان ئەبێ! فَضل لەوە بیانکەنە مانِعي قَبولي دين و تَصْديقي رَسول و ئایاتی! ﴿لِفَتَاهُ﴾ ئەو بادەی أحْفادي (يوسف) (يوشَع بنِ نون بنِ إفْرائيم) مُلازِمي خزمەتی بوو علْمي لێ وەرئەگرت، یا خزمەتکارێکی تازە سنْ طَري و لاو، پێی ووت﴿لاَ أَبْرَحُ﴾ ناسەکنم، ئارام ناگرم ئەرۆم ﴿حَتَّى أَبْلُغَ مَجْمَعَ الْبَحْرَيْنِ﴾ کێندەرە؟ نازانم! (مُجاهِدْ) ئەوا قەیدی نیە، بێ ئاگایە لە جُغرافیای أرض، أما (بَیْضاوي) بۆ دوایی ئەکەوێ وەك (فَتی)ی (موسی) ئەڵێ: مُلْتَقاي بَحْري فارِس و ڕۆمە؟! ئەو دوو بَحْرە تَلاقي ناکەن! هەریەك لە مَصَبِّێ ئەچێتە بَحْري مُحيط! وە ئەو سَفَرە لە (تَيْه)ي دابووە، یا لە (مِصر)، پاش رِجعتَي بَني إسرائيل بۆ (مِصْر)، کە صاحبی (نَظرە) إثباتي کردیە لە تَأريخي کۆن، دوای غَرق بوونی (فِرعَون) حَضرەتي (موسی) مَعَ قَومە چوونەوە (مِصر) سێزدە ساڵان مانەوە دوایێ وەدەرکەوتن نەچوونەوە (مِصر) في الْحقيقة بعضە آياتي قُرْاني ئەیگەێنێ یەکێ ئەڵێ: لای (طَنجْە)، یەکي ئەڵێ: لە (أفریقیە)، یەکي ئەڵێ: لە أرمَنْیە.، رَجْماً بِالْغَیب قسان ئەکەن!!. فەرمووی ئەڕۆم تا ئەگەمە (مَجْمَعْ الْبَحْرَین) بە مَعْنا (قوڕنە) لە هەموو مَعنای تری پەسەندترە! ﴿أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا﴾ هەر ئەڕۆم ناگەڕێمەوە وَلَوْ گەلەك ساڵم پێ بچێ. سَبَبي ئەو سَفَرە چ بوو؟ چەند وَجْهیان بۆ بَیان فەرمووە مُراجَعە بە تَفسیري (روحُ المَعاني) کە مُمْکنە خَبَري ئەو زاتەي بیستبێ، چووە بیدۆزرێتەوە بزانێ ئەو نَوْعە کاري ظاهِرْ قَبیحي بۆ ئەکا؟! ﴿فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا﴾ بَحْرین. دیارە عَلامەتێ وا ظاهِري نەبووە بە طَريفي فَرق کرێ بەوەی عَلامەتي بۆ دانراوە لە طَرَف (باری). ﴿نَسِيَا حُوتَهُمَا﴾ لەوێیان لە فکرچوو، نە (موسی) بیری کردەوە، نە رفیقی! ﴿فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا﴾ ئەڵێن: "(أمر) کرا (موسی) ماسی باوی (مِكتَل) - (عەلاگە)، لە کوێ ماسیەکەت لێ گوم بوو، (مطلوب) لەوێ یە؛ لەو جێگایە بەردەکی لێ بوو، خۆی و (رفیق)ی بۆ لای وی چووین، لەوێ ماسیەکە زیندی بوویتەوە؛ چوویتە ناو (بحر)؛ ئەوان ئاگادار نەبووین؛ چۆن زیندی بوویتەوە؟ بە ئاوی

(حیـات)؛ کـەوابێ تـا (قیامـەت) ئـەمێنێ" (أمّـا) وەکـی (سـیّدی آلووسـی) ئەفەرموێ: "(یوشەع) لێ ی خواردەوە– مع الأسف – (وفات)یشي کرد" بەڵێ ئەگەر ئەویش گوم بووبا، ئەیانتوانی بڵێن (ماوە، و ئەمێنێ وەك(خـضر)ی ؛ تـا (قام)ی (قیامەت)!) (ماسیەکە ئەو جێ ی پێ یـدا چـووە، لـە نـاو (بحـر) لێـك بوویتەوە بۆی، وەك (بنـا)یـە (قُبّـە)یـە (مُقـوَّس)) لـە (خَبَـر)ي (نَقـل) ئەکـەن، ئەوەی پێ ی ئەکەوت لە (بحر)هێشك ئەبوو، (حتّی) ئـەبوە بـەرد؛ وە نیوەیـان لێ خواردبوو، لە (بحر) (نَسل)ی پەیا بوو بوو، لـە نیزیـك شـاری (سَیتە) (أبـو حامد)ی (أندلسی) ئەڵێ: "ماسیەکم دیت لەو (نَسل)ە، لایەکی بێ گۆشت بوو" (سیّد) ئەمە (إنكار) ئەکا. لە (أخبار) وا دەرئەکەوی (موسـی) و (رفیـق)ی بـەو قەیسەریەدا ڕۆیشتن، تا لە (جزیره الخضرا)ی (غـرب)هاتنـە دەر، بـە (خـدمت) (ذات)ی (مُحـترم) گەیـشتن. (بـاری) (إلـه)ە، ئێمـەش وەکـی ئـەو (ناقـل) آنـە (إیمان) مان بـە (قـدرەت)ی تـوو هەیـە؛ (لکـن) ئـەو قـسانە، ئـەمڕۆ (مُقابـل)ی (حُکمـا)ی (طبیعیـەت) و (ناشـئە)ی (عـصر) چـۆن بنوسـین؟ کـووی (إثبـات) کەین؟ لام وایە (إصرار) لەسەر ئەو (نقلیّات)ە (مانع)ی (هدایەت)ە؛ بە (هُـدا)ی (قـرآن). ئەفـەرموێ: "نَحـنُ معاشِـر الانبیـاء، أمِرْنـا أنْ نُكَلِـمَ النّـاسَ عَلـی قَـدَرِ عُقولِهم" (عقل)ی (مُنوّر)آن ئەوقسانە (تحمّل) ناکا، پێ ی (هضم) نابێ. ئەگـەر بڵێ ی: (قبول)ی ناکەی (کافر) ئەبی پـەکی پـی ناکـەوی، وە پێـشی سـەغلەت نابێ؛ ئەو (سلاحه)ش (ناشُکر)ی نەبی کول بووە، بێ (تأثیر)ە. (لازم) چـارەی بکرێ؛ نە شیش بسووتی نـە کـەباب! ﴿فَلَمَّـا جَـاوَزَا﴾ لـە (مَجمـع) تـێ پـەڕین، ماندی بوون ﴿قَالَ﴾ (موسـی) (علیـه السلام) ﴿لِفَتَـاهُ آتِنَـا غَـدَاءَنَا﴾ قـاوەڵتی ﴿لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا﴾ هـەمووی یـا ئەوەنـدەی (زائـد)ە ﴿نَـصَبًا﴾ مانـدی یـەتی. لـەو (سـفر)ە مانـدوو بـووین ﴿قَـالَ أَرَأَيْـتَ إِذْ أَوَيْنَـا إِلَـى الـصَّخْرَةِ﴾ (إلتجـا)مـان کـرد، بـۆ وی بـەردێ ﴿فَـإِنِّي نَـسِيتُ الْحُـوتَ﴾ لـەو یێنـدەرێ ﴿وَمَـا أَنْسَانِي إِلاَّ الشَّيْطَانُ﴾ بۆ (أمور)ی کە چ (سَبب) نەدۆزرێتـەوە، (نـسبەت)ی بـۆ

(شیطان) ئـەدەن؛ وە (فائـدە)ی لـەو (سـورەت) ئاشـکرایە؛ پـاش (سـجد)ە نەبردنی بۆ (آدَم) ﴿أَنْ أَذْكُرَهُ﴾ بێتەوە یادم ﴿وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ﴾ ئەگـەر ئەمە (کلام)ی (فَتی) بیّ، دیارە ئاگای لیّ بووە، کە ماسیەکە کەوتیتە (بحـر) و رۆی یە. لەسەر ئەو (حال)ە، لە یادی چووە؛ (حضرەت)ی (موسـی)ی ئاگـادار نەکردیە؛ جیّ ی ئەوەیە ﴿عَجَبًا﴾ بـۆ ئـەو حالّـە بـیّ. (حقـاً) (عُجْـب)ە؛ ئـەوە (عجا)بیە، لە یادی بچیّ (مع أنّه) (إعلام)یـش کرایـە، لـەو (وەقـت)ە (إعـلام)ی (حضرەت)ی (موسی)ی بکا ﴿قَالَ ذَلِكَ﴾ ئەو (مکان)و (مأوا)یە ﴿مَا كُنَّا نَبْـغِ﴾ بـۆ (مقـصد)ی (أصـل)ی و (علامـەت)ی (مَطلـوب)، (مَطلـوب)ە ﴿فَارْتَـدَّا﴾ هەردووکیان ﴿عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا﴾ بەرِیّ خویاندا گەرِانەوە ﴿فَوَجَدَا عَبْدًا مِنْ عِبَادِنَا﴾ کیّ بووە! ئەگەر (فائدە)ي هەبا خـوا (بَیـان)ی ئەفـەرموو؛ (مَـعَ هـذا) (نُقّال)ان –رجماً بالغيب– قسەیان لـیّ کردیـە. (مُرَجَّـحْ) لای (جمهـور) (خـضر) بووە؛ ئەو (خضر)ە کێیە؟ بـاز نـەی معلـوم! "کـورِی کـیّ بـوو؟ (مَجهـولٌ مِـنْ مَجهولٍ)؛ (قیل)ی ئەڵیّ: کورِی (فرعون) بووە" ئەوجا بۆ (إظهار)ی (قـدرەت)ی (حق) لە (مقام)ی (تَعّجب) ئەڵیّ: "سُبْحانَ مَنْ يُخـرِجُ الْحَـيَّ مِـنَ الْمَيِّـتِ، ويُخـرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحيّ!"

ئەوجا لەگەڵ (کعب الأحبار) برِۆ بۆ (بحر)ی (هند) تا (قمر)ی (بحر)ی (هند) بزانی؛ وای (کعبُ الأحبـار) کـوو (مُـسُلْمان)ت لـە گێـژاوی (جهـل)دا، خنکانـد! (سیّدی آلوسی) ئەفەرمویّ: " ئەو (أقوال)ە هیچی لای من، راست نیـە " (رأی) (جَمهور) (بَلیابن ملکا) بوە (تمام)، دەبیّ (ملکا) (معلوم) بـیّ؟ ﴿آتَيْنَـاهُ رَحْمَـةً مِنْ عِنْدِنَا﴾ یەکیّ ئەڵیّ: رزقي حَلال و عَیشي رَغیـد، یـەکیّ ترعُـزْ لـەو إسْـتتاري نارد، یەکیّ دیکە طُولي حَیاة و سەلامەتی بَدَن، جَمهـور ئـەڵیّ: وَحْـي ونُبُـوَّەت، یَعْني (نَبي) بووە، بَعضيَ ئەڵیّ: (رَسوُل) بووە، بَعضيَ ئەڵیّ خێـر (وَلـي) بـووە – ئەمـە خۆیـەتـي –. لای أكْثَـرْ وایـە الآن مایـە، تـا قیامـەت ئـەمێنیّ جَمـالي (مَهدي) ئەبینیّ، لە پێش لە شکری (دَجّال) ئەرِوا ئەڵیّ: ئەوە کافرە کَذّابە پێـی

بڕوا مەکەن، ئەیگرن شەققی ئەکەن، پارچەیێ بەولا پارچەیێ بەم لای ڕێی عەسکەر، فرقي ئەدەن! لەشکر بە تەواوی دێ و ئەڕوا، زیندو ئەبێتەوە پێکەوە ئەنوسیتەوە، باز بۆ پێش ئوردي ئەچێتەوە، وَهكذا كَرّاراً وَ مرارا!!.

– مەلاو صۆفیان شەڕیانە لەسەر (مام خدری)! –أمّا ئێستا ناوی گوم بووە لەوەتی ڕێی بَرّي و بَحْري تأميني كرايە سَهْل بووە! بەشەمەندەفەر و سَيّارە و پاپۆر تێیای ئەڕۆن، حاجَتْ بە (خدر) و (ألياس) نەماوە!!! وە أدَباي عَصر دەعیەیان نائێنێ إسْتِفادە لە (خدر)ي بکەن ئەگەر حەزت لە طوُل و تَفْصيلە تەماشاي (روحُ المَعاني) كە حَقّاً لەو مەيدانە مەيدانێ غاري كرديە. من ناتوانم لەو نَوْعە شتە قسە بكەم، ئەوەندە ئەزانم ئەوەي ئەیلێن أصلي نيە!! شتێ مَجْهولە، مَجْهول چی لێ ئەگوترێ؟ مُحَقَّق لە أساسي عقلی أُمّتيان، بەو خەرافاتە ئالودە كرديە، كە تێی گەیشتبێ دەماغيان هَظمي بە قووەتە، قووەتيان دايتە درۆ، أولاً (كَعْبُ الأحْبار) كە بەو دروست نەبوو، (إبنُ عَبّاس)، كە زياترى پێویست حَضرەتي (عَلي)، ئەگەر ألْزَمْ بوو حَضْرەتي (رِسالەت پەناه) ئەكەنە مُسْنَدُ إليه! حاشا رَسُولُ الله قسەی بێ مَعْنا نا فەرمووێ!!. لاشَكْ ئەگەر وابا، بۆ طولي عومری شَخْصيّ وا، خوا إشارەي ئەفەرموو، وەك دەرحەق (إبْليس) بەیانی فەرمووە!؟. ئەگەر چی ئەوانەی ئەڵێن زیندیيە، هەرچەند خَوارِقي زۆري ئەدەنێ، أمّا ناگاتە قُدْرَەت و قوەتي خارقەی (إبْليس)! . حَقيقَةً شت كە كەوتە داوی خَيالْ، تا بڵێ درۆ هەل ئەگرێ! وە سِعە تی إلاهي، وكَراماتي أوْلياء، زێدە قووەتي ئەدەنێ! وەئەوانەي ئاگادارەكان خەريكی بەنجی عَقْل و حُسْنن، تا مەيداني دەنێ، كەس نەتوانێ بڵێ وانيە، ڕێی مُحاكَمە ئەگرن!. چەندي لە مەوپێش مُحارەي(بالقان)كرا، دەوڵەت شكستي، دوشمن فَضايح و فَجايعي بە موسڵمانان و ناموسیان كردن. لە (أدَرْنە) وەك سائري جێگاي دي بە ناوي (خضر) و (ألياس) مزگەوت هەبوون، ژنان بۆ نياز ئەچوون لە دەوری دیواری مزگەوت دەستي بە خەنەيان پێدادێنا خێرو خێراتيان بۆ (خضر) ئەكرد.(مەلا عُبَيدالله) ناوي (أفغاني) پاش

إسْتِردادي (أَدرنه) تأليفێكى كردبوو، من نسخه كەم لە (موصل) دەست كـەوت، ئەگەر چی لە طَرَفِى حكومەت مَمنـوع بـوو، أمّـا والـى (سُـلَيمان نَظيـف) خوينـد بوويەوە تَقديرى كتێبەكەى كرد دايە مـن أمانَـةً مُطالَعـەم كـرد، حَقيقَـةً قـسەي جانسۆزي تيـابوو، ئـەڵێ: ئـەی (خـضر)!، جـونيش بـیّ نـەدا، بۆ بـە فريـادي ئەمَخدّراتە نەهاتى؟ بۆ حِفظـي عِـصْمەتـى خۆيـان، خۆيـان نەخنكاند، خۆيـان ئەهاويشتە ناو ئاو، ئەو هەموو نازو نيازە لە حەق تۆ بـە هـەدەر چـوو! !. زاتـاً ئەوانە لە مەيدان بەكار نايِّن! بۆ نـاو پـرِوو پيرێـژنان، پـەنا و پێـچيان باشـن!. مَحْمَلي أَوْلِيا گوێيا ديويانە پێش لەشكري گاوري كـە هاتيـە بـۆ سـەر لەشـكري موسڵمانان كەوتيە تانووتي لىّ داون (أَيُّهـا الكَفَـرَةَ أقْتلـوا الْفَجَـرَةَ!).. إحْتمـالي هەيـە ئەمرۆجلـەوكيـشي (موسـولونـي)يـا (هيتلـەر) بـیّ! أَوَّل و آخـر بـۆ ئێمـە فائِدەی نەدا!. فى الحَقيقَة نـەدەبا عُلَمـاو عُرَفـاي إسْـلامي بـەو نَـوْعـە خەرافاتـە خۆيـان خـەريك كـەن، تَفَـرَقـە بـبن، لەسـەر مَجْهـولـیّ عَـداوەتـي يـەك بكـەن ﴿وعَلَّمْنَاهُ﴾ بۆ عَبْدەكەيە، (كافى)يە ﴿مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾ بـیّ (تعليـم)ى (أسـتاذ)؛ چ (عِلم)؟ (علم)یّ (عظيم الشّأن) كە پیّ ی ئەڵێن: (علم)ى (باطن).

(علم)ي ئێمە دوو (نوع)ە؛ يەكیّ (علم)ى (ظاهرى) (عائِـد)ى (بَـدن)ە؛ يـەكیّ (باطنى) (عائد)ى (نفس) و (قلب)ە (علم)ى (باطنى) دوو (قـسم)ە: (نظـرى) — كە (علم)ى (كلام)ى بۆ دانراوە؛(علم)ى (تهذيب)ى كە (علم)ى (تهذيب الاخـلاق) بۆ (تدوين) كرايە.

لەسەر (رۆسا)ى (ديـن)ى (إسـلام) (لازم) بـوو؛ هـەردوو لا (رعايـەت) كـەن. ئەگـەر (أخـلاق) (مهـذَّب) و (قَلـب) (صـاف) و (نفـس) پـاك نـەبوو؛ (علـم)ى (تصوّرى) و (تصديقى) چ (فائدە)ى هەيە؟.

بـۆ (علـم)ى (بـاطني) دوو ڕیّ هەيـە : يـەكى (نظـر) و (فكـر) ئەمـە ڕیّ ى (أرسطو) و (مُـتكلِّمين)ى ئێمەيـە. يـەكیّ (تـصفيه) كـە (طريـق)ي (أفلاطـون)و (صوفيه)ي (إسلام)ە. (حتّى) (نظر) بە (تجديد) (تجريد)ى (فكـر) لـە (عقـلات)

ئەکەنەوە چونکی ئێمە، (مُتمسّك)ین بە (دین)ی (إسلام)، ئەگەر (أعمال)ی (ظاهریّە) وە (إعتقاد)ی (قلبیّە)یا (تزکیە)ی (نفس)یە ئەبێ لە (رسالەت) پەناه وەرگیرێ، نەك هەر کەس بە هەوەس ڕێ یە بگریتە پێش، ئەمە نابێ، بۆ (حُکما)ی (یۆنان) (آن بوە) (أمّا) بۆ (رۆسا)ی (إسلام) (ممکن) نیە.

لە (علم)ی (باطِن) (مقصد) (عِلم) بە (غیوب) نیە؛ (حاشی ثُمَّ حاشی). ئەگەر (ریاضیەت) و پارێز بوو، ئەو جۆرە ڕەوشتە بۆ (صاحب)ی ئەبێ، (ولَوْ) (مُلحِد)و (زەندیق) بێ ئەڵێن: (مشهور)ە، باپیرە گەورەی ئێمە (شیخ إبراهیم) لە (جزیرە) ڕۆژێ (درس) ئەڵێتەوە، یەك دووجارە سەری پەنجەی لاقی بە (حرکە) دێخی وە (تبَسّم) ئەکات، ناگاە ئەفەرمووێ: "(فقێ) کیتێبێ لێك نێ" (مقدار)ی قۆڕاو ئەکەوێتە ناو (حُجر)ە. (فقی) (عرض)ي ئەکات: " ئەوە چ بوو؟ " فەرمووی:" فەلەیێ جۆگای هەڵدەبەست؛ من (إشارە)م ئەکرد، تێکم ئەدا؛ (فەلە) کە ئەی ووت:" کوڕۆ کڕ بە " (آخر)ی توورە بوو، بێڵە قوڕاوەکی هەڵدا گەیشتە ئێرە! " ووتی: " ئەزبەنی، ئەتوو (قَید)ی نی، (مـلا)ی وە (ذات)ێ بە (دیانەت)ی ئەو بۆ؟! "فەرمووی: ئەوە (عائد)ی (حق) و نا (حق)ی (دین) نیە؛ (عائد)ی (ریاضەت) و (مُجاهدە)ی (نفس)ە! "

(لِلّه الحمد) ئێمە (أوّل) و (آخر) لەگەڵ خواو (رسول) و (دین) ڕاست بووین و (خیانەت) مان نەبوە. جا ئەگەر (بعض)ە (أمور)ێ لە (طرف) خوا، بۆ (بعض)ە (ذوات) (کشف) کرا ئەگەر لە (مسلك)ی (عبودیّەت) لای نەدا، (غرور)ی نەبوو، کردی بە (خدمەت)ی (أمّەت) و (ملّەت)، ئەوە دیارە (مُقرّب)، خۆشەویستە؛ وە (إلّا) بزانێ بە (إستدراج)، دەربارەی کراوە.

لە (بحث)ی (إحضار)ي (عرش)ي (بلقیس) (إنشاءالله) لەو بابەتەوە شتێ (عرض) ئەکرێ ﴿قَالَ لَهُ مُوسَى: هَلْ أَتَّبِعُكَ؟﴾ (إیذن)ە دووات کەوم؟ ﴿... أَنْ تُعَلِّمَنِي مِمَّا عُلِّمْتَ﴾ لە (طرف) خوای، بێ (کسب) و (نظر) ﴿...﴾ (علم)ی (صواب) و (نافع)؛ (عِلم) ئەوەیە کە (نافِع)بێ، بۆیە (حُکما)ی (غرب)

(أهمیّەت) نادەنە (نظریّات) ئەگەر بێ (عمل) و (أثر)ي باش نەبێ. (جناب)ی (حق) باسی مێشە ئەنگوێنە ئەکا، (ملا)یە نیە، بە (نظریات)ی خۆی شتیکی لێ بزانی. (أما) (تطاوَلَ لَیْلُك بالأثمدِ) (سکاکی) ئەڵێ: (٣) (إلتفات)ی تیایە "، بە (جملە) قسەی لێ ئەکەن، وە بە (مُنْتَهي)ی(ملایەتی) ئەزانن! بنوارە ئەو (أدب) و (تواضع)ی لەو (مقام)ە، لەگەڵ (عظمەت) و (کبری) لە (مقابل)ي (فرعون) ﴿قَالَ﴾ (عبد)ە کە ﴿إِنَّكَ﴾ ئەی (موسی) ﴿لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِي صَبْرًا﴾ " (تحمّل)ی (رفاقەت)ی من ناکەی، لە توانیت نیە"، دیارە ئەو (ذات)ە، ئەو (خدر)ە نیە، هەم (صحبەت)ی گێژو تارەت نەکەرو (عورەت) بە دەرەوەروان بێ ﴿وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَى مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا﴾ (ظاهر) (مخالف)ی (شرع)، (معنیً) (مُوافق)؛ وە توو ئاگادری نی، (إحاطە)ت پێ نەداوە (سُبحان الله) (أصحاب)ی (إمام)ی (رازی) بەو (آیەت) (دلیل) ئێنن، کە (إنسان) (قبل الفعل) (إستطاعە)ی نیە بەڵکو (إستطاعە) (مع الفعل)ە؛ بە (نفی) (جزئی) لەسەر (أمر)ێ (هکذا)يي، چۆن (إثبات)ی (نفی) (کُلّی) ئەبێ؟ (دِقّەت) لە (تعلیل)یان کە، (غلط)یان چەند ئاشکرایە، (مع أنّهُ) لێرە (مع الفعل)یش (إستطاعە) نەبو؛ (حضرەت)ی (موسی) خۆی نەگرت ﴿قَالَ﴾ (حضرەت)ي (موسی) ﴿سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ صَابِرًا﴾ (جزم)ی نەیەناوە، دیارە (تعلیل)ی ئەو (ذات)ە ی لا بە (قوەت) بوە ﴿وَلَا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا﴾ چی بفەرمووی، لە قسەت دەرناچم (إنشاءالله) بە ئارام و بێ پەلەپەل خدمەتت (دوام) ئەکەم ﴿قَالَ﴾ باشە (قبول)ێت ئەکەم بە (شرط) ﴿فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي﴾ وە (صبر)ی لەسەر ئەکەی (بنا) بەفەرمودەی خۆت﴿فَلَا تَسْأَلْنِي عَنْ شَيْءٍ﴾ کە ئەی کەم، دەنگ مەکە، مەڵێ: بۆ وات کرد؟ (فضل) لە (إعتراض) و (مناقشە)، (خراپ)ت کرد، کوو وا ئەبێ؟ (سؤال) مەکە ﴿حَتَّى أُحْدِثَ﴾ خۆم بێ (سؤال)ی توو ﴿لَكَ﴾ بۆت ﴿مِنْهُ﴾ لەو شتە ﴿ذِكْرًا﴾ کە (بَیان) کرا، (حاجەت) بە (سؤال) نامێنێ ﴿فَانْطَلَقَا﴾ باسي (فَتی)ي نیە، تۆش باسی مەکە! تَشریفیان ڕۆیی ﴿حَتَّى إِذَا رَكِبَا فِي السَّفِينَةِ﴾ سواریی سَفینە، وەکی وولاغ نیە! هەم ظَرفیّەتە هەم

إسْتِعلايه! بۆ كویٚ ئەچوون؟ ئەي مَعْلوم! ئەگەر سەفینۆكەك بیٚ، ئەمبەرەو ئەو بەري ساحلي پیٚ بكەن، نابیٚ لە بَحْري گەروە بیٚ! با ئاویٚ بیٚ وەكی دجلە و شَطُّ العَرَب!. ﴿خَرَقَهَا﴾ كوني كرد لَوْحەكي هەر پچڕی﴿قَالَ﴾ موسی فەرمووي ﴿أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا﴾ أَنَّهُ بەو حالە غَرْقیان مُحَقَّقە. تۆش بە قَصْدي دڕاندت. ﴿لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا﴾ شتیٚ زۆر، یَعْني زۆر خراپ، بەلاو مُصیبەت ﴿قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا﴾ زێتر مەڕۆنە مُحاكَمەی (إمامی)، ئەرِوایَتي (رَبیعي)، گوێیان مەدەریٚ!! ﴿قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي﴾ عتابم مەكە، مەمگرە! ﴿بِمَا نَسِيتُ﴾ بە لەیاد چوونم.﴿وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي﴾ لە شَأْني من. ﴿عُسْرًا﴾ بەسەرمدا مەێنە لەو مُتابعەیە، لەبەر ئەو سؤاله كە لە نسیانەوە بوو، صُعوبَە و مُضايَقە! اَلعَفو المُسامَحە! ئەبیٚ تۆش تَحَمُّل كەي ئەختیٚ صَبر بگری!! ﴿فَانطَلَقَا﴾ ڕۆین بە ساحِلدا ﴿حَتَّىٰ إِذَا لَقِيَا غُلَامًا﴾ جَمهور ئەڵێن بالِغ نەبووە، أمّا لە (سَعیدي بن عَبْدُالعَزین) نَقله كە عومری بیست سالی بووە ـ ئەمە خۆیەتي ـ زاتا غُلام لە إغْتِلامە بە مَعْنی شِدَّەتی شَبَقە، مندالٚ شَبَقي نیە فَضل لە شدەتی، ناوي (جَیْسور) بە (ج) یا بە (ح)، قیلَ (جَنْبَشور)ە! نازانم چ مەراقێكە ئەوانەی گرتیە؟! ناوي بزانم نەزانم چیە؟!! ئەوا بەڕاستي نەمان زاني!! ﴿فَقَتَلَهُ﴾ كوڕی كوشت، سەری هەڵقەند بەدەستي، دریٚژي كردو سەري بري بە سیكاردیٚ، سەری بە دیواریٚ دادا حَتّا گیانی دەرچوو، سەری بە بەردیٚ پانكردەوە بەلاقیٚ لێیدا كوشتي، ئەنگوستي هاویشتە نا گێوو ناو گوێی هەلي كەندو مرد. ئەمە بۆ؟ بەهەر وَجهی بوو، كوشتي، والسَّلام! ﴿قَالَ﴾ طَبیعي حَضرەتی (موسی) خۆی ناگریٚ ﴿أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً﴾ پاك بیٚ گوناه ﴿بِغَيْرِ نَفْسٍ﴾ بیٚ حەق و قِصاصْ. دیارە گەورە بووە حاجەت بە حیلە كاري ناكا. سەیری (بَیْهَقي) ئەڵیٚ: لە شَرعیش قَبْلَ الهِجرەت قِصاصْ لە صَبي وەئەگیرا. ئاگای لیٚ نیە لە (مَكە) چ شَرعي وامان نەبووە بكاتە (باب القِصاص)! دیارە (سَبوكي) وەقتی زیاتر كردیە ئەڵیٚ:

(قَبْلَ الأُحُد)ه تا بچێته (مَدينەي مُنَوّره) مَدينەي تَشريعي! ﴿لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُكْرًا﴾ خيلافيانه (نُكْراً) قَبيح تره يا (اِمْراً)، لِكُلٍ وِجْهَةٌ!

# ناوەڕۆكی بەرگی پێنجەم